


فێربوون بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# ئەنتیخریستۆس


- بابەت: ڕۆمان
- نووسینی: د. ئەحمەد خالید مستەفا
- وەرگێڕانی: فەیسەڵ هەمەوەندی
- دیزاینی ناوەوە: موحەمەد حوسێن خەتی
- دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم صالح
- لەبڵاوکراوەکانی: ناوەندی فێربوون
- زنجیرە: ١٤١
- نۆرەی چاپ: یەکەم - ٢٠٢١
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی وشە: ٥٧.٦٠٠ وشە
- قەبارە : ١٤ سم × ٢١ سم
- نرخ: (٦٠٠٠)

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٧٤٢)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێدراوە

## ناوەندی فێربوون

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: عیماد ڕەشید

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ڕەنج عیماد




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون - ژمارە (١٤١)

ناونیشان / هەولێر بازاڕی کتێب فرۆشان - بەرامبەر دەرگای قەڵا

٠٧٥٠٤٠٤٨٢٨٥ - ٠٦٦٢٢٣١٣١٥


ktebxanay ferbwn




Scanned by TapScanner

## بۆ بەرچاوڕوونی

هەر هەموو ئەو کەسایەتییانەی لەم ڕۆمانەدا بە بنیادەم و جنۆکە و ئەهریمەنەکانەوە ناویان هاتووە کەسایەتی ڕاستەقینەن، زۆربەی سەربردەی ڕووداوەکانیش لە ڕووداوی واقیعی و ڕاستییەوە وەرگیراون.

سوپاس و پێزانینم بۆ نووسەر، توێژەر نزار محەمەد سابیر بۆ ئەو پێداچوونەوە وردەی بەتەواوی وەرگێڕانەکەمدا چووەوە.

# ناوەڕك

– دواجار هەر خۆمان ماینەوە، من و تۆ.

– دواجار لۆ تۆ دەبم.

بووی بە موڵکی من، هەرجارێ دەڕوانیتە وشەکانم و ڕستەکانم بەسەر دەکەیتەوە، ئەو چاوانەت وەك ئەوە وایە کە هی من بن.

ئەمە دوا ڕۆمانە لە ژیانتدا دەیخوێنیتەوە. من لە گیانەلانی مەرگدام، ئەوەندەم بە بەرەوە نەماوە. ڕەنگە چەند ساتێکم مابێت، دەزانم ماوەکە زۆر کەمە، وەلێ لە وتووێژدا بەسە حالێت بکەم.

بەر لەوەی گفتوگۆت لەتەکا بکەم، دەبێت ئەم کتێبە بخوێنیتەوە و دواتر بیسووتێنی. ئەوان بۆ لەناو بردنی ئەم کتێبە لەهەوڵدان، نەك هەر ئەوە، ئەوانەیش کە خوێندوویانەتەوە، وەك چۆن لەتەك هەموو ئەو کتێبانەی هاوشێوە و پێشتر کردوویانە لەتەکدا دەیکەن.

مەترسە، تەنها قسەکانم وەبیر خۆت بهێنەوە، ئەگەرچی دوای ئەوەی بۆم ڕوون کردیتەوە تۆیان کوشت، بە ڕەزامەندی دڵی خۆت دەمریت. کێن

ئەوانەی لەم سەردەمە بە ڕەزامەندی خۆیان خەون بە مەرگی واوە دەبینن؟

هاوڕێ مەترسە.

من کێم؟ من لەکوێم و بۆچی؟ و چۆن؟. دەزانم گشت ئەمانە پرسیارن و لەمزرتدا قوت دەبنەوە. ڕەنگە ئەم کتێبە توورە بدەیت و درێژە بە ژیانی خۆت بدەیت، وەلێ دڵنیات دەکەمەوە، بەلای ئەوانەوە چ جیاوازییەك نییە، کێ گرنییە خۆی و خوێندییەوە، کێش تووڕی دایە نزیکترین زبڵدان، ئەوان هەمووان لەناو دەبەن.

بەلام بۆ خوێنەرەکەی هەلی ڕزگاربوون هەس. وا لێم مەڕوانە. بەدەر لەوەی کە من نووسەرەکەیم، دواجار من مردووم. پاش کەمێکی تر لەژوورەکەمدا هێرش دەکەنە سەرم و لەم گۆی سەر زەوییە کوێرم دەکەنەوە، هەر وەك ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان من هەر نەبووبم.

لەڕاڤەکردن و قسەی پڕوپووچ کاتم بەفیڕۆ مەدە، لێگەڕێ دەستەو برد بکەومە گێڕانەوە، کاتمان ئەوەندە بەدەستەوە نەماوە.

لەم وتووێژەماندا شتگەلێکت بۆ ڕوون دەبنەوە، هەندێ بابەتی تر تڕۆ دەکەیت. هەندێ بارودۆخت بەلاوە پێخۆش دەبن، وەلێ هەندێکی تریش وەلا دەنێیت، یا بەلاتەوە پەسەند نین. نووکە با شتێکی فرە گرنگت پێبێژم، هەرگیز نامەوێ درۆت لەتەکا بکەم، تەنها ئەو ڕاستییانەت پێدەلێم، کە پێشتر کەس لای نەدرکاندووی. نهێنی گەلێکت بۆ ئاشکرا دەکەم، کە نەدەبوو هی وەکی تۆ بیانزانێت. ئەگەر درۆم لەتەکتا کرد، هەڵبەتە نامکوژن، دووریش نییە چۆن لەتەك ئەوانی پێشترا کە کردیان خەلاتم بکەن.

دەزانم کەسێکی بێزار، یان هۆگری خوێندنەوە نیت، یانەخۆ حەزت ها وەلای خوێندنەوە، وەلێ ئەو کتێبانە نا کە ناوی نووسەرە گەورەکانیان بەسەرەوە نییە، بۆیە دەمەوێ جارێ ئالوودەی خوێندنەوەی کتێبەکەمت بکەم، بۆ ئەوەش گەمەیەکم داهێناوە، هەر خۆشمان، واتە من و تۆ ئەو یارییە دەکەین، کەسی تر ناهێنینە ناو گەمەکە.

یاری کاغەزێن. کاغەزێن بە مانای کۆنکان نا، بەڵکو کاغەزێنێك لە جۆرێکی تر، نەفرەت لێکراو. گرنگترین شت لەو گەمەیەدا ڕێکخستنی کارتەکانە، ئەگەر بەو شێوازە ڕێك و پێکە نەکرێت، بابەتێکی ناڕوون و بێ بەها دەبێت، وەلێ ئەگەر تەواو لەجێی خۆیاندا دانران، وەك چۆن ئەمێستا من و تۆ دەیکەین، کۆمەڵێ دەرگا لە ئاشکرابوونی نهێنییەکان بە ڕووتدا دەکرێنەوە، کە تا ئێستا کەسێك پێیانی ڕانەگەیاندووی و کەسیش بۆتیانی نادرکێنێ. نهێنی گەلێکی مەترسیدارن، ئەوەی لێیان حاڵی بێت و بیزانێت دەکوژرێت، هەموو ئەوانەیش دەسووتێنرێن کە تێیدەگەن، یا دەیانەوێ خەڵکی تێبگەیەنن!

سێزدە کۆمەڵە لەو کارتانە دەخەمە بەردەمت، هەر کۆمەڵەیەکیش بەسەرهاتێکت بۆ دەگێڕنەوە، خودی بەسەرهاتەکە باس لەو نهێنییانە دەکات کە دەیانەوێ لەتۆ و هاوشێوەکانتی بشارنەوە. هۆ ئەو حاڵیبوونەت لێت ناگەڕێن دەکەونە سۆراغت و دووت دەکەون. لەبەر ئەوەی تۆش کەسێکی بێزاری، بۆ خۆشم ئەوەم لەبەر چاوە، هەر یەك لەو سێزدە کۆمەڵەیە بە شێوازێکی جوداتر لەوانی پێشووتر دامهێناون. بینیت بۆ هۆشیارکردنەوەت چەند پەرۆشی تۆم؟ بۆ خۆم ئەوەندەم بە بەرەوە

نەماوە، نامەوێ ئەو ساتانەی هەڵهاتنی عەقڵی بێزار لە کیس بچێت، بەڵام دەتوانی لەنێو هەر گێڕانەوەیەکدا بەسەرهاتێکی تر هەڵێنجی، چونکە بۆ خۆم نووسەرێکی زۆر بلیم، زۆر بلێییکەشم زۆر بۆ بابەتەکە گرنکە. ئەگەر بۆت رەخسا تیا هەڵێی، تەنها لەم پانتاییەدا هەڵێ و لەوە زیاتر نەڕۆی.

هەر هەنگاوێکمان نا، زیاترت بۆ ڕوون دەکەمەوە، کە لەکوێوە هاتووم و چۆن بێرە گەیشتووم و ئەوانەش کێن کە دەتکوژن و دەتسووتێنن. ئەمە بێگومان دوای ئەوەی لە کوشتن و سووتاندنی من دەبنەوە، نەک هەر ئەوە، چۆنیش لەدەستیان خۆت ڕزگار دەکەیت. ئێستا هیچت پێنالێم، تەنها ناوی خۆم نەبێت. من ناوم (بۆبی فرانک)ە. هەست دەکەم لەناوەکەمەوە مەزەندەی ئەوە دەکەی من ئەمریکی بم، دروست وایە.

لەکۆتاییدا و بەر لەوەی دەست پێبکەین، دەمەوێ سەرنجت بۆ شتێک ڕاکێشم. ناتوانی لە یەک دانیشتندا وەک پێویست تەواوی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە، دەبێت سێزدە دانیشتنی بۆ بکەیت، تا بە جوانی و ڕێک و ڕەوان لێی حاڵی بیت.

ئێستا لێگەڕێ دەست بە گەمەکەمان بکەین، ناوی گەمەکەشت بۆ ئاشکرا ناکەم، ئەوەندە بەسە کە گەمەی کاغەزێنە و کاغەزێنێکی نەفرەتلێکراو. بە هێمنی بەرامبەرم بگرە، چاو لە یەکەم کۆمەڵە کاغەزەکان ببڕە، کە بە ڕێکی لەسەر مێزەکە ڕیزیان دەکەم. دەزانم چرا کزەکەی ژوورەکەم سەریشت بە گێژا دێنێ، گوێی مەدەرێ، ئەوەی ئەمەی بوێ ئەوەشی دەبێت. دەی با دەست پێبکەین.

ئەوا شەش کارتم دەمەو قلْپ لەبەرامبەرتـدا ڕیز کـردن، یـەك یـەك و بـە پێی ڕێکخستنیان ئاشکرایان دەکەم.

کـارتی یەکـەم.. وێنـەی ئەهریمـەنێکی شـاخداری نـەفرەتلێکراوی زۆر تووڕەی بەسەرەوەیە.

کـارتی دووەم.. کـارتی جادووگەرییـە، سـیحری سـەر گـۆی زەوی و ڕووناکییەك لەناخی زەوییەوە دەرچووە و تاوێر و بـەردی دەورە بـەری وردو خاش کردووە.

کارتی سێیەم.. سیحری کەشوهەوایە، پیـاوێکی سـاحیریش جـادوو بـە بادا دەکات.

کارتی چوارەم..کارتی هێزی لـەبن نـەهاتووە، وێنـەی مستی پیـاوێکی بەهێزی بەسەرەوەیە، ئەنگوستیلەیەکی ئالتونی گەورەشی لە پەنجەدایە.

کارتی پێنجەم.. وێنەی چەند بتێکی بەسـەرەوەیە، پێدەچێت کەسێك وردوخاشی کردبن.

دوا کارت.. کـارتی چەکوشـە، وێنـەی پیـاوێکی بـەهێزی بەسـەرەوەیە، ئاسنگەرە و چەکوشێکی گەورەشی بەدەستەوەیە.

## بەشی یەکەم

# میری ڕووناکی.. ئەو ڕۆژەی ڕووناکی داهێنا

## ٢٥٠٠ پێش زایین - ٢٠٠٠ پێش زایین

" ئەم گۆرانییە بۆ خوداوەند دەچڕم.. کاتێ دڵسۆزی مەزن دێت و ئەم کیژە جوان و بێگەردە لە دڵەڕاوکێدایە.. وەرە هەر ئێستا رزگار بکە"

سترانێکی بابلی کۆنە بە دەنگی پیرەپیاوێك و بەزمانی کۆنی بابلی دەیگوتەوە. لێ سترانەکە بۆ جۆش سەندن سەری بۆبادەدا. دەنگێکی بەسۆز و خۆشبوو، بەدەم هەرای ڕانە مەڕەکەیەوە کە ببوو بە ئاواز بۆ چڕینی، دەنگی لێ هەڵدەبڕی. جارو بار دارعەساکەی بەسەر ڕانەکەدا هەڵدەبڕی. تا بڵێی کەیفخۆش بوو. کێ بێ و لەم سروشتە دڵڕفێن و سیحراوییە ناخی جۆش و خرۆش نەستێنێت. ئێمە لەمەملەکەتی کۆنی ئاشووردایین، جوانترین و سیحراویترین شارێکە کە چاوی بنیادەم و پەرییان بینیبێتیان. ئەم شوانە سترانبێژە دەنگ خۆشەش، (ئیچما)ی پیرە پیاوی ئەو سەردەمەیە.

" هەر کە فریادڕەسی گەورەی بە ئەمەك دەگاتە جێ، ئازاد دەبیت"

بەر لەچوار هەزار ساڵ، زەوی ئەم زەوییە نەبوو، ئاسمان ئەم ئاسمانە نەبوو. (ئیچما) لەنزیك گۆمەکە تێدەپەڕی، چون ئەوەی تەماشای باڵندەکانی ئاسمان بکات، دەیتوانی ماسی و گوێچکەماسییەکان ببینێت.

بەر لەچوار هەزار ساڵ هەموو شتێ بێخەوش و پاك و بێگەردبوو. دیاربوو(ئیچما) کاتی پشووی بوو، بەرەو ئەو درەختەی کە هەموو جاری ڕاماتبوو لەسایەیدا پشوو بدات و ژەمە نانەکەی لەسایەیدا بخوات. کاتێ ب خواردنەکەی گەیشت، سەری سوڕما، نانەکەی هەڵدرابووەوە. "دێ، چەردەی هەژار هەرگیز فێر نابن، ئەگەر برسییانە بۆچ داوا ناکەن. خۆ بێ بەشیان ناکەم، نا ئەمە بووەتە پیشەیان و ناتوانن وازی لێ بێنن. بەدڵی دڵیان دەکرێتەوە"

(ئیچما) کە لە نانەکەی وردەوە بوو، دووبارە سەری سوڕما. ئەگەر چی نانەکەی والا کرابوو، وەلێ خواردنەکەی هەر وەك خۆیەتی، شیرەکەشی هەروەسا، بەلاّم لە پەنیرەکەی پارچەی ورد وردی لێخورابوو، شیرەکەشی کە لێی کەمبووەتەوە، هی ئەوە نییە سکی برسیی پێ تێربووبێت. (ئیچما) دانیشت و دەستی بەنان خواردن کرد، تاوێکیش لە بن درەختەکە پشووی دا، دواتر بڕیاری دا لە گۆمەکە مەلەیەکیش بکات. ئاخر ئەو شوانکارانەی مەملەکەتی کۆن، بۆ گورج و گۆڵی لە گۆمەکان مەلەیان دەکرد، جلەکانی داکەند و دابەزییە ناو گۆمەکە دەستی بەمەلە کرد.

لەو دەمەیدا خەریکی مەلەکردن بوو، ڕەوە کۆترێکی بە ئاسمانەوە بینی، دابەزینە بن دارەکە، بەسەر خوانەکەیەوە کەوتنە چینە کردن. دەنووکیان لە پەنیرەکەی دەدا و پڕ بە دەنووکیان شیریان دەخواردەوە،

دواتر هەڵفڕین و لەو نزیکانە نیشتنەوە، دووبارە و سێ بارە ئەم کارەیان کرد و لە هەمان شوێن دەنیشتنەوە.

(ئیچما) لە گۆمەکە هاتە دەرەوەو جلوبەرگە بابلییە کۆنەکەی لەبەر کرد، وەلێ نەچووەوە بن دارەکە، بە ئاڕاستەی کۆترەکان بەرەو شوێنی نیشتنەوەیان ڕۆیشت، لەوێ چاوی بە شتێك کەوت، هەر بە تەماشاکردنی سەری سوڕما، کچۆڵەیەکی نۆ ساڵانەی فرە جوانی بینی، کە هەرگیز چاوەکانی لە جوانی و قەشەنگیدا ڕووخساری وا جوانییان نەبینیبوو. هەر ئەوەش سەری پێ سووڕ نەکردبوو، بەڵکو ئەو کۆترانەشبوون کە لەسیلەیدا دەنیشتنەوەو بە دەنووکیان شیر و پەنیریان دەرخوارد دەدا.

منداڵەکە پێدەکەنی و دەستی بە حەوادا گڕ دەدا. کاتێ (ئیچما) لێی نزیکبووەوە، پێکەنینێکی بۆ کرد، فرمێسکی لەچاوی (ئیچما) هانی. بە هزر و ئەندێشەی شوانکارەیەکی بابلی کۆن، ئەوەی دەیبینی شتێك بوو لە ئەفسانە دەچوو. لەباوەشی گرت و ڕووەو ئاسمان هەڵیبڕی، کۆترەکان بە خۆشییەوە بەسەر سەریانەوە دەسووڕانەوە. ئەو حاڵەتە هیچ شرۆڤەیەکی بۆ نەبوو پڕ بە پێستی بێت. (ئیچما) لە چاوە جوانەکانی ڕووانی، ئەمە یەکەمجارێتی چاوی بە منداڵێکی وا جوان بکەوێت، ئەو برژانگ و برۆ جوانەی هەبێت، بڕیاری دا لەتەك خۆیدا ببیات و بەخێوی بکات، هەر لەوێ بڕیارێکی دەستبەجێی لە ناونانی دا، ناوی نا ( خۆشەویستی کۆترەکان)، ئەو ناوەی لە بابلی کۆندا بە (سەمیرامیس) ناودێردەکرا.

" ئەم سترانە بۆ خوداوەند دەچڕم، کاتێ دڵسۆزی مەزن دێت، ئەم کیژە جوان و بێگەردە کە لەدڵەڕاوکێدایە.. وەرە هەر ئێستا ڕزگار بکە"

## ئەنتیخریستۆس

لە بابل ڕۆژی ئاهەنگی گەورەیە، کاتێ بابل ئاهەنگ دەگێڕێت، ئەوەندەی تر بە بەر چاوانەوە شۆخ و شەنگتر دەردەکەوێت. ئەوددەمەی چیا سەوز دەکاتەوە، دەر و دەشت و ڕووبارەکان بە دیمەنی کۆشکەکانی شار لە ڕەنگی سپی و شیندا و ئەو تابلۆ گەورانەش کە بە دیواردوە هەڵدەواسران. ئەو ڕۆژە نمایشی جوانترین شار دەردەبڕن. مێردمنداڵەکان گەلا و گوڵی زەعفەران بەحەوادا هەڵدەدن، تەنانەت ماینە نمایشکراوەکانیش دەکەونە سەماکردن، سەرتاپای مەردومی بابل جوانترین پۆشاک لەبەر دەکەن. ئەودەم دەزانیت ڕووداوێکی گەورە ڕوویداوە. دەڵێی زەوی بە زەعفەران داپۆشراوە، لەوە حاڵی دەبیت لەدایکبوونیەکی نوێی (کوش)ی پاشا و (ئۆداج)ی شاژن لەدایک بووە، لەدایک بووەکە کوڕە. خۆ ئەگەر لەدایکبووەکە کچ بێت، ئەو ئاهەنگە سازنادرێت.

مەڵۆتکەکە لە ناو کەژاوەدایە. مامانەکان و ئافرەتانی شەونخوون بەدیار شاژنەوە تا ڕۆژی منداڵبوونی، مافی ئەوەیان هەبوو بەدیار کەژاوەکەوە بن و چاوێ بە کۆرپەکەدا بگێڕن. بە زمانی بابلی بەو ئافرەتانەش دەگوترا(مایاکان). ئێدی گوێت لە وەسفی کۆرپەکە دەبێت." ئای لەو چاوە جوانانەی" یان" جوانترین منداڵە کە چاوم بینیبێتی" . ئەمەش واتلێدەکات زیاتر لە کۆرپەکە ورد بیتەوە. جوانی لەو سەرە بچووکەدا و بەو چاوە جوان و تیژەی لە نیگا کردن. بەڵام بەدەر لەوەی باسم کرد دیمەنێکی تر تووشی دڵەڕاوکێت دەکات، شتگەلێکی تر دەردەکەون، لە واقیعدا نین، ئەوانە ئەهریمەنن، بە ئەدای شەیتانیی خۆیان بزەخەنەیان تێدەگرت و شتێکیان دەگوتەوە. بەدەر لەو دیارییانەی دەوری کەژاوەکە بۆ دوورخستنەوەی ڕۆحە ئاژاوەگێڕەکان مووروی شینی چاوەزار و سیرو شتگەلێکی تری

چاونەفەس بە کەژاوەکەوە هەڵواسرابوون، دایانەکان(مایاکان)پەنجەیان لە ئاوی زەعفەران وەردەدا و نێوچەوانی شازن(ئۆداج)یان پێ تەڕ دەکرد، تا کۆرپەکە لە شەیتانەکان بپارێزێت.

لەپڕ بێدەنگی باڵی بەسەر حەشامەتەکەدا کێشا، تا (مۆهێل)ی ڕیش چەرمووی[1] هەرە پیرەپیاو بێتە دەنگ.. گوتی:

- ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بەگشتی شانازی دەکەین و هەروەها بەهەمان شێوە زەویش هەروەسا بە لەدایکبوونی کوڕی پاشای مەزنمان شانازی دەکا. کە دواتر هەر نازناوی پاشای مەزنمان کوش هەڵدەگرێت، بەم بۆنە پیرۆزەوە بە فەرمانی پاشا ناوی (زوحاك)یان لێ نا.

ئێدی هەر هەموو خەڵکەکە بۆ دەربڕینی خۆشی بەو بۆنەوە، ئاهەنگەکەیان جۆش و خرۆش دا، ئەگەرچی خۆشییان بەناوی(زوحاك) نەدەهاتەوە، چونکە بە زمانی بابلی مانای(ماری مارانگەز) دێت. ئەهریمەنەکان خەنینەوەیەکی شەیتانیانەیان بۆ کرد، کەڵبەکانیان وەك خۆشحاڵی بۆ ناوەکە دەرخست و وەکو (فیشکەی مار)وشەگەلێکیان بەژێر زمانەوە دەگوتەوە!

*********

شوانەی پیرە..(ئیچما) چاوی لەو دەست و دیارییەی کە وا مەزەندەی دەکرد لە ئاسمانەوە بۆی هاتبێتە خوارەوە نەدەبڕی. ئەو کچۆڵە نازدارەی کە ناوی (سەمیرامیس)ی لێ نابوو، بیری هاتەوە، ئەم بۆ خۆی

---

[1] سپی.

شوانکارەیەکی هەژار و داماوە، بەسکێ تێر و بە دووان برسی، شوێنی ئەم گەوهەرە چکۆڵەیە ژووری سارد و سرِی شێدار نییە، هەڵبەتە خوداوەند شوێنێکی هەر بۆ دابین کردووە. لێرەوە (ئیچما) بیرۆکەیەکی لە مەڕ (سەمیرامیس)ەوە بۆ هات.

سبەی بازاڕی (نەینەوا)ی مەزن دەکرێتەوە، کە هەموو ساڵێ لەتەك وەرزی هاوسەرگیریی ڕێکەوتە و کچان و کوڕانی گەنج لە هەموو مەملەکەتەکانی ئاشووری مەزنەوە ئامادە دەبن، هەر کوڕەو بۆ هاوسەرگیریی بووکی خۆی هەڵدەبژێرێت، بەساڵاچووەکانیش لەو مەراسیمە بێبەش نین، ئەو کیژانەی هەڵیاندەبژێرن و بەخێویان دەکەن، تا گەورە دەبن، ئەوجا یا بۆ خۆیان هاوسەرگیرییان لەتەکدا دەکەن، یان لە کوڕەکانیان مارەیان دەکەن. ئیچما چاوی لە چاو (سەمیرامیس) بڕی، ئەو چاوانەی کە وێنەیان نەبوو. بۆیە بڕیاری دا سبەی بچێت بۆ (نەینەوا)ی مەزن.

ئیچمای پیرەپیاو (سەمیرامیس) لەکۆڵ دەگرێ و بەرەو(نەینەوا) دەکەوێتە ڕێ. (ئیچما) ئەو ڕۆژە جوانترین پۆشاکێك کە هەیبوو لەبەر کردبوو، کەچی هەر وەك دەرۆزەکەرێك لەنێو حەشاماتەکەدا بەدەردەکەوت، سەمیرامیس کە سەرنجی سەرسوڕمانی هەمووانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، لەپێکەنینە سیحراوییەکەی هەر نەدەکەوت. پرسیارگەلێك لەمەڕ ئەو سواڵکەرەی ئەو گەوهەرەی لەکۆڵ گرتووە هاتنە ئاراوە.

لەودەمەی (سیما) خەربەندەی(مەیتەر) ئەسپەکانی پاشای مەزن لە بازاڕەکەدا بەدووی ئەسپ و ماینی ڕەسەندا دەگەڕا، لەپڕ نیگای دەچێتە

سەر چاوەکانی (سەمیرامیس) و موچڕکێك بە لەشیدا دێت. سیما.. نە بیری ئەسپ و ماین و نەخودی پاشای مەزنیش دەمێنێت، هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوە، تەنها شتێك لەبیری نەدەچووەوە، خودی خۆی بوو کە نەزۆکە و مندالّ ناخاتەوە. بۆ دەیەمین جار لە کچۆلّەکەی ڕوانی، ئەو پرچە خەنەییەی چون زێڕ بە بەر خۆرەوە شەوقی دەدایەوە، تۆ بلّێی پرچە سەری زێڕ نەبێت؟ ئەمە تا بەچاوی خۆت نەیبینی وەسف ناکرێت، چاوەکانی لە مێینەییدا بەرسڤی بۆ نەبوو، دوو لێوی ئاودامان. سیما.. هەموو ئەو شتانەی بۆیان هاتبوو، وەلای نان و ڕووی لە پیرە کرد.

ئیچما.. بەوردی لە جلوبەرگەکەیەوە بۆی دەرکەوت کە لەکۆشکەوەیە، ئەمەی بە هەلّ زانی. کچۆلّەکەیش چون هەستکردن بە باوکایەتی سیحراویانە بزەی بۆ کرد، بۆیە بەپەرۆشەوە بوو خۆی بهاوێتە ئامێزی و بەرەو حەوا بەرزی بکاتەوە. ئەویش وەك ئەوەی ئەو حەزەی کچۆلّەکەی پێگەیشتبێت، لە ئامێزی گرت و بەرەو ئاسمان بلّندی کردەوە. دواتر دەستی لە باخەلّی نا وکیسەیەك لیرەی زێڕی لە بەرکیدا دەرهێناو وەپیرەپیاوی دا، هەر ئەو پارەیە بوو کە داینابوو ماینێکی ڕەسەنی پێبکڕێت. ئیچما.. بە پەرۆشەوە لە کیسەکەی ڕوانی و دواتر دەستی (سیما)ی ڕامووسی و بەرەو زێدی خۆی گەڕایەوە. لەخۆشیدا لە سترانبێژیی خۆی نەدەکەوت.

**" کاتێ دلّسۆزی مەزن دەگاتە جێ.. بێشك ڕزگارت دەکات"**

********

لەوێ سەکۆیەکی گەورەی لە مەڕمەڕی سپی و ئاڵتوونی و بەدەوریشیدا کۆمەڵێك پەیکەری بابلی و لەناوەندیشدا نافورەیەکی نەخشێنراو، ئاوی لە ڕووبارەکەوە بۆ ڕاکێشراوە، هەرگیز باوەڕ ناکەیت بەر لەچوار هەزار ساڵ بەم شێوازە ئەندازەییە و بەو وردەکارییە دروست کرابێت. بەسەر سەکۆکەشەوە ئەو هەموو کیژە ڕووتانەی پاڵکەوتوون، ئەوانەیش کە بە پێوە ڕاوەستاون، لەنێوەندی هەر هەمووشیان ئەو کوڕە قۆزەی بە هێمنی دانیشتووە، بەهێزی بازووی و باڵا بەرزی و چوارشانەییەکەی دەڵێی کەسی تر لەو شێوازە نەخوڵقاوە. ئەمە و سیحری سروشت و بینای بابلی بە چوار دەوریدا ئەوەندەی دی جوانی و دڵڕفێنییان بەو ناوە داوە، ئەوجا بزانە تۆ لە سەردانی کۆشکێکی لە کۆشکەکانی بابل دای.

ئەم گەنجە بەهێز و قۆزەش (زوحاك)ە، تەنها کوڕی (کوش)ی پاشای مەزنی (بابل)ە، دوای تێپڕبوونی سەد ساڵ بەسەر لەدایکبوونی "برۆکانت بۆ سەرسوڕمان بەرز مەکەرەوە، تەمەنی بنیادەم ئەو سەردەمە لەنێوان پێنج سەد تا هەزار ساڵ دەبوو".

ئەوەتا لە جوانی و سیحری شوێنەکە بەملاو ئەولادا چاو دەگێڕیت، کە ڕەنگە سروشتی وا جوان ناوازە لەسەر گۆی زەویدا دووبارە نەبووبێتەوە. لێ لەناکاو چاوەکانت لەنیگابڕینی کچەکان دابڕی. پیاوێکی پیری شەل، کە زۆربەی ددانەکانی لەدەستدابوو، چەناگەشی تاڵ تاڵ ڕیشی خوار و خێچی بەردابووەوە، چون ئەوەی لە ئەوجی گێلیدا بێت، عەبایەکی پەڕپووتیشی بەشانەوە و بە لارە لار لە سەکۆکە نزیکبووەوە. سەرکەوتە سەر سەکۆ مەڕ

مەڕییەکە و چاوانی کچانی ڕووتی پیا تەقینەوە. زوحاك.. دەستی کردە چەتر و بە کزییەکەوە لێی ڕوانی. بەگاڵتەجاڕییەکەوە پێی گوت:

- هۆ گەڕی نابووت چۆن گەیشتیتە ئێرە؟

پیرە پیاو ڕووی لێ نا، بە دەنگێك لە فیشکەی مار دەچوو، پێیگوت:

- بەم شەلەشەلییەوە بە شوێنێکی گەڕو پیس و نابووتدا تێپەڕیم، زۆر کەسم دیت، تەپلەی پێکەنیناویان لەسەر نابوو، کاتێ بە پێوە دەوەستان، ورگیان ئەوەندە زل بوو، باڵندە بەسەریانا دەنیشتنەوە، بەناوی کوڕی (کوش)ی مەزنەوە باسیان لەسروشت و کەشوهەوا دەکرد، حەزمکرد ئەم کوڕی (کوش)ی مەزنە ببینم، کە بینیم وەك بارگیر لەناوەندی ئەم مێینە ڕووتانەدا لنگی لێ ڕاکشاندووە، ئەویشم چون ئەو مێیانە هاتە بەرچاو، نەشمشێری لە هەسان دەدا، نەیش ڕمی ڕاستەوە دەکرد.

کچێلی ڕووت و قووت دەستیان بەسەر دڵیانەوە بوو. پاسەوانەکان ورووژان، چاویان لە(زوحاك) بڕی، هەر کە ڕاستەوەبوو، بلەز ڕمی لە دەست پاسەوانێك قەپاند و لەدڵی پیرە چەقاند، چون پەیکەرێك ڕما. زوحاك.. بە تووڕەییەوە گوتی:

- ئەم پڕوپووچی گەڕە فڕێ بدەنە بەردەم شێرەکان، داوای لێبووردنیشیان لێبکەن، کە ئەمڕۆ ئەم گۆشتە بۆگەنەیان وێدەدەین.

پاسەوانەکان پیرەی کوژراویان هەڵگرت و لە چاڵی شێرەکان تووڕیان دایە خوارەوە. دیواری چاڵەکە وەك سونبولێك بۆ شارستانییەتی بابلییەکان بەوێنەی شێر نەخشێنرابوو. چاڵەکە چەندین شێری تێدابوو، لاشەی

کوژراوی پیرە شەل بە تووڕدانی بۆ ناو شێرەکان، هەر بە حەواوە قۆستیانەوە و پارچە پارچەیان کرد و خواردیان. زوحاك.. بە تووڕەییەوە گوتی:

- هەموو ئەم پاسەوانانەم بە دوویدا بۆ فڕێدەنە چاڵەکەوە، واپێدەچێت باوکم(کوش)ی مەزن نەزانێت پیاوەکانی هەڵبژێرێت.

زوحاك.. بە تووڕەییەوە سەکۆکەی جێهێشت و بەرەو ناوەوەی کۆشکی مەزنی بابل ڕۆیشت. بەدەم ڕێوە لەهەموو ئەو پاسەوانانە تووڕە دەبوو، کە پیا دەتەقینەوە.. دەرگای ژوورە تایبەتە ڕازاوەکەی کردەوە و دوا بە دوای خۆی بە تووڕەییەوە دایخست.

" بیرم نییە کە ناوێکی ترت هەبێت، هەی کوڕی(کوش)ی مەزن"

زوحاك.. هەردووك چاوی ئەبڵەق بوون، بەدووی سەرچاوەی دەنگەکەدا گەڕا. پیاوێك زۆربەی ددانەکانی لەدەست دابوو، چەند تەڵە ڕیشێکی خوار و خێچی بەردابووەوە، عەبایەکی شڕوشیتاڵیشی بەسەر شانەوە، دەنگیشی لە فیشکەی مار دەچوو.

ئەوەتا جارێکی تر لە (بابل)داین، بەڵام دوور لە کوشکی پاشایەتی، ڕێك لەدەوروبەری شاردا، کە بیناکانی لە جوانیدا لە جوانی کوشك کەمتر نەبوون. پیاوێك بەسواری ئەسپێکی ڕەسەنەوە، کۆمەڵێکیش لە پیاوان بە یەك جۆر پۆشاکی سەربازییەوە بەدوویەوەن. ئەمە..(ئۆنس)ە، ڕاوێژکاری پاشای مەزن، بە فەوجێ سەربازی پاشایەتییەوە هاتووەتە شار تا فەرمانی

پاشا ڕابگەیێنێت. خەڵکەکە بە دڵەڕاوکێوە لەبەرامبەریدا وێستان. (سیما)ی مەیتەرەوان، یەکێکبوو لەوانەی دەوری ڕاوێژکاریان دابوو.

لەگەڵ بێدەنگبوونی حەشاماتەکە و ترس و دڵەڕاوکێیان لە فەرمانی پاشا، حیلەی ئەسپێك لە دوور ڕا دڕی بە حەشامەتەکە دا، هەمووان ڕوویان بۆ لای وەرچەرخاند، سەریان سوڕما. ماینێکی ڕەشی قەترانی حەشاماتەکەی دوولەت کرد. ئەوەی بە بان ماینەکەوە شۆڕەسوارێکی بە ئەزموون دیاربوو، دەی کە ئاشکرابوو، ترسیان لێ ڕەوییەوە، چونکە ئەو شۆڕەسوارە مێینەیە و خودی (سەمیرامیس)ە.

- فریا کەوتم، هیچم لەدەست نەچووە؟

ئەمەی بەو پەڕی دڵنیایی و خۆشحاڵییەوە گوت، کە ئەم دوو خەسڵەتە پێکەوە و لەیەك کاتدا لای کەس ڕوویان نەداوە. لەو هەمووە گەڕێ، لەو تێڕوانینی خەڵکەش گەڕێ، کە نیگایان لەنێوان خۆیاندا دەگۆڕییەوە، چون ئەوەی بڵێن" لەو ماینە بڕوانە ماینێك بەبان پشتییەوە، بڕوانە ئەو لەشکرەی پاشا، بەتایبەت (ئۆنس) وەك ئەوەی هەیبەتی شکا بێت و کەوتبێتە ژێر پێی ئەسپەکەیەوە، چاوی لە جیهانێك ئاڵکا، کە پێشتر جوانی وای بەچاوی خۆی نەبینیوە.

- سەمیرامیس.. ئاخر چۆن بەم ماینە سەرشێتەتەوە لە ناو شاردا وا بەتاو غار دەدەیت. دواتر پێم بڵێ، چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە نەهاتی و دوا کەوتی.

- باوکە.. ئەی تۆ فەرمانی نمایشکردنی (لێجیش)ی ماینەکەت وێ نەدام، ئەوەتا وەك ماینێکی ڕەسەن لەبەردەمتدایە.

بە تێڕوانینێکی مێینانە لەبەرامبەر ڕاوێژکار(ئۆنس) ئەو ڕستەیەی دەربڕی. ئەو نیگا کردنە بەسبوو، تا سەنگی خۆی بخاتە ڕوو. ڕاوێژکار بە دەنگێکی لەسەرخۆ حەشاماتەکەی وریا کردەوە بڵاوەی لێبکەن و هەرکەسەو بۆ سەر کاری خۆی بگەڕێتەوە. خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، سەمیرامیس.. بە ماینەکەیەوە ڕووی وەرچەرخاند تا بڕوات، سیما.. دەنگی لێکرد:

- شەمێرام.. وەرە ئێرە و دەستی ڕاوێژکار ماچ بکە و داوای لێبووردنیشی لێبکە. هاتنت بەو شێوەیە سەرلەبەری قسەکانی پووچەڵکردەوە، تا فەرمانی پاشا ڕابگەیێنێت.

سەمیرامیس.. وەك سوارێکی ڕاستەقینە و بەئەزموون، لە ماینەکەی هاتە خوارەوە و ڕووی لە ڕاوێژکار(ئۆنس) کرد، ئەویش هێشتا سەرسامی ئەو جوانییە بەری نەدابوو. خەیاڵکەی ڕاوێژکار بە پێچەوانە شکایەوە، چون ئەوەی ئەم داوا لەو بکات لێی ببورێت. سەمیرامیس دەستە نەرموشلەکەی بۆ لای دەستی ڕاوێژکار برد تا ماچی بکات، لێ ئەو دەستە نەرموشلە سەرنجی پێ ڕاکێشا و بەچرپە پێی گوت:

- شەمیرام خان.. ئەگەر ڕەزامەندی بفەرموون بۆ هاوسەرگیری کردنم لەتەکتانا، ئەوە دوا ڕێگایە دڵم لەو ڕفتارەت خۆش بێت.

سەمیرامیس چاوی لە (سیما) بڕی ، کە وەك باوکی ڕاستەقینە لێی دەڕوانی، بەو بۆنەوە بزەخەنەیەکی پشتگیریی وەك ڕەزامەندی هاوسەرگیرییەکەیان دەربڕی. دواتر نیگای بۆ لای ڕاوێژکار گواستەوە..

پیاوێکی بەهێز و پلە باڵای نێو دەوڵەت لێرەدا دڵی خۆی وەلا ناو هزری بۆ ڕەزامەندی لێخستە گەڕ.

شەوی دواتر (شەمێرام) بووە هاوسەری (ئۆنس)ی ڕاوێژکاری باڵای پاشا(کوش)ی مەزن، پاشای هەموو مەملەکەتی بابل.

******

ئەگەرچی چاوەکانی (زوحاك)ی قیتوقۆز بەوای تووڕەییەوە لەچرکەیەکدا سوور هەڵگەڕان، لە چرکەی دووهەمدا هێزی بازووی لێخستە گەڕ و شاڵاوی بۆ پیرەپیاو برد. کابرای پیرە لە جێی خۆی نەبزوا، تەنانەت چاویشی بۆ نەپرووکاند، بەڵکو بە گاڵتەجارییەوە لە شاڵاوبردنەکەی دەڕوانی، کە دەیویست لە یەخەی بگرێت و تووڕی بداتە دەرەوە. ئەو بەزمە بەوەش کۆتایی نەهات، بەو ئاوایەی کە لەپیرە پیاوی بینی، باوەڕی نەدەکرد ئەوە ڕاستی بێت. بە جەستەی پیرەدا ڕەتبوو، هەر وەك ئەوەی بە هەوادا ڕەت بووبێت. ئەوجا ڕووی بۆ وەرچەرخاند تا لەو شوێنەی وێستابوو بیبینێتەوە.. پیرە زۆر بە گاڵتەجارییەوە لە هەوڵەکانی (زوحاك)ی دەڕوانی. ئەوەندەی دی ڕق ئەستوور بوو، تەواو سەری پێ سوڕماندبوو. کاردانەوەی (زوحاك) لەترسەوە نەبوو، بەقەد ئەوەی سەرسوڕماوی بوو. دواتر بۆ کۆتایی پێهێنانی پیرە، دەستی بۆ مەشخەڵی ئاگری ڕووناکییەکەی ناو ژوورەکەی برد و بەدەستیەوەی گرت، ئەوجا بۆ پیرەی هاویشت، بەچاوی خۆی مەشخەڵەکەی بینی بە جەستەی پیرەدا تێپەڕی، بێئەوەی گڕی

تێبەربدات، لەولاترەوە کەوتە سەر زەوییەکە. لێرە بەدوا نیگای پیرە ترسناکتر دەرکەوت، نیگای بردە سەر مەشخەڵەکە، ئاگرەکە کوژایەوە،

هزری (زوحاك)ی بابلی کەوتە بیرکردنەوە، کە نەیدەزانی بەدروستی چی بکات. لێ ئەمجارە پیرە دەستی پێکرد، لەچاو تروکاندنێکدا مەشخەڵەکەی بەدەستەوە گرت، لە چاوپروکاندنی دووهەمدا پاشەکشەی بە (زوحاك) کرد، پیرە بوو بە دووان، بە سێیان، بە دە، تا دەهات ژمارەیان زیاتر دەبوو، تا وایانلێهات هەندێکیان بە حەواوە دەفڕین، هەرهەمووشیان مەشخەڵی ئاگریان بەدەستەوە بوو، لەیەکڕا هەر هەموویان ئاگرەکانیان تێسرەواند. زوحاك.. کە پاشەو پاش گەڕایەوە، پێی لەشتێ هەڵکەوت و لەسەر گازەرای پشت کەوت.. ئاگر لە ژوورەکە بەربوو، زوحاك سەری لێشێوا نەیدەزانی کێوە غار بدات. پیرە عەقڵی زوحاکی دەخوێندەوە، دەیزانی بیر لەچی دەکاتەوە. ئەوەی مایەی سەرسوڕمانبوو، سەرتاپای عەقڵی زوحاك هەڵچوونێکی بەکوڵ بوو، بۆ شکستهێنانی ئەو پیرەپیاوە، کە هیچ لێی حالی نەبووبوو. بەلای پیرەشەوە عەقڵی زوحاك مایەی سەرسوڕمانی بوو. لەپڕێ هەموو پیرە پیاوەکان بوونەوە بە یەك پیرەپیاو، لەنێو ئاگرەکەوە لە زوحاك نزیکبووبووەوە، بە دەنگی فیشکاندنی مار، پێی گوت:

- کوری (کوش) عەقڵی خۆت مەشێوێنە، تۆ لەهەق من نایەیت!

زوحاك.. لەبەر هاڵاوی ئاگرەکە دەستی کردە بەربەست بۆ دەموچاوی و گوتی:

- تۆ کێی؟

پیرە بە سووکی پێیگوت:

- من (لۆسیڤەر)م، میری ڕووناکی، ئەو ڕۆژەی ڕووناکی تیا خوڵقا بوو، منیش خوڵقام.

لەپڕ هەموو ئاگرەکە کوژایەوە، هەر وەك ئەوەی واهیمە بووبێت. لۆسیڤەر.. لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- تۆ ئەی کوڕی (کوش) بژاردەیت، ئەو ڕووناکییەی من تۆی هەڵبژاردووە، بەمنەوە مەزنترین کەسی سەر زەوی دەبیت، فێری نهێنیی (ماجی)ت دەکەم. هەر لەڕێی منەوە تەواوی مەردوومی گۆی زەوی بە پەرییانیشەوە دێنە ژێر فەرمانی تۆ.

زوحاك کەمێ ئارام بووەوە، ویستی بدوێت، لێ لۆسیڤەر درێژەی بەقسەکانی خۆی دا.

- لەتۆ بەولاوە کەس نییە شایستەی مەزنیی پێببەخشرێت، فەرمانڕەوایی گۆی زەوی بکات، تۆ نەبی کەس شارەزای نهێنی (ماجی) نابێت. ئەگەر بتەوێ ئەو هێزە مەزنە لەخۆت بگریت، ئەوا لە چیای (دەماوەند) چاوەڕوانت دەبم. لەوێ لەکچانی چیا پرسیار لە (لۆسیڤەر) بکە، ڕێنماییت دەکەن.

ئەوجا پیرەمێرد لەبەر چاوی ونبوو. (زوحاك)ی بە واقوڕماوی جێهێشت، کە سەرلەبەری ژیانی پێ گۆڕی.

چیای (دەماوەند) لەتاریکی شەودا تاریکتر. گەنجێکی سەرلێشێواو لەو چیایەدا بەدووی کچانی چیادا دەگەڕێت.. چ کچێلێلێکن لەم شوێنە

سامناکەدا دەژێن. چاو چاوی نەدەبینی، گوێت لە هیچ شتێك نییە، جاروبار سێبەر لەسەر شێوەی بنیادەم لەتاوێر و گابەردەکانەوە لەخەیاڵیدا دەرسکێت. زوحاك.. هەست بە نائومێدی دەکات، ناچار پڕ بە گەرووی هاوار دەکات:

- ئەی پیرەپیاو، من ئەوەتام لە چیای دەماوەند، تۆ لەکوێی؟

گوێ هەڵدەخات، تەنها سەدای دووبارەبوونەوەی دەنگی خۆی نەبێت هیچ وەڵامێك نابیستێت. دواتر لەولاترییەوە هەستی بەشتێك کرد، تەنها شتێك نییە، شتگەلێکن، بە پارێزەوە بەرەو ڕووی دێن، هەستی بە دەنگی پێیان کرد، جەستەیان دیار نەبوو، چاوی لێ تیژ کرد، بینییانی، تەنها چاویانی لێوە دیاربوو، چون چاوانی گورگ دەبریسکانەوە، لەهەموو شوێنێکدابوون، لەلای ڕاستییەوە، لەلای چەپییەوە. ئەوەی جێی سەرنجبوو، زوحاك.. هەستی بە ترس نەکرد، دڵەڕاوکێشی تووش نەبوو، بەڵکو بەدەنگێکی بەرز هاواری بەسەریانەوە کرد:

- لۆسیڤەر لەکوێیە؟ ئەو کەسەی خۆی ناوناوە میری ڕووناکی، ها لەکوێ؟

ئیدی لێرەوە جەستە چکۆڵەکانیان دەرکەوت، قەیاسەی سەد کەسێك دەبوون، نیگای تێبڕین، وەك برێ منداڵی بێ دایباب دەرکەوتن، جلوبەرگیان ڕەش و پرچیان درێژو ڕەش بە ڕەنگی تاریکی. هەر هەموویان لەبەردەم ئەشکەوتێکدا بە دوو ڕیزی بەرامبەر بەیەك ڕاوەستان. دوای ئەوەی زوحاك دوویان کەوت و لەپاینی چیاکە بەرەو کونی ئەشکەوتەکە لەنێوەندیانەوە بەڕێکەوت. هەروەك چۆن لۆسیڤەر بەڵێنی چاوەڕوانی وێدابوو، کە

لۆسیڤەری بینی، ئەو پیرەپیاوە شەل و داهێزراو و پەرپووتە نەبوو، کەسێکی وابوو وەسپ نەدەکرا، لۆسیڤەر لەسەر کورسییەکی گەورە دانیشتبوو، تاریکی دەوری دابوو، ئەگەرچی مەشخەڵە هەڵکراوەکانی کە بەدارەوە بوون زۆر بە ڕوونی لۆسیڤەریان بۆ روون نەدەکردەوە، وەلێ دیاربوو ئەو لۆسیڤەرە نەبوو، کە ئەم دەرخواردی شێرەکانی دابوو. ترسێك بەناخیدا هات، ئەوەی بەرامبەری لەسەر کورسییەکە بنیادەم نەبوو، ئەگەرچی لەشێوەی بنیادەمیش خۆی دەردەخست، ڕووخساری بەوای سەمای تیشکی ئاگری مەشخەڵەکانەوە لەلای جێگیر نەدەبوو. ئەوە دەستی بنیادەم نییە، ئەو قامکانەش هی بنیادەم نین، نینۆکی بنیادەم کەینێ وایە، ئەو شان و شەوکەتە کەی لە بنیادەمدا هەن. ئەمە دەبێت چی بێت؟ ئاخۆ ئەمە خوداوەندە و لەسەر عەرشەکەیدا دانیشتووە؟بەوای عەقڵی بابلی کۆنەوە نەیتوانی ئەو مەتەڵە هەڵبێنێت، کە دوو سێ هەنگاو لەو شتەوە دوور بوو. درکی نەکرد ئەوەی بەرامبەری (ئیبلیس)ە.

هێدی هێدی شتەکانی لا ڕوون دەبووەوە، کە تاریکی لێی شاردبووەوە، تا زیاتر لێی نزیك دەبووەوە، زیاتر ڕوخساری دەردەکەوت، خانەکانی عەقڵی زوحاك شتەکانیان تاوتوێ دەکرد. ئەو بوونەوەرەی کە پێدەچوو لۆسیڤەر بێت، قژێکی درێژی هەیە، هەر ئەو قژە درێژەی تەواوی ڕووخساری بۆ ئاشکرا نەدەکرد. لۆسیڤەر بەدەنگی خلۆر بوونەوەی بەردێکی سەر چیاکە، پێی گوت:

- زوحاك .. لەنێو هەموو پیاوانی مەردوومی دنیا، تۆم هەڵبژارد. ئەگەرچی بە ژیانێکی خەتەرناکدا تێدەپەڕی، وەلێ دەزانم دڵێکی مردووت هەیە، ناترسیت، دڵێکی ئازا و بەجەرگ و ڕوحێکی یاخی.

زوحـــاك.. موچــوڕكێك بەجەســـتەیدا تێپـــەڕی، لەترســـەوە نـــەبوو. بەدەنگێكی سووك پێی گوت:

- منت بۆ چ شتێك هەڵبژارد؟

لۆســیڤەر بــە تووڕەییــەوە بەرسـڤی دایــەوە، وەڵێ وا نـا كــە بەگــڕیا چووبێتەوە.

- تا مەردومی سەر گۆی زەوی لەژێر فەرمانی تـۆدا بـن. دوو.. فێری نهێنی (مـاجی)ت بكـەم." لـەپڕ لۆسـیڤەر لەقسـان دەكـەوێت، دواتـر درێژە بەقسەكانی دەدات" پێویستە دڵە مردووەكەت تـاقی بكەینـەوە. خۆ ئەگەر نهێنی(ماجی) بە هەڵە بەكەسێك درا، دەستبەجێ دەمرێت.

وشەی تاقیكردنەوە، كە نەیدەزانی چۆنە، غایەلەیەكی لا دروست كرد، ئەویش هەر لەترسەوە نەبوو.

- ئەو (ماجی)یە چییە، كە هـەر دووبـارەی دەكەیتـەوە، دواتـر ئـەو تاقیكردنەوەیە....

لۆسیڤەر قسەكەی پێ قاچی

- كە دەمبینی!

زوحـاك.. لـەهیچ حـاڵی نـەبوو. كەوتـە پرسـیار كـردن. لۆسـیڤەر بـە دەنگێكی بەرز گوتی:

- كە دەمبینی ترس داتنەگرێت. هەر كە روخساری خـۆم بـۆ ئاشكرا كـردی، برژانگـەكانت بپرووكێنیـت دەسـتبەجێ دەتكوژم، ئەگـەر بینیمـت د

ەترسایت، ئەوا نهێنی(ماجی)ت دەخەمە بەردەست، ئەوجا هەموو دنیا لەژێر دەسەڵاتی تۆدا دەبێت، بنیادەمێکیش چییە لە فەرمانت دەرناچێت.

زوحاك.. دەمێ بێدەنگ بوو، دواتر گوتی:

- ئامادەم، تۆش ڕووی خۆتم بۆ ئاشکرا بکە!

بلەز و لەنکاو، قژەکەی لۆسیفەر بەلادا چوو، دەموچاوی دەرکەوت، سیما شەیتانییەکەی ئاشکرابوو، لە زوحاك نزیکبووەوە، زوحاك چاوی بە نابووت و ترسناکترین بوونەوەر کەوت، لێی سڵەمییەوە، عارقە بەنێوچەوانیدا هاتە خوارەوە. قەد باوەڕی نەدەکرد بوونەوەری وا نابووت و تۆقێنەر لەسەر گۆی زەویدا هەبووبێت! ترپەی لێدانی دڵی خێراتر بوو، وەلێ دانی بەخۆیدا گرت، برژانگەکانی نەپرووکاند، ما بیر لە جوانترین و خۆشبەختترین کاتەکانی ڕابردووی بکاتەوە، تا ترس ئامبازی نەبێت، لێ دڵی هەر ئارام نەدەبووەوە. ناچار گوڕی بەخۆی دا، بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە گوتی:

- تۆ چ بوونەوەرێکی نەفرەتلێکراوی!

لۆسیفەر چرچاوی لێکنا، ئەوەندەی دی تۆقێنەر بوو، گوتی:

- من ئەهریمەنێکی یاخیم.

ئەو دیدارە یەکەم دیداری سەر زەوی نێوان بنیادەم و ئیبلیس بوو، کە ئەویش لە بابل ڕوویدا، یەکەم شارستانییەتیی دوای زریانەکەی نوح بوو. ئێدی زوحاك هەموو شەوێ سەردانی ئەشکەوتەکەی (لۆسیفەر)ی دەکرد.

لۆسیفەر.. فێری نهێنی (ماجی)یەکەی کرد. ماجی.. بەزمانی بابلییەکان یانی سیحر.

زوحاك.. یەکەمین کەسبوو لەسەر گۆی زەوی فێری سیحر بوو، وەلێ مێژوو نازناوێکی تری لێنا، بەو نازناوەوە ناوبانگی دەرکرد، ناوی ڕاستەقینەی (زوحاك) بوو، لەمێژوودا بە نەمرود پاشا ناوی هاتووە.

پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك بەسەر ئەو دیدارەیاندا، زوحاك.. تەڵەی بۆ (کوش)ی باوکی نایەوە، چاڵێکی مامناوەندیی هەڵکەند، لەخوارەوە زیاتر لە پەنجا ڕمی چەقاند، چاڵەکەی بە گەڵای دار ڕووپۆش کرد. ئەمە یەکەم تەڵەی بنیادەم بوو لەمێژوودا. ئەو تەڵەیەی (کوش)ی پاشای پێ لەناوبرا، زوحاکی گەیاندە عەرشی دەسەڵات، دواتریش پاشایەکی خوێنڕێژ و ستەمکار نەك تەنها پاشای بابل بێت، بەڵکو هەوڵیدا پاشای مەزنی هەموو پاشاکان بێت.

پاشایەکی ستەمکار و خوێنڕێژ بێت، ئەمە ڕوونە، وەلێ پاشایەکی ستەمکاری ناڕاستەکراوی ساحیریش بێت، ئەوا نەگبەتییەکی گەورەیە بۆ سەر مەردوومی سەر زەوی، کە پێشتر نەبووە. نەمرود.. هەر هەموو ئەو خەسڵەتانەی لەخۆ گرت، هەر ئەویش بوو یەکەمجار تاجی پاشایەتیی بۆ خۆی داهێنا و بیرۆکەی ئەو تاجەشی لە پاشای جنۆکانەوە وەرگرت، تاجێکی لە ئاڵتوون دروستکراو، ئەنگوستیلەیەکی گەورەی زێڕیشی لە پەنجە نا.

مێژوو وەبیرمان دێنێتەوە، کاتێ (نەمرود) تاجەکەی لەسەر کرا، گوتی:

- من پاشای هەموو دنیام، دنیا بەدارو بەردییەوە موڵکی ئێمەیە.

تا ئەمڕۆش کەس نازانێت وشەی (ئێمە) مەبەستی لە کێی تر بووە.

ئەوە جەنگە بۆ سەر مەملەکەتی( بێکتریا). هەر کە نەمرود لەسەر عەرشی خۆی دانیشت، سەردەمی جەنگی هێنایە ئاراوە، دەهۆڵی جەنگی کوتا. ئۆنس.. تازە زاوابوو، هێشتا تێری لە هەنگوینی زاوابوون نەخواردبوو، بەدەم بانگەوازی جەنگەوە ڕۆیشت، هەر ئەویش نا، سەمیرامیسی هاوسەریشی لەگەڵدا ڕۆیشت، ئەو شۆڕەسوارەی لە ڕمبازیدا هاوتای نەبوو، هاوشانی مێردەکەی دابەزییە مەیدانی جەنگ. بەڕاستی دیمەنیان وەك بووك و زاوا سەرنج ڕاکێش بوو.

سەمیرامیس.. وەك سەرکردەیەك پێشڕەوی لەشکرێکی سەربازیی کرد. ئەو سەرکردە شۆخ و شەنگ و نەشمیلە، بەدەر لە چرپی برژانگەکانی، بە ئەسپەکەیەوە ڕەخشی لەشکرەکە بوو، لەچاوەکانیشیەوە بیرمەندی و زیرەکی و قارەمانێتی دیاربوون. نەك هەر ئەوە، ئەو دەیتوانی پێشڕەوی لەشکرێك بکات، هەڵبەت دەشیتوانی ئیمپڕاتۆرییەتێکیش وێك بنێت.

لەوجەنگەدا (شەمێرام) زیرەکی و ئازایەتیی خۆی دەرخست، توانی مەملەکەتی( بێکتریا) بڕووخێنی و داگیری بکات. هەواڵەکە بە پاشای نەمرود وەك سەرکەوتنێك لەسەر دەستی (سەمیرامیس) گەیشت. پاشا بەو هەواڵە زۆر سەرسام بوو، ئافرەتێك سەرلەشکر بێت و سەرکەوتن بەدەست بێنێت. پاشا بۆ خەڵات کردن بانگهێشتی ناو کۆشکی کرد. ئەوە یەکەم دیداری (نەمرود)ی پاشای مەزن و سەمیرامیس بوو.

ئەمرودی پاشا لەسەر کورسی عەرشەکەی دانیشتبوو، چون هەموو جاریٚ بەگژ راویٚژکارەکانیدا دەهاتەوە، کە راویٚژکار(ئۆنس) یەکێکبوو لەوان. لەپڕ سەمیرامیس خۆی بە ژوورا کرد و بە هەموو جوانی و باوەڕ بەخۆ بوون و ئازایەتییەوە وەك جەنگاوەرێکی بە ئەمەکی پاشای مەزن و بابل بەرامبەر پاشای مەزن دەرکەوت. زوحاك.. هەر کە چاوی پێکەوت، سەمیرامیس ترپەی دڵی زیاتر بوو، ئەویش لەسەرسامییەوە بوو. لەخۆی پرسی ئەم دڵەم بۆ راچڵەکی، هۆکار دەبێت چی بێت، تۆ بڵێی بەهۆی یەکەمجاری بینینی پاشای مەزنەوە بێت؟ لیٚ ئەمەی رەتکردەوە. ئەو کەسێك نییە وا بە ئاسانی لەبەر کەسێك راچڵەکێت. لەو دەمەیدا ( زوحاك) لەتەك راویٚژکارێکی دەدوا، دواتر کە هەستی بە ئامادەبوونی کەسێك کرد، ڕووی بە لایدا وەرچەرخاند، هەر کە چاوی پێکەوت، لەسەر عەرشەکەی هەستا. کاتیٚ بینی لەسەر کورسی عەرشەکەی راستەوە بوو، ئەودەم لەخۆی پرسی.. بۆچی هەستا؟ ئەوی مەزن بۆچی لەبەر کەسێك هەڵدەستیٚ. نیگای چاویان لەتەك یەکدا ئاڵشت کردەوە (گۆڕییەوە). نیگایەکی تر لەکەسێکەوە سۆسەی کردن. نیگای تووڕەیی لە (ئۆنس)ی مێردەکەیەوە بوو، ئەو نیگا ئاڵشت کردنەوەی بەدڵ نەبوو، کە لەبەر چاوان نەدەشارایەوە، ئەوجا نیگایەکی تر لەچاوانی ئەهریمەنەوە هاتە مەیدانەکە ئەویش نیگای لۆسیفەر بوو.

******

زۆری پێنەچوو، چون ئەوەی بیەوێ بە چاوی خۆی ببینێت (ئۆنس)ی ڕاوێژکاری لەسەر قەلاَکەوە تووڕ بدرێتە خوارەوە، ئەوجا بە گاڵتەجاڕییەوە لێی بڕوانێت. دواتر نەمرود لەتەک سەمیرامیس هاوسەرگیری کرد. زەماوەندەکەیان هەر هەموو خەڵکی بابل ئاهەنگیان بۆ گێڕا، سێ ڕۆژان ئاهەنگێڕان بەردەوام بوو، دیاری و شیرینی بەهەموو مەملەکەتدا بەخشرایەوە. خۆر و مانگیش بەیەک گەیشتن، هەر وەک چۆن لە ئەفسانەکاندا هاتووە خۆر و مانگیش بەیەک گەیشتن، خۆر نەمرودی خوداوەند و مانگیش سەمیرامیس بوو.

هێز و دەسەلاَتی مەملەکەتەکە دوای ئەوەی سەمیرامیس چووە پاڵ پاشای مەزنەوە هاوتای نەبوو، پیلان و دانایی لەبواری سەربازی و ستەمکاری چووە پاڵ سیحرەوە، ئیدی مەملەکەتی نەمرود دەستی بە پەلاماردانی مەملەکەتەکانی دەوروبەر کرد، بەوەشەوە نەوێستا تەماحی دەسەلاَتی زیاتری هەبوو، دەیویست شالاَو بۆ ئاسمانیش بەرێت، شەش هەزار زەلامی لە هەر حەوت مەملەکەتەکە کۆکردەوە، داوای لێکردن قوچکەیەک دروست بکەن، کە دەستی مرۆڤ بە لووتکەکەی نەگات. ساڵێکی بوێت بۆ سەرکەوتن بەو قوچکە، هەورەکانیش تێپەڕێنێت. ئیدی کرێکار و ئەندازیارەکان تەنانەت جنۆکەکانیش لەو بیناکردنە بەشدار بوون، چەند ساڵێکی نەبرد، یەکەم سەیروسەمەرە لەو حەوت سەیروسەمەرانەی دنیا بنیات نرا و لەناو سنووری کۆشک و عەرشەکەی نەمرود قووتەوە بوو.

*******

نەمرود لە باخەڵی سەمیرامیس نووستبوو، بەسۆزەوە دەستی بەسەرقژی پاشای مەزن دەهێنا، کە لەناخەوە ئەو پەیمانەی بەخۆی نەدابوو، ئەو دەم نەمرود لە پەیوەندییەکی تردا بوو، خەونێکی زۆر سەیری دەدیت، خۆی لەوەدا بینییەوە، چون ئەوەی بەسەر پشتی ئەسپێکەوە بێت، لە ئەرزەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕی، کاتێ لە هەورەکان ئاودیو بوو، خۆی بەرامبەر سوارێك بینییەوە. بۆ دڵنیابوون کە ئەوەی دەیبینی سوارە و وەك ئەو لە ئاسمانـدا دەفڕێت، لای لێ کردەوە، لەو شوێنەی خۆی نەیبینییەوە، لەپڕ دیار نەما، لەجێی ئەو ئەستێرەیەکی پرشنگدار دەرکەوت، دواتر لێی وردبووەوە، شۆڕەسوارەکەی بینییەوە، کوتومت لەخۆی دەچوو، هەر ڕێك خۆی بوو، لەپڕێ هیچی لێ دیار نەما، ئەستێرە پرشنگدارەکەیش دەرنەکەوتەوە. دیسان شوێنەکانی سەح کردەوە، سوارەی بەدی کرد، وەك تیر لە کەوان دەرچوو، بەرەو زەوی سەربەرەو خوار دەبووەوە، چون ئەوەی لەخەونەکەیدا بچێتە گیانی نەمرودەوە. نەمرود ڕاچڵەکی و هاوارێکی بۆ کرد. لەخەونەکەی بێدار بووەوە، چاوە جوانەکان و دەستە نەرم و شلەکانی سەمیرامیس فریای کەوتن، دەستی بەنێوچەوانییەوە گرت، تا هێوری بکاتەوە.

سەمیرامیس بەڵەدترین کەسانی لەبواری خەوننامەدا بۆ هێنا، تا شرۆڤەیەك بۆ خەونەکەی بدۆزنەوە. ئەوان هاتبوون دەترسان تەفسیری خەونەکەی بۆ ئاشکرا بکەن، دواجار پاشا لێیان تووڕەبوو، هەموویان تۆقیبوون، چونکە دەترسان خەونەکەی بەڕاستی بۆ بگێڕنەوە، نەوەك پاشا لەتووڕەییدا لەملیان بدات، سەمیرامیس بەڵێنی سەلامەتیی وێدان، گوتیان: بەم نزیکانە مەلۆتکەیەك لەدایك دەبێت، کوشتنتان لەسەر دەستی ئەو

کۆرپەیە دەبێت. پاشای مەزن چون گڕکانێك گڕی گرت، بڕیارێکی دەرکرد، هەرچی لەدایکبووی نوێیە لەحەوت مەملەکەتەکە بکوژرێن. بڕیارەکە جێبەجێ کرا، دامودەستەکەی بۆ کوشتنی هەر مەڵۆتکەیەك بە مەملەکەتەکان بڵاوبوونەوە. لەو ڕۆژانەدا (ئیبراهیم)ی پێغەمبەری خودا لەدایك دەبێت، دایکی لەبەرچاوان دووری دەخاتەوە و دەیشارێتەوە تا گەورە دەبێت. ئەو سەردەمە بابلییەکان ئەستێرەیان دەپەرست، پەیکەریان بۆ درووست دەکرد و کڕنووشیان بۆ دەبرد، لەو ئەستێرانەش خۆر و مانگ. خۆر پەرستراوی بالآیە و ئەویش نەمرودی مەزنە، مانگیش سەمیرامیس بوو. نەمرودیش یەکە دڵسۆزی ئەهریمەن بوو. بەوای ستەمکاری و خوێڕشتن و شەڕ لە دوای شەڕ، بوار بۆ ئیبراهیم ڕەخسا لەناو خەڵکیدا بانگەوازی پەرستنی یەك خودا بدات و کڕنووش بۆ پەیکەرێك نەبەن نە سوود و نە زیانی هەیە. کار گەیشت بەوەی حیکایەتەکەی ئیبراهیم ببێتە دەنگوباسی بابل. بەهاربوو، مەردووم بۆ جەژنە بەهارە دەرچووبوونە دەرەوەی شار، کاتێ گەڕانەوە، بۆ شوکرانە ڕوویان لە پەرستگای بابل کرد، پەرستگای ئوور، کاتێ بینیان گشت بتەکانیان شکابوون، پاچێکیش بە گەردنی پەیکەری گەورەوە هەڵواسراوە، کە بە(مەردۆخ) ناویان دەبرد. مەردۆخ لە شوێنێکی بەرزتر لە پەیکەرەکانی دی مینا خوداوەند دانرابوو.

خەڵکەکە بەو کارە قەڵس بوون، ڕقی (ئیبراهیم)یشیان بیر کەوتەوە لەمەڕ پەیکەرەکانیان کاتێ ڕوو بە ڕووی بوونەوە، باسەکەیان خستە بەرگوێی. ئەویش وەڵامیانی دایەوە:

- ئەو کارە حەتمەن ئیشی گەورەکەیانە، لێی بپرسن.

خەڵکەکە ئەوەندەی تر هەڵچوون، هەواڵەکەیان گەیاندە پاشای مەزن. ئەوە ئەو دیدارەی نێوان(نەمرود) و (ئیبراهیم)بوو.

- ئەی ئیبراهیم.. ئەو خوداوەندە کێیە تۆ دەیپەرستی؟
- ئەوە ئەو خودایەیە کە ژیان و مەرگی بەدەستە.
- منیش ژیان و مەرگم بەدەستە، لەمل زیندانییەك دەدەم و دەیکوژم، لەیەکێکی تر خۆش دەبم، لێ دەگەڕێم بژێت.
- خودای من خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێت، تۆش لە خۆرئاواوە هەڵیبێنە.

ئەگەرچی نەمرود بەو پرسیارەی تێکچوو، لێ گوێی وێ نەدا. فەرمانی دەرکرد دەرهەق بەو تاوانەی ئیبراهیم کردوویێتی، کوشتنێك بکوژرێت بیری لێ نەکرابێتەوە، بڕیاری دا ئاگرێکی گەورە بکرێتەوە، بە مەنجەنیق ئیبراهیمی تێ فڕێ بدرێت. خەڵکی بابل یەك مانگی ڕەبەق داریان کۆکردەوە، ئاگریان تێبەردا، ئاگرەکە ئەوەندە بەرزەوە بوو، لەوپەڕی مەملەکەتەوە دیاربوو، ئەوجا (ئیبراهیم)یان بە مەنجەنیق فڕێدایە ناو ئاگرەکە، چەندین شەو و ڕۆژ ئاگرەکە نەکوژایەوە، لێگەڕان تا بەتەواوی دامرکایەوە، ئەوجا بە فەرمانی پاشا بگەڕێن بۆ سووتمانەکەی ئیبراهیم و کۆی بکەنەوە، تا پیشانی مەردوومەکەی بدەن کە نەماوە. کاتێ بینییان ئیبراهیم هیچی لێ نەهاتووە، تەنانەت بە پێی خۆی وێستاوە. نەمرود دەبوو خۆی لەو گرفتە ڕزگار بکات، ناچار تووڕەبوونەکەی بردە لای لۆسیڤەر، ئەوەی نەمرود کردی جێی سەرسوڕمان بوو، کە بڕیاری دا بە گژ ئەهریمەندا

بچێتەوە. ڕەنگە نازناوی (نەمرود)یش لەوەوە هاتبێت، کە بەگژ شەیتاندا چووەتەوە. خۆی گەیاندە ئەشکەوتەکەی دەماوەند.

- کوا ئەو هێزە لەبن نەهاتووەی بانگەشەت بۆ دەکرد، ئاگرێك بەو گەورەیەی هەڵمکرد، مرۆڤێکی گۆشت و خوێنی بۆ نەسووتێ، یانی چی؟

- یانی ئەویش وەك من شەیتانە.

- بەڕاست.. مەبەستت ئەوەیە لەتۆ شەیتانترە؟ دواتر ئێمە ئیبراهیم دەناسین، باوکی ئیبراهیم (ئازەر)ی پەیکەرتاشە.

- بۆت نییە هەموو شتێ کە دەیزانم بیزانیت، ئێمە هاوپەیمانی یەکین، دواتر تۆ چیت، بنیادەمێکیت برسی دەبیت و میز دەکەیت و دەمریت.

- ئەو هێزە کوا، بە قووللەکەی خۆم بۆ سەر هەورەکانیش بەرز بوومەوە هەر نەمدۆزییەوە، لەتەك تۆش بۆ ئەسفەلی سافلین شۆڕ بوومەوە، هەر نەمبینییەوە.

- هێزەکە هەر ئەوەیە تۆ پاشای مەملەکەتێکیت، ئەوەی گوێی لەناوت بووە، ترساوە و بەس، خێزانگەلێك لە جنۆکەکان بە فەرمانی تۆ هەڵسوکەوت دەکەن.

- بەڵێ.. ئەوە ڕاستە، تەنها یەکێك نەبێت، ئەویش ناوی ئیبراهیمە، ئەو چیی هەیە کە من نیمە، تۆش هەر نیتە؟

- ئەو هەژارە، لە فێڵ بەولاوە هیچی نییە، هەر فێڵ بوو لە ئاگر پاراستی.

- تۆ درۆزنی، درۆزنێکی هیچوپووچ، سوێند بێت ئەودەمەی ئەو هێزە دەدۆزمەوە بتکوژم و پارچە پارچەت بکەم.

بڕیاری یاخیبوونی خۆی بەسەر (لۆسیڤەر)دا. دوای یاخیبوونی نەمرود بەسەر باوکی و کوشتنی، لە خوداوەندیش هەڵگەڕایەوە و بانگەشەی بۆ خوداوەندی خۆی ڕاگەیاند. بەسەر ئەو ئەستێرانەشدا یاخیبوو کە مەردوومەکەی دەیانپەرست. بەسەر هەموو شتێکدا یاخیبوو، دوای هەر هەموو ئەمانە یاخیبوونی خۆی بەسەر ئەو کەسەدا ڕاگەیاند، کە فێری سیحری کرد ئەویش (ئیبلیس)بوو.

(زوحاك).. یا میری یاخیبوو، وەلێ لەسەر زەوی بێ ڕکابەر.

*******

- گەورەم زوحاك.. چێشتلێنەرە تازەکەی پاشامان گەیشت. ئەمە دوای ئەوەی چێشتلێنەرەکەی ترمان بەفەرمانی گەورەمان لەکارەکەی دەرکرد.

- با بێتە ژوورەوە و زۆرم بۆ نەڕێسێت.

نەمرود لەتەك ڕاوێژکارەکانیدا لە وتووێژدابوو، تا هەستی بە هەنگاوی نەرم کرد، سەری بۆ بەرز کردەوە، تا بزانێت ئەوەی دەبێتە چێشتلێنەری کێیە. هەر کەچاوی پێکەوت، چاوەکانی زەق بوون، ڕاوێژکارەکان سەرنجیاندا. چێشتلێنەرەکە دەموچاوی ئاسایی بوو، پیرە پیاوێکی شەل د نۆربەی ددانەکانی لەدەست دابوو، عەبایەکی شڕو وڕی بەسەر شانەوە. پیاوە پیرەکە بزەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەی تێسرەواند. بەو بزەخەنەیە ئەوەندەی دی سەروسیمای ناشرینتر بوو.

پیرە بە دەنگێکی گاڵتەجاڕییەوە گوتی:

- گەورەم نموونەیەکم لەو خواردنەی دەستی خۆمم بۆ هێناوی، تا لەکارەکەم حاڵی بیت.

پیرە لەسەر سینییەکی ئاڵتوونی کە خۆرادنێکی بەلەززەتی بەسەرەوە بوو، لەپاشای نزیك کردەوە.

نەمرود.. ڕێك و ڕەوان پێی گوت:

- پێویست بە نموونە ناکات، تۆمان ناوێت.

پیرە بزەخەنەیەکی تری بۆ کرد، ددانە شاشەکانی بۆ دەرکەوت، گوتی:

- گەورەم.. داوای لێبووردنت لێدەکەم، وەك ڕێزێك بۆ پاشای مەزنمان ڕێم بدە شانەکانت ماچ بکەم.

پیرە بەداماوی لە نەمرودی پاشا نزیکەوە بوو، لەبەردەمیدا کڕنووشی برد و کە ڕاستەوەبوو هەردوو شانی ماچ کرد، دواتر ئیزنی لە پاشا خواست، بەڕێی خۆیدا گەڕایەوە.

- گەورەمان.. خواردنەکەی بەر لەتۆ لێمان خوارد، زۆر بەتام و بەلەززەت بوو، بۆچی ڕەتتان کردەوە؟

نەمرود.. چون ئەوەی خۆی لەو پرسیارە بدزێتەوە هیچ بەرسڤێکیانی نەدایەوە. لۆسیفەر.. بەو شێوازە کە داوای لێبووردنی لێکرد، دروست بۆ لێبووردن بوو، یا مەبەستێکی لەپشتەوەبوو؟

نــەمرود لــەجێی خــۆی هەســتا و بــەرەو ژووری (ســەمیرامیس) ماوسەرەکەی ڕۆیشت. هـەرجارێ تووشـی نەهامەتییـەك بهاتایـە، پـەنای بۆ مەعشووقەکەی دەبرد، کە زیرەکییەکەی سەنگی چیایەکی ئاڵتوونی هەبوو.. هـەر کـە چـووە ژوورەوە، تەماشـای جوانییەکـەی (سـەمیرامیس)ی کـرد، سەرقاڵی دامێنـانی پرچـە ئاڵتوونییەکـەی بـوو. ناگـەهان لـە ئەژنۆکانییـەوە هەستی بەئازارێك کرد، چون ئەوەی ئێسکەکانی بێنەوە یەك. لەپڕ هاواری لێ بەرزەوە بوو، کەوتە سـەر زەوی. شـەمیران بلـەز خـۆی گەیانـدە سـەری، لێ لەشوێن خۆی داما، ئەوەی لەبەر چاوی ڕوویدا، وەختەبوو شـێتی بکـات، لە هەردوو ئەژنۆی نەمرودەوە دوو ماری ڕەش هاتنە دەرەوە، دەمـێ دەئاڵێنـە گەردنییەوە، دەمێکیتر بە شـانییەوە دەخشـێن، جارجـارەش خۆیـان بـەژێر جلوبەرگـەکانی دەکــەن. هــەردوو مارەکــە دەیانفیشــکاند، کەڵبــەکانیان بەدەردەخست، هـیچ کاردانەوەیـەك نـە لـەلای نـەمرودەوە نـەیش لـە لایـەن شەمێرانەوە نەبوو، چـونکە هـەردووکیان لـە خـۆ چـووبوون و لەژوورەکـەش تەنها فیشکەی مارەکان دەهات.

*******

لۆسیفەر.. نامەیەکی بۆ نەمرود ڕەوانە کرد، تێـدا نووسـیبووی" هـەموو کاتێ دەمە برسییەکان تێر بکە، چـونکە ئەگـەر هیچیان دەست نەکـەوێت، کەللەت شك دەبەن بیخۆن". لەوساوە نەمرود ڕەفتاری گۆڕیـوە، مـا هـەموو ڕۆژێك دامودەستەکەی دابەزێنێتە ناو مەملەکەتـەکان، و هـەر ڕۆژەی سـەری دوو منداڵ ببڕن و کەللەکانیان بۆ پاشا بێنن. دەبوو ڕۆژانە ئـەو دوو کەللەیـە

دەرخواردی مارەکانی سەرشانی بدات. کەللە سەرەکانیش هی منداڵ بن، چونکە مارەکان کەللەی گەورەیان ڕەتدەکردەوە. کەس نەیدەزانی نەمرود بۆچی سوورە لەسەر ئەوەی هەموو ڕۆژێك کەللەی دوو منداڵی پێبگات. هەرکەسێکیش ئەم فەرمانە ڕەتبکردایە لەملی دەدرا. کەسیش بە نهێنیی ئەو عەبایەی نەدەزانی، کە نەمرودی پاشا لەبەری دەکرد، دواتر ئەوە چییە لەژێر عەباکەی دەجووڵێت! بۆ کەس نەبوو پرسیار لە پاشای مەزن بکات.

نەمرود هەوڵیدا هەردوو مارەکە سەربڕێت. هەر کە سەریانی دەبڕی، لەسەر شانی دروست دەبوونەوە. سەمیرامیس زۆر بەزەیی بە مێردەکەیدا هاتەوە، لەهەر حەوت مەملەکەتەکەوە حەکیمی بۆ هێنا. هەر حەکیمێکیش چاوی پێدەکەوت، دەستەوەستان لە جیاکردنەوەی مارەکان لە لەشی پاشا دەوەستا. هەر حەکیمێکیش بە نهێنییەکەی زانیبا ، دەیکوشت.

لەوپەڕی شار پیاوێکی ئاسنگەر هەبوو، ناوی (کاوە)ی ئاسنگەر بوو، پیاوێکی ئازا و چاونەترسبوو، کاوەی ئاسنگەر.. خەمێکی قووڵ دایگرتبوو، بەر لەچەند ڕۆژێك جەندرمەکانی پاشا هەردوو کوڕەکەی بە بەرچاویەوە سەردەبڕن و کەللە سەرەکانیان بۆ پاشا دەبەنەوە. کاوەی ئاسنگەر پیاوێکی موسوڵمان بوو، لایەنگری ئایینی ئیبراهیم بوو. دوای ئەو زوڵمەی لە کوڕەکانی کرا، دابەزییە ناو مەردوومەکە، بەتایبەت ئەوانەی هەمان زوڵمیان لێکرابوو، ئەو ئاگرەی لەناخیدا هەڵگیرسابوو، بەو ئاگرەوە بانگەشەی شۆڕشی جاڕدا، دێ بە دێ و شار بە شار و مەملەکەت بە مەملەکەت، خەڵکێکی زۆر لەژێر بەیداغی ئازادیدا بەدووی کەوتن. کاوە بە فێڵی

ئاسنگەریی خۆی بە قووللەی (بابل)دا کرد، چون ئەوەی قووللەکە تۆکمەتر بکات.

کاوەی ئاسنگەر.. دوای ئەوەی پیلانەکەی سەر دەگرێت، ڕوو لە نەمرود دەکات و پێی دەڵێت:

- ئەی پاشای بابل و ئاشوور، خۆت بەدەستەوە بدە، سەلامەت دەبی.

- چما لەمن بەولاوە خوایەکی تر هەیە؟

- خودای ئەرز و ئاسمان.

- تۆش هەر وەك ئیبراهیم قسە دەکەیت.

- ئیبراهیم پێغەمبەری خودایە، ئێمەش باوەڕمان بە پەیامەکەی هێناوە. داوات لێدەکەین بێیتە سەر ڕێی خوا پەرستی ، کە کەس هاوبەشی نییە، ئەگەر نا شەڕت لەگەڵ دەکەین.

- ئێوە شێتبوون؟ من (زوحاك)ی مەزنی بابل و ئاشوورم، پاشای هەر حەوت مەملەکەتەکە بڕۆن تا سێ ڕۆژان هێزی خۆتان کۆ بکەنەوە، ئەوسا تەفروتووناتان دەکەم، تا کەستان بەسەر زەوییەوە نەمێنن. واتان دەسرمەوە شوێنەواریشتان نەمێنێت..

کاوەی ئاسنگەر.. تا سێ ڕۆژان لایەنگرانی خۆی و ناحەزانی پاشای لەخۆی کۆکردەوە. نەمرود.. جاڕی لەشکرێکی گەورەی بە سەرپەرشتی خۆی دا، سەمیرامیس هاوشانی مێردەکەی خۆی ئامادەی ئەو جەنگە کرد. لەشکرەکەی نەمرود چەندینجار لە لەشکرەکەی کاوەی ئاسنگەر بەژمارە زۆرتر و پڕچەککتربوو. هەردوو سوپاکە بەرامبەر یەکیان گرت. کاوە و

چەکدارەکانی لە لەشکرە زەبەلاحەکەی (نەمرود)یان دەڕوانی، لەشکرێك ترسی خستبووە دڵی سوپاکەی بەرامبەر، بەو چەك و تفاقەی لە شمشێر و ڕمی نویێ و شێوازی ڕێکخستنیان، ئەمانیش بەو چەکە کۆنانە و ژمارەشیان زۆر لەوان کەمتر بوو. نەمرود و سەمیرامیس بە گاڵتەجارییەوە دەیانڕوانییە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی بەرامبەریان. چەکدارانی لەشکرەکەی نەمرود دانیان بەخۆیاندا نەدەگرت، چاوەڕوانی فەرمانی پاشای مەزن بوون، تا تەفروتوونایان بکەن. نەمرود وەك ئەوەی لە کورتترین ماوەدا بیەوێ ئەو جەنگە بباتەوە، بەگاڵتەجارییەوە لە کاوەی ئاسنگەری دەڕوانی، چون ئەوەی کاوە بەزەیی بەخۆیدا نەدەهاتەوە و وا خۆی و لایەنگرانی خستووەتە گرفتی لەناوچوون. هێشتا فەرمانی هێرشکردنی نەدابوو، لەپڕ هەردوو سوپاکە بەلای خۆرهەڵاتەوە سەرنجیان ڕۆیشت. ئەو هێزەی نەمرود بەدوویدا ئەرز و ئاسمان گەڕا، ئەوا دەرکەوت. هێزی مەزنی خودای ئەرزو ئاسمان، سوپایەکی لەبن نەهاتوو لە لای خۆرهەڵاتەوە بەرەو مەیدانی جەنگەکە هات. سوپایەك بەری خۆری دەگرت، سوپایەك لە مێشوولە. هەردوو سوپاکەی نەمرود و کاوەی ئاسنگەر لە هیچ حاڵی نەبوون. ئەم مێشوولەیە چییە بەری خۆری لە زەوی گرت. ئەوەندەی پێنەچوو سوپاکەی لە ئاسمانەوە گەیشتە گۆڕەپانی جەنگەکە، نەمرود هەردوو چاوی زەق[1] کردبووەوە، هەوڵیدەدا لێی حاڵی بێت، سوپای پێشکەکان بەرەو خوار بووەوە، هێرشیان کردە سەر لەشکرەکەی نەمرود، ئەو لەشکرەی هاوتای نەبوو. ئیدی کوڕ ئەو کوڕەبوو خۆی دەرباز بکات. مێشوولەکان مێشوولەی

[1] ئەبلەق.

تەنانەت گۆی زەوی شتی وای بەخۆیەوە نەبینیبوو، تەنانەت لەسەردەمی دایناسۆڕەکانیش شتی وا نەبووە. لەشکرەکەی تەفرو توونا کرد، باشترین سواری لەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە دەخستە خوارەوە، ئەوەی هەلات، هەلات، ئەوەشی پێوەبوو گۆشتیش بە جەستەیەوە نەما، لاشەی ئێسك وپرووسکی لەشکرەکەی نەمرود ئەو ناوەی داپۆشی، هەرچی نەمرود و ژنەکەی بوو، پێشتر هەلاتبوون، ئەسپەکانیان تیژڕەوترین ئەسپی ڕەسەن بوون. نەمرود ڕووی لەئاسمان کرد و گوتی:

- ئەی خاوەن ئەو هێزە.. تۆ کێی؟ تۆ لەکوێی؟ تۆ ئەهریمەنیت؟

هەڵدەهات و ژنەکەشی بەدوویەوە، ڕەوە مێشوولەیەکیش دوویان کەوتبوون. ئەوەی ئازادیانی کردبوو، تیژڕەویی ئەسپەکانیان بوو، وەلێ مێشوولەیەك پێیان گەیشت و وازی لێنەهێنان، تا خۆی بە کونەلوتی نەمرودا کرد، نەمرود هاوسەنگی خۆی لەدەستدا و هاوارێکی لێ هەستا، ئەوەندەی نەمابوو لە ئەسپەکەی بەرەوە بێت، سەمیرامیس فریای کەوت و لەباڵی گرت، هاویشتییە پشتی خۆی. لە غاردان نەکەوتن، تا خۆیان بە قوولەکەی (بابل)دا کرد. دەرگاو پەنجەرەکان کلۆم دران. نەمرود هەستی بە شکستی ئەم جەنگە کرد، ئەو لەشکرە مەزنەی لەدەستچوو و تەنها پاسەوانانی کۆشکی بۆ مایەوە.، هەرچی چەکدارانی سوپاکەی کاوەی ئاسنگەر بوو، کە ئەو دیاردەیەیان بەچاوی خۆیان بینی، کڕنۆشی شوکرانەیان بۆ خودا برد، ئەوانەش کە موسوڵمان نەبوون، هاتنە سەر ئایینی ئیبراهیم، ئەوجا کاوە بە سوپاو بەیداغەکەیەوە بەرەو قوچکەی بابل کەوتنە ڕێ، ئەوەی کۆشك و عەرشی نەمرودی لێبوو. هەرچی نەمرود بوو، تەواو، بەوای ئەو مێشوولەیەی

بەکونە لووتیدا چووبوو تەواو حاڵی شڕو وڕببوو، ستارەی بۆ نەبوو، هەرچەند مێشوولەکە لە مێشکیدا دەجولایەوە، نەمرود شێت و هار دەبوو، هیچ شتێك لەو ئازارەی مێشکی ڕزگاری نەدەکرد، تەنیا کە پاسەوانەکانی ڕاهێنابوو، بە پێڵاوەکانیان لەتەپڵی سەری بدەن. سەمیرامیس بە چاوی فرمێسکاوییەوە لێی دەڕوانی، بۆی بلوایە، خۆی لەپێناویدا فیدا دەکرد. سوپاکەی کاوەی ئاسنگەر چواردەوری قوولەکەی گرت، پاسەوانەکانی نەمرود تا پێیان کرا پارێزگارییان لە قوولەکە کرد، گەماڕۆدانەکە چل ڕۆژی خایاند، کەس نەیدەزانی لەناو قوولەکە چ باسە. سەروچاوی نەمرود بە پێڵاو کێشان سوور هەڵگەڕابوو. لەناکاو دەرگای قوولەکەیان شکاند، کاوە و سوپاکەی بۆ تۆڵەسەندنەوە بەژوورکەوتن، لەبەرامبەر گەیشتنی کاوە بەمەرامی خۆی هیچ شتێك بەربەست نەبوو بۆیە ئەو ئاواتەشی هاتەدی.

******

چیای دەماوەند.. لەشەواندا تاریك و ئەمووستەچاو. کاوەی ئاسنگەر چوار مێخزنجیری لەچیاکەدا داکوتی، نەمرودی دەستوپێ لەکۆت و زنجیر کەوتبوو، لەولاترییەوە مارەکان بەسەر شانییەوە لەبرسانا دەیانفیشکاند. کاوە بەزمانێکی گاڵتەجاڕانەوە پێی گوت:

- ئەی زوحاك.. پێت نەگوتبووم دوومار بەسەر شانتەوەیە، ڕەنگە لێت بوورابام.

زوحاك هیچی نەگوت، ئاخر ئەو پێشکەیەی ناو مێشکی هەراسانی کردبوو، دەیویست لەبەر ئازار هاوار بکات، وەلێ بەهۆی ئەو پارچە پەڕۆیەی کاوە لەدەوی نابوو دەنگی نەدەهاتە دەرەوە. کاوەی ئاسنگەر.. ئەو کارەی بۆی هاتبوو، دەستوبرد ئەنجامی دا. هەر چوار پەلی بە مێخزنجیرەکەوە بەست و دیقەتی دوومارەکەی سەرشانی دا، لەبرسا دەیانفیشکاند. کاوە پارچە پەڕۆکەی ناو دەمی دەرهێنا و گوتی:

- سلاومان بە خاوەن ئەو دوومارەی سەرشانت بگەیێنە، ئەوان شایەستەی کەللەتن، نەك من.

نەمرود هاواری لێ هەستا، ڕووی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە، چون ئەوەی بانگ لەشتێك بکات، یان قسە لەتەك کەسێکدا بکات. هەرچی (کاوە)بوو.. بەسەرکەوتوویی لەچیاکە بۆ ناو مەردووم هاتە خوارەوە. کۆمەڵێك خەڵك لەچیاکە نەهاتنە خوارەوە، تەماشای زەلیلی و مەرگی (زوحاك)یان دەکرد. زۆری نەبرد دوو مارەکەی سەرشانی لەگەردنی ئالان، ئەوجا کەوتنە خواردنی کەللەی زوحاك، ئەوەندەیان لەکەللەی خوارد تا مێشوولەیەك لەکەللەی نەمرود دەرپەڕی و بەرەو خۆرهەلات هەڵفڕی.

مێژوو دوایین لاپەڕەی خۆی قەمچ کرد.. پیاوێکی ستەمکار و بەهێزترین دەسەلاتی سەر زەوی پێشکەیەك کوشتی. دەڵێن کاسە کە پڕبوو، لێی دەڕژێت.

*******

وا تێنەگەی ئەم بەسەرهاتە حیکایەتێکی ئەفسانەیی بێت، بەڵکو ئەوە ڕاستییە. ئەگەرچی داستانێکی مێژووییە، بەلآم.. نە فیلمێکی لەسەر تۆمار کراوە، نە ڕۆمانێکیشی لەسەر نووسراوە، ڕوون و ئاشکرا مەبەست لە شاردنەوەیەتی. نەمرود ناوی لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتووە، بەتایبەت کتێبە عەرەبی و جیهانییەکان، بەسەرهاتەکەشی ڕوون و ئاشکرایە. هەر مێژووە لەهەمان سەردەمی قەڵەمڕەوی (نەمرود)دا باسیان لە پیاوێکی تر بەناوی (زوحاك)ەوە کردووە، کتێبە عەرەبییەکان بە (زاهاك) ناویان بردووە. هەندێك لەو کتێبە مێژوویانەی زۆرتر باوەڕ پێکراون، هەردوو کەسایەتییەکە بۆ یەك کەس دەبەنەوە. هەر کتێبە مێژووییەکانە بەسەرهاتی کەسی سێیەم دەخەنە ڕوو، کە لەهەمان سەردەم حوکمی دنیای کردووە و یەکەم ساحیریش بووە لە مێژووی بنیادەمدا، ئەویش بەناوی(زۆرۆستەر)ەوە. جارێکی تر کتێبە مێژوویییە باوەڕ پێکراوەکان هەردوو کەسایەتی (زۆرۆستەر) و (نەمرود) بۆ یەك کەسایەتی دەگێڕنەوە. تا بەتەواوی لە حیکایەتەکە حاڵی بیت، پێویستە ژیاننامەی هەر سێ کەسایەتییەکە بخوێنیتەوە. نەمرود و زوحاك و زۆرۆستەر، تا بەو ڕاستییە دەگەیت کە هەر سێ کەسایەتییەکە هەر یەك کەسایەتین، دواتر ئەم ژیاننامانەی هاوشێوەن و لەیەك سەردەمدا بوون، ببەستینەوە بەو دوو بەسەرهاتەی لە تەورات و قورئانیشدا هاتوون، ئەوجا بەسەرهاتەکەت بەتەواوی بۆ دەردەکەوێت، تا ئەم گەڕان و توێژینەوەیەش نەکەیت، کارەکەم بۆت ئاسان کردووە.

نەمرود.. ناوی بەشێوەی جیاواز لە کتێبەکانی تردا هاتووە، وەك (مین) و (مینۆس) و (نینۆس) و (نینیب) و ( ماردۆش) و (ماردۆخ) و (ئەزدەهاك) و (یۆراسیب). هۆکاری ئەم هەموو ناوانەش دەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتییە

## ئەنتیخریستۆس

ئەفسانەییەکەی لە لای فارس و کورد و ئەفغان و هیند و تورک و عەرەب، ناوەکە بەپێی سەردەم و زمان و شارستانییەت گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە، تەنانەت داستانێکی ئێرانی مەزنیش بەناوی(شانامە)ی بۆ هەڵبەستراوە.

پەیکەری کاوەی ئاسنگەر تا هەنووکەش لە ئەسفەهاندا هەر ماوە، ئەو ئەشکەوتەی (زوحاك)یشی تیا بەندکرا، لە چیای دەماوەند هێشتا ماوە و شوێنەکەشی دیارە. ئێرانییەکان تا ئەمڕۆش بە بۆنەی کوشتنی پاشای ستەمکار، ساڵانە ئاهەنگ دەگێڕن، بەتایبەت لە جەژنی نەورۆزدا. قوللەی بابل کە بەرزییەکەی لەسەرووی هەورەکانەوە بوو، وێران کرا، تەنانەت شوێنەواریشی نەماوە، بۆیە لەنێو حەوت سەیروسەمەری دنیادا ناوی نەهاتووە.

سەمیرامیس.. ئەو ئافرەتە شۆخ و شەنگە، ئەو ئافرەتەی مەشخەڵی ئاگری لە پەیکەری ئازادیدا بەدەستەوەیە، هەرهەمان ئافرەتە بە مەشخەڵی ئاگرەوە وەك دروشمێك بۆ کۆمپانیای (Columbia pictuers) بۆ فیلمسازی دەردەکەوێت.

دوای مردنی نەمرود، بە پێنج ساڵ سەمیرامیس زیندانی کرا. پەرستگایەکی فرە مەزنی بە زێڕ بۆ مێردەکەی بینا کرد و ڕازاندییەوە، باخچەی ئاوێزانی بابلی درووست کرد، کە دووهەم سەیروسەمەرەکانی دنیایە.

مرۆڤ بەو شێوەیە بۆ یەکەمجار فێری سیحر بوو، نەمرود لەسەر دەستی ئەوانەی ناویان بە(ماجی) هاتووە بەمانای سیحربازەکان، لەوانەش وشەی(ماجیك) لەزمانی ئینگلیزیدا بەمانای سیحر دێت.

وابزانم گەمەکەت پێخۆشە، بەر دڵ دەگرێت، جارێ هەر لەسەرەتاین. کۆمەڵەی دووهەمیش شەش کارتە، ڕێم بدە بەر لەوەی پەرۆشیت کاڵ بێتەوە بۆتی ئاشکرا بکەم:

**کارتی یەکەم..** کارتی ڕوحە سووتاوەکانە، وێنەی کەللەسەری ئەهریمەنی لەناو ئاوردا بەسەرەوەیە.

**کارتی دووەم..** کارتی ئاگرە، هەر لەوەی پێشوو دەچێت، وێنەی کەللە سەرێکی سووتاوی لەنێو ئاگردا بەسەرەوەیە.

**کارتی سێیەم..** کارتی ساحیرێکە، وێنەی ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی سیحربازی بەسەرەوەیە.

**کارتی چوارەم..** کارتی فریشتەکانە، وەك سونبولێك بۆ پاکی فریشتەکان وێنەی پەڕەمووچێکی سپیی بەسەرەوەیە.

**کارتی پێنجەم..** کارتی بە ساختەکردنی پەرجووانە، وێنەیەکی ڕەش و سپی بەسەرەوەیە و دیار نییە کەچییە.

**دواکارت..** کارتی نوشتەی دەمبەستە، وێنەی ساحیریکی نامۆی بەسەرەوەیە.

ئەوا بە شێوازێکی ڕێك و پێك و دروست ڕیزمان کردن، ما نهێنی دووەم، سەرگوزشتەی دووەم بخەینە ڕوو.

********

# هۆ ئینانا.. وەرەخواری

## ١٩٠٠ پێش زایین

بەپەرۆشەوە لەجەستە نیمچە ڕووتەکەی دەڕوانی، ئەویش بەوپەڕی خۆبەدەستدانەوە لەسەر جێوبانەکەی، کە چەرچەفێکی سووری پیادرابوو، ڕاکشا. لەدەوروبەر جێوبانەکەییەوە ڕووناکییەکی کزۆڵەی سوور بەهۆی مۆمە هەڵکراوەکانەوە شەوقی دەدایەوە و دۆخێکی ڕۆمانسی و چێژبەخشی بەو کەشە دابوو. هێدی هێدی لە جەستە نەرمونۆڵەکەی نزیکبووەوە، تا بۆن و بەرامەی بە کەپووی گەیشت، بەحەسرەتەوە ئەو بۆنەی هەڵمژی، کە زەوقی ورووژاندبوو. بلەز دەستی بۆ قژی برد و بە حەزمەتەوە چنگی لێ گیرکرد، تا هێزی تیابوو گوشییە خۆی، ئەوجا دەمی لە دەمی نا، وەك ئەوەی کلۆکۆی خۆی پێدامرکێنێتەوە.

دەموچاوی لە ڕوخساری نزیك کردەوە، هەناسەی گەرموگوڕی هەڵمژی، لەنزیکەوە لەو لێوانەی ڕوانی کە چ گەوهەرێکە بە باوەشییەوە ڕسکاوە، چون حەزمەتی پیاوێکی گڕ گرتوو ئەو لێوە ئاودامانەی بۆ مژی، ئەویش

چون ئافرەتێکی پەرێشان بۆ پیاو تا بینێتە بان خۆی، بۆی پاڵکەوت. نیگای لەچاوەکانی بڕی.. ئەم شۆخ و شەنگە لەکوێی دەڕوانی هەر نەشمیلە تا سەرمەستبوون حەسرەتەکانی بە لێو مژینی کوێر کردەوە، ئەوجا ڕوومەتەکانی، ئەو چاوە جوانانەی یەك بە دووی یەکدا ماچ دەکرد.

ئەو کامێرایەی ئەم دیمەنانەت بۆ دەگرێت، زۆر لەنزیکەوە و بۆ مەبەست گرتەیان دەکات. جارێ دەبینی لێوەکانی دەمژێت، جارێکی تر لەنزیکترەوە گرتەی ئەو چاوە جوانانە دەگرێت، کە سیحریان پیاو وڕو کاس دەکات. بەدەور سەریدا دەخوولێتەوە، تا لەپشتەوە وێنەیەکی پشتەوەی بگرێت.. پرچێکی درێژی ڕەش و قەترانی هەس. دووبارە چنگی لێ گیر دەکات، بەڕامووسینی لێویدا دادێتەوە.

کامێراکە سووك سووك بەرەو خوار دادەگەڕێت، بۆ خستنە ڕووی پشتی ئەو جەستە ڕووتەی هەراسانی کردووە. ما کامێراکە بەرەو خوارتر داگەڕێت. لێل[1] بەرەو خوار بوونەوەی کامێراکە ترپەی دڵی خێراتر دەبوو، بۆ ئەو جێگایەی مەبەستی بوو، ئاوێك بە ئاورەکەی ناخیدا بکات. چاوەکانی کراوەتر دەبوون. ئەبڵەقبوونی چاوەکانیشی بۆ چێژ و هەوەسبازی نەبوو، زیاتر لەترساندا بوو. هەر کە کامێراکە گەیشتە کۆتایی پرچەکەی، ڕووت و قووت دەرکەوت، کە بەلایەوە نەدەبوو وابێت، بەڵکو هەر هیچی نەبینی، تەنها عەبای سەرشانی پیاوەکە نەبێت، ئەوجا کامێراکە چون گاڵتەی پێ بێت دوور کەوتەوە، تا دیمەنەکە بەتەواوی دەربکەوێت. دیمەنی پیاوێك کە پرچە سەری ئافرەتێکی گرتووە و بە پەرۆشییەوە لێوەکانی ڕادەمووسێت.

---

[1] لەگەڵ

هەر کە تووڕی دەداتە سەر جێوبانەکە، ئاوازێکی ڕۆمانسیانەی جوانی بۆ ئەو گاڵتەجاڕییەی بە گرتەکەوە لکاند.

پیاوەکە کە کڵوکۆی دامرکایەوە، کەمێك ڕووی لە ڕووخساری دوورخستەوە، بەجوانی لەکەللە سەربڕاوەکەی ڕوانی، دواتر بەهێز کەللە شۆخ و شەنگەکەی توور دا، بەر دیوارەکە کەوت و ئەوجا لەسەر زەوییەکە جێگیر بوو. لە دیوارەکەوە تا شوێنی کەللەسەرەکە بە خوێن نەخشرا. بێ ئەوەی گوێ بە خوێنە پەرش و بڵاوەکە بدات، لە جێوبانەکەش دوور کەوتەوە، ئەو ناوە کە بە مەڕمەڕ ڕووپۆش کرابوو، بەخوێنەکە لەوتا.

جارێکی دی بەخێر بێی، بۆ بابل، خاکی نەفرەتلێکراو. ئێمە لەسەردەمێکی دوای (نەمرود)داین. لێنەگەڕێی دیمەنەکانی پێشووتر تووشی شۆکت بکەن، خەمیش لەو شۆخ و شەنگە مەخۆ، ئەوە (ئینانا)یە، کە لە ئەرز و ئاسمان نەفرەتلێکراوە، سەریشت لەو پیاوە سوڕنەمێنێ کە عەبایەکی بەسەر شانەوەیە. ئەوە (هازارد)ە. هازارد.. بەهێزترین ساحیری (بابل)بوو لەو سەردەمەدا. بەر لەوەی کۆتایی بەدیمەنی یەکەم بێنین، پێویستە زانیارییەك هەیە بیزانیت.. ئەم ساحیرە بە(مانزازۆ) ناوزەد دەکرا. مانزازۆ.. لە بابلی کۆندا واتە (نکرۆمانسەر)، نکرۆمانسەر واتە...

با لە دیمەنەکە بەردەوام بین و زیاتر لێی تێبگەین.

پیاوەکە لەنێو بازنەکاندا وێستا، عەبایەکی درێژی سووری خەتخەتی ڕەشی پان و پۆڕی لەبەردایە، تەپلەیەکی کلکداری قەشەی بەسەرەوە، ما بەدەنگی مەقام بێژێك جادوو بخوێنێتەوە، جاریێ دەنگی لێ بەرز دەکرد و جارێکی تر دەنگی لێ نەوی دەکرد، دواتر لەبازنەکان هاتە دەرەوە و ڕووەو

کەللە نەفرەتلێکراوەکە ڕۆیشت و لە پرچە سەرە جوانەکەی گرت، هەر بەسەر زەوییە مەرمەڕییەکەو لەتەکیدا خەریکی شتێکی سەیربوو.

هەر بەسەر زەوییەکەوە کەللەسەرەکەی بە ئاڕاستەی جیا جیادا دەجوولاندەوە. هەڵبەتە ئەو پیاوە دەزانێت چی دەکات؟ یا تەواو لەکارەکەی حاڵی نییە بۆچی وادەکات. ئەو پیاوە خەریکی نووسینەوە بوو، قەڵەمەکەی کەللەسەری ئینانا بوو، مەرەکەبەکەشی خوێنەکەی. بێشک لە وشەیەکیش چییە حاڵی نابێت، کە چی نووسیوە، لەبەر ئەوەی بەزمانێکی کۆنی بابلی دەینووسی. پیتەکانی ئەم زمانە ترسناکە. ما بە دەنگێکی پچڕ پچڕی لەرزۆکەوە ئەو جادووەی ساحیرەکان پێی ئاشنان، بخوێنێتەوە.

- ئیتیمۆ.. ئیتیمۆ، ئینانا لە فەلەکی بازنەیی نەفرەتلێکراوت وەرە خوارێ، ئەی ئەو کەسەی بۆ لێوەکانت پیاوانی باڵا بەرز بۆی دادەچەمێنەوە، ئەی ئەو کەسەی بەیەك تەماشا لەچاوانتەوە غروری کەسانێکت نەهێشتووە!

بەدەوری بازنەکاندا شتێك لەجادووی وتەوە، تا ئاگرێکی داگیرساند، هەر ئەوەش نا، تا وای مەزەندە کرد، کەللەسەری ئەهریمەنەکان دەبینێت، کەللەسەرگەلێك ئاوری لێ بەرزەوە دەبوو. لەنێو کەللەسەری شەیتانەکانەوە، کەللەسەرێك دەرکەوت، دواتر ون بوو، دووبارە دەرکەوتەوە، کەللەسەری ئینانا بوو، یا وای بەخەیاڵا دەهات. هەڵبەت ئەم پیاوە دڵێکی بەجەرگی هەیە. پیاو بۆ خوا بڵێت.. کەللەسەری ئەهریمەنەکان زۆر ترسناکن، کە لەنێویانەوە کەللەسەری ئینانای شۆخ وشەنگ ڕسکا، ئەو جوانییەی لەدەستدا، ئەوجا ئاگرەکە کوژایەوە، تا لەشوێنێکی تر بە

گڕگرتـوویی دەرکەوتـەوە. لـە کەللەسـەری ڕاسـتەقینەی ئینانـا کـە لەسـەر زەوییەکە تووڕ درابوو، ئاورەکە پێبووەوە.

ئەمـە ئـاگر نـەبوو، کۆمـەڵێك خـەیاڵ بـوون بـە بەرچـاوی(هازارد)ەوە ڕسکان. پێدەچوو ئەوەی دەیگێڕا سـەرکەوتوو بـوو تێیـدا. ئـەوەی هەرچـی جوانییە لەژناندا لـەخۆ گرتبـوو (ئینانـا)بوو. ڕۆمانـەکانیش بـە (ئـەفرۆدیت) باسـیان لێـوە کـردووە، یانـەخۆ ئـەوەی عەرەبـەکان بـەناوی(لات)ەوە دەیانپەرست، بابلییەکان بە(عەشـتار) ناوزەدیـان دەکـرد، وەك خوداوەنـدی جوانی هات، بە جوانترین پۆشاك و خشڵ و زێڕەوە هات، وەك تریشقە هات، ئەو ناوە تاریکەی ڕۆشنا کردەوە. هـازارد.. بەرامبـەر بـەو جوانییـە تووشـی شۆك بوو. دانی بەخۆیدا گرت و گوتی:

" ئینانا.. ئەی شازادەی جوانی، هـەواڵی هـەردوو سـاحیر (عـەزازیل) و (شـەهمازی)م پـێ ڕابگەیێنـە. باسـی ئـەو سـەفەرە بەختەوەرییـەم بـۆ بکـە. ئینانا.. چیت لەدڵدایە بۆمی باس بکە"

ڤینـۆس بەچـاوە باشـقاڵییە جوانەکەیـەوە لێـی ڕوانـی، چـون ئـەوەی شۆخی پێبکات، گوتی:

- هازارد.. ئەوانە ساحیر نەبوون، ئـەو ناوێلـەش نـاوی ئـەوان نـەبوو، بەڵکو یەکێکیان ناوی (هارووت)ە و ئەوی تریشیان (ماروت) سەفەرەکەشم بەختەوەر نەبوو، بەڵکو نەفرەتکراو بوو.

هازارد.. چون ئەوەی بەقسەکانی تێکچێت، گوتی:

- ئەی شازادەی شۆخ و شەنگ، هەرچیت بینیوە، وەکو خۆی بۆمی بگێڕەوە.

ڤینۆسی شازادە و خودای جوانی، بەو خەسڵەتەی شازادەیی جوانان بۆ ناوەندی بازنەکانی سەر زەوی ڕۆیشت، کەمێك کراسەکەشی بۆ هەڵبڕی، لە ناوەندی بازنەکان دانیشت و دەستی بە گێڕانەوە کرد.

ڤینۆس گوتی:

- وەك نوێنەری جادووگەرانی (ئۆرۆك) بۆ بابل نێردرام، بۆ خۆتیش مەزنیی شاری (ئۆرۆك) لەمەڕ جادووگەرییەوە دەزانیت. یەکەمجارم بوو لەشارە خۆشەویستەکەم(ئۆرۆك) دەربچم و دوور بکەومەوە، بەڕاستی دواجاریشم دەبێت. بەسەرهاتەکە وابوو.. گەورەی جادووگەرانی ئۆرۆك هەواڵێکی وێدام، کە دوو جادووگەر لەشاری (بابل)دا هەن، بەسەر جادووگەرانی ئەو شارەدا جادوویان لەگەورە و بچووك خستبووە ژێر دەسەلاتی خۆیان، یەکێکیان بەناوی (عەزازیل) و ئەوی دیشیان بەناوی (شەهمازی)یەوە، وتیان ئەم دوو جادووگەرە خەڵکی فێری جادوو دەکەن، بەو مەرجەی داوایان لێدەکردن، کە فێری جادوو کردن بوون، لەنێو خەڵکیدا بڵاوی بکەنەوە، وایان حاڵی کردم. کارەکە کە پێیان سپاردم بۆ ئەوەبوو لێیانەوە فێری ئەو جادووگەرییە بم کە خەڵکیان فێر دەکرد و ئەوەشی کە لەخەڵکیان دەشاردەوە. خۆتانیش چاك دەزانن کەس لە سکی دایکییەوە نەبووە بە پاشا، یان جادووگەر، کەسیش نەبووە لە گەنج و پیر لەبەر سیحری جوانیمدا خۆی ڕاگرتبێت، سیحری مێینەکەم، بەکورتی، هەر من

بووم بۆ ئەو کارە شایەستە بم، منیش هەرچی زانیارییەك بوو لەخۆمم گرت، تا بە جادووگەرانی (ئۆرۆك)ی بگەیێنم.

گرفتەکە لەوەدوابوو جادووی ئەو دوو جادووگەرە، جادووی هەموو جادووگەرانی (بابل)ی کوێر کردبووەوە. ئەمە هەواڵێکی سەرسوڕێنەر بوو بەلامەوە، دەمزانی لە بابل جۆری جادوویان زۆربوو، تەنانەت باشترین جادووگەری(ئۆرۆك)یش لێیان حاڵی نەدەبوو، نەیاندەتوانی کۆدەکانی بکەنەوە، وەك جادووی تابلۆ، ئەو تابلۆیەی وێنەی ڕووبارەکانی بابلی تیدا نەخشرابوو، خۆ ئەگەر خەڵکی بەگژیاندا چووبان، لەهەر بابەتێکی جادوویی، ئەوا دەرزییەکیان لە یەکێ لە ڕووبارەکانی تابلۆکە دادەنا، ئەگەر وایانکردبا، ئەوا ڕووبارەکانیان لە ئاو کوێر دەکردەوە. جادووی ئافرەت.. هەچ کەسێك خۆشەویستێکی ون بوایە، پەنای بۆ جادووگەرەکانی بابل دەبرد، چیشی داوا کردبا وێیان دەدا، تا ڕێیان وێدەدا لە ئاوێنەکەیانەوە چاوی بە ونبووەکەی بکەوێت، لە کوێیەو و لە چ بارودۆخێکدایە. گرفتە سەرەکییەکە، جادووی ئەم دوو جادووگەرە، گشت ئەو جادووانەی لەناو دەبرد و زیاتریش.

چەند جوان و دڵگیرە بابل، بەدەر لەو کارەی پێی ڕاسپێرابووم و پەرۆشی نەبووم، لێ بۆ بینینی تاوەر[1] بابل و باخچە ئاوێزانەکەی خۆشحاڵبووم بەو چوونەم. تاوەر و باخچەکەش کەس بۆی نەبوو، بچێتە ناوی، تەنها پاشا و خانەوادەکەی نەبێت، لێ بەخۆت بەسەرهاتی من چاك دەزانیت لەتەك پاشاکان دا، بیریشت ماوە دوایین پاشا کە سەردانیم کرد، چۆن واملێکرد لەبەر پێم بکەوێت، سوور دەمزانی ئەو دوو جادووگەرەش

[1] برج

لەبەر پێم دەکەون و دان بە هەموو نهێنییەك دێنن، هەرچیش لە منداڵییەوە فێری بوون، وەك هێلکەی پاککراوە دەینێنە مستم.

هەر کە کەوتمە پرسیار کردن لە (عەزازیل) و (شەمهازی)، گوێم لەهەندێ قسەی سەیر بوو، پێیان گوتم.. لە ئەشکەوتێکی چیاکانی دەوروبەری (بابل)دان، بەو ڕۆژگارە خەڵکی بۆ فێربوونی جادووگەری هاموشۆیان دەکەن، ئەوانەش کە ڕووی لێدەنان، تاقیکردنەوەیەکی سەیریان بۆ دەکردن، ئەگەر لەو تاقیکردنەوەیە شکستی هێنا، قاو دەدرێت، خۆ ئەگەر سەرکەوتوو بوو، ڕێی وێدەدەن بچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە و تا یەك ساڵی ڕەبەق لەو ئەشکەوتە بۆی نییە بچێتە دەرەوە، هەر کە ئەو ماوەیە تەواو دەکات و دێتە دەرەوە، ئەودەم لەبارەی هونەری جادووگەریی ئەوەندە بەرز دەبێتەوە، کەهیچ جادووگەرێکی بابل و دەوروبەری لەهەقی نایەن، هیچ جادووگەرێکیش ناتوانێت شۆخیی پێبکات، تەنانەت خەڵکەکش زاتی ئەوە ناکەن دەمە دەمی لەتەکدا بکەن.

دەرکەی ئەشکەوتەکە ساڵی یەك ڕۆژ دەکرایەوە، هەموو ڕۆژەکانی ساڵ کڵۆم دەدرا بەهیچ پالەوانێکیش نەدەکرایەوە. ئەو ڕۆژە زۆر نزیکبوو، ئەوەش بەختی من بوو. شوانێك بەبان ئەسپەکەیەوە و لە پشتی خۆیدا سواری کردم و بەرەو ئەشکەوتەکەی بردم، ئەوەش لەبەر جوانییەکەم بوو، هاویشتمیە سەر پشتی ئەسپەکەی.

- ئەی شازادەی شۆخ و شەنگ، ئەوا گەیشتین، ئەوە ئەشکەوتەکەیە، نازانم شاژنێك بەو هەموو سیحرەیەوە چ پێویستی بەوەیە فێری جادووگەری بێت.

- کاکەی شوان.. تۆ لەوە گەڕێ، لێرە چاوەڕوانم بە ئەگەر زوو نەهاتمەوە لات، تۆ بۆ ناو ماڵ و منداڵت بگەڕێوە.

- شازادەی نەشمیل.. دەتوانم هەموو تەمەنم لێرە چاوەڕوانت بم، دوای بینینی ئەم جوانییەت، ماڵ و منداڵی چی، هەر بۆ گۆڕستان باشترە چوونم.

شوانەکە مافی خۆی بوو، لەوەش زیاتر بڵێت، خودی(ڤینۆس)، هەڵگرتبوو! با لەوەش گەڕێین. دیمەنی ئەشکەوتەکە لەوە نەدەچوو بەو ئاوایە بێت کە وەسفیان دەکرد، تەنها کونێك بوو لەچیاکەو بەس، مەردوومێکی زۆر لە ژن و پیاو لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا ڕیزیان بەستبوو، منیش لێلیاندا وێستام، تا هەردوو جادووگەرەکە بەدەرکەوتن، خۆزیا نەمدیبان.

هەوەڵجارم بوو مرۆڤی لەخۆم جوانتر و سیحراویتر ببینم. دوو ئافرەت نا وەلێ دوو پیاو، ئافرەت لەبەریان خۆی بۆ ڕاناگیرێت. بۆ یەکەمجار دڵم بە ڕاستی کەوتە کوتە کوت. کەی پیاوی واجوتن هەبووە، بەسەر سیحری جوانییەکەمدا زاڵ بوو، دەبوو من لەبەر پێیان بکەوم... پێدەچێت ئەو کارەی بۆی هاتووم، بەر لەتاقیکردنەوەکە شکست بێنم، ئاخر بینینی ئەو جوانییەیان هەموو شتێکی لەبیر بردمەوە، کە بۆچی هاتووم.

لەتەك هەردوو جادووگەرە قۆزەکە چوومە ئەشکەوتەکەوە، ئەوەی لەناو ئەشکەوتەکە بینیم، دەمیان پێ داچەقاندم، چۆن بتوانم وەسفی شتێکی لەو بابەتە بکەم. سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانم و ئەوەی بینیومە وەك خۆی بۆتی بگێڕمەوە.. پێویستە هەموو ئەو وێنایەی لەمەڕ بەرتەسکیی

ناوەوەی ئەشکەوتەکەدایە، وەك چۆن لە ئەشکەوتی ئاساییدا هەیە، لەبیر خۆت بەریتەوە. ناو ئەشکەوتەکە هەر وەك کۆشك پان و بەرینە، بنمیچەکەی وەك ناو کۆشکەکان بەرزە، ڕووبارێکی پێدا ڕەت دەبێت، ئەوسەری دیار نییە، ئاوێکی سازگار و خۆشی هەیە، دیوارەکانی وەك ئەو لادیوارانەی لای خۆمان نین، ساف و لووسن، پڕە لە درزی بچووك بچووك، لەدوور ڕا وەك دیوارێکی نەخشێنراو دەردەکەوت. ئەمە یەکەم دیمەنم بوو کە چاوم پێکەوت.

دوو پیاوە جادووگەرەکە ڕێنماییان بۆ لای ڕووبارەکە کردم، داواکارییەکی سەیریان هەبوو، دیاربوو ئەوە تاقیکردنەوەکە بووبێت، کە باسیان لێدەکرد. داوایان لێکردین یەك یەك سێ جاران تف ڕۆ کەینە ڕووبارەکە، گوتیشیان ئەوە تاقیکردنەوەیەکی بچووکە، جادووگەر لە خەڵکی ئاسایی جیادەکاتەوە. لەڕیزەکە سێیەم کەس بووم. یەکەم کەس کە نێرینە بوو،، هەوەڵ تفی ڕۆ کردە ڕووبارەکە، چاوم لەڕووبارەکە بڕی، تا شتێك لە کاردانەوەی تف ڕۆ کردنەکە ببینم. خاڵێکی شین بەسەر ئاوەکەوە دەرکەوت، لێل[1] ڕووبارەکە دەڕۆیشت، ئەوجا لە هەر دووجارەکەی تری تف ڕۆ کردنەکە، هەمان خاڵی شین دەرکەوت, یەك لەو دوو جادووگەرە لێی نزیك بووەوە، داوای لە پیاوەکانیان کرد، ببەنە لای بەردێك، ناوەکەیم بیر نەماوە.

---

[1] لەگەڵ.

ئەوجا نۆرەی کەسی دووەم بوو، تفەکانی ڕۆ کردە ڕووبارەکە، ئەمجارە لەبری خاڵی شین، خاڵی سوورم بینی. یەك لە جادووگەرەکان بەسەرزەنشتەوە پێی گوت:

- ئێرە شوێنی کەسانێك نییە، لەشوێنی ترەوە فێری سیحر بووبن.

پاسەوانەکان پەلکێشیان کردە دەرەوەی ئەشکەوتەکە. نۆبەتی من هات، لەتاقیکردنەوەکە حاڵی بووم، بە باوەڕ بەخۆبوونەوە زەردەخەنەیەکم بۆ کرد، ئاخر من جادوو لەهیچ شوێنێك فێر نەبووم. سێ تفانم ڕۆ کردە ئاوەکەوە، هەرسێ خاڵە شینەکەم بەسەر ئاوەکەوە بینی، پیاوەکان بەرەو ئەو بەردە بردمیان، کە ناوەکەیم لەبیرچووەتەوە.

بەردێکی زەبەلاح لەناوەندی ڕووبارەکە بوو، درزێکی زۆری وردی تیا بوو، لە لای سەرەوەی بەردەکە ڕستەیەك بەزمانی بابلی نووسرابوو، ڕستەکە دەڵێت" هەرکەسێك دووزمانی بکات لە ئێمە نییە، ئەو کەسەش بەدەم ئێمەوە قسە بگێڕێتەوە ئەوا کفری کردووە" وەك هیچ حاڵی نەبووم، درێژەشم پێنەدا. ئەوەی مایەی سەرنج ڕاکێشان بوو، ژوورێلێکی[1] نەخشێنراوی تێدابوو، وامهەست دەکرد، ئەوە ئەشکەوت نەبێت، مەزەندەی سروشتی لادێیەکەم لا ڕسکا. بە زانیارییەکی تر ئاشنا بووم، چۆن بەو گێلییەی خۆم نەزانیوە، کە تا ساڵێك لەو ئەشکەوتە نەچمە دەرەوە، کە دەرگای ئەشکەوتەکە کلۆم دەدرێت، ئەی لەو ماوەی ساڵەدا چی دەخۆین؟

---

[1] چەند ژوورێکی.

ئەوەی دەمانخوارد، شتگەلێکی وشککراوە بوون، وەك مێوژ و گوێز و بادەم، کە بۆ ئەو ساڵە لە ئەشکەوتەکە کۆ دەکرانەوە، ئەشکەوتەکە کانیاوی تێدابوو بۆ ئاو خواردنەوە. ئیدی تەواو لەبارو دۆخی ناو ئەشکەوتەکە حاڵی بووم، کە چۆن بەڕێوە دەچێت. ما لە کارەکەی خۆم تێبگەم، چونکە گشت ئەو شتانەم لەخەیاڵدا نەبوو. دواتر هەردوو جادووگەرەکە بۆ ساتێك منیان بینی. من دەزانم پیاوان لەبەر جوانییەکەم نیگام دەکەن و چۆن لەتەك قسەکردنمدا دەپەشۆکێن، وەلێ ئەم دووانە وەك لادیوارێك نیگایان تێبڕیم، چون ئەوەی هیچ کاریگەرییەکم بەسەریانەوە نەبێت. نا.. هیچ پیاوێك نییە و نەبووە بەرامبەر جوانی ڤینۆس بتوانێت خۆی ڕابگرێت!

هەموو ڕۆژێك لەناو ئەو ئەشکەوتەدا کە بەسەرمدا تێدەپەڕی، هەستم بە خەتەرناکیی ئەو کارە دەکرد، کە پێم سپێردرابوو، تێگەیشتم جادووگەرەکان ئێمەیان بۆ خزمەتی خۆیان بەکار دەهێنا. هازارد.. ئەوان لە هیچ و پووچ بەولاوە هیچی تر نین، ئاژەڵەکان گەلێ لەوان باشترن، لە ئێوەش حاڵی بووم توانایەکی واتان نییە ، لە توانا شەیتانییەکەتان بەولاوە، ئەوانەی خۆتان لەبەریاندا سووك و چرووك کرد، لەئەشکەوتەکە توانا ڕاستەقینەکەیان فێربووم. لەوەش تێگەیشتم ئەو حەوت ئەستێرە و مانگ و خۆرەکەش کە دەیانویست لێیان نزیك بینەوە و بیانپەرستین، ئەو تەنانەی بە ئاسمانەوە ئاوێزان بوون. خودایەکیان هەیە، خودای ئیبراهیم. نووکە[1] تێگەیشتم ئەوەی ئێوەش دەیکەن وەهمە، ئەوەشم بۆ ڕوون بووەوە کە

---

[1] ئێستا.

جادووگەرەکان بێهێزترین بوونەوەرن، ئەهریمەنەکانیش هەروەها. تێگەیشتم بۆچی هەر جادوویەکی جادووگەرێك ، جادوویەکی تر هەیە پووچەڵی بکاتەوە. تێگەیشتم ناوی (عەزازیل) و (شەمهازی) ناوێلی ترسناکن، جادووگەرەکان ناویانەتە پاڵ ئەو دوو کوڕە قۆزە، ئەوان ناوی جوانتریان هەبوو، یەکێکیان (هاڕووت) ئەوی تریان(ماڕووت)بوو.

" کەسیان فێر نەدەکرد، تا نەیانگوتبا ئێمە فیتنەین، کفر مەکە"

وەلێ ئەو دوو جادووگەرە نە کەسیان بە پاشا یان دەسەلاتدار دەکرد، نەزێڕ و زیویشیان دەبەخشی، ئەوەی لەسەر دەستیان فێر دەبوو، تەنها لە جادووی گەورەترین جادووگەر پارێزراو دەبوو, بەهۆی ئەوەی ڕاستییان دەزانی. بۆ خۆیشم بڕیارمدا هەردووکیان کۆ بکەمەوە، ڕاستییەکە بزانم، تا جادووگەر دەسەلاتی بەسەرما نەبێت، زێڕ و زیویش لەبەر بکەم، ئەوەش نەدەبوو تا لەکارەکەم دەبمەوە و دەگەڕێمەوە، بۆ لای جادووگەرانی(ئۆرۆك)، بەو مەرجەی ببم بە شازادە. هازارد" هەموو ئەو جادووگەرانە دەبێت لەژێر دەستی مندا بن، هەرچی پاشاش هەیە کە جادووگەرەکان دەیانبەن بە ڕێوە، لەژێر پێمدا بکەون.

بە(زوهرە) ناودێرم بکەن، چونکە جوانییەکەم لەنێو جوانی ئافرتاندا، وەك جوانی زوهرە وایە لەنێو حەوت ئەستێرەکان. (هاڕووت) و (ماڕووت) یش وەك پیاوان هەوەسبازییان هەیە. ئەی(هازارد).. شەوێ لەناو ئەشکەوتەکە هەر هەموو نووستبوون، لەژوورە نەخشێنراوەکەم بە کراسێکی دوو تلّیشی ئاودامان هاتمە دەرەوە، زۆر لە جەستەمی دەرخستبوو، کەمی لێوەشاردبوومەوە. ڤینۆس هات، شازادەی حەوت ئەستێران هات.

لە ئەشکەوتەکە و بە سیلەی ڕووبارەکەوە ڕۆیشتم، کە دەبوو بمگەیێنێتە ژووری جادووگەرەکان، ئەوە یەکەمجارم نەبوو ئەو ژوورەم دیتبێت. بەهەرحاڵ، نۆ مانگم بەڕێخستبوو، لە شوێنیان نزیکبوومەوە، ئا.. ئەوە یەکەمجارم بوو بە تەنێ لە ئەشکەوتەکە بگەڕێم، بە دیوارەکانەوە مەشخەڵێکی زۆری ئاگر هەڵواسرابوو، نەماندەزانی شەوە یا ڕۆژ. بەو کراسە ئاودامانەمەوە لە ڕۆیشتن بە لێواری ڕووبارەکەوە بەردەوام بووم، هەرکە گەیشتمە ژوورەکەیان، گوێم لە جادوو بوو، دەنگێکی خۆش، نەمزانی ئەو دوو پیاوە چی دەچرن، چ زمانێکە پێی دەدوێن، گورم بەخۆم داو چوومە ژوورەوە.

" ئاخۆ لە شەرعی ئێوەدا حەرامە بنیادەم لێڵتاندا زاوزێ بکات"

دیقەتێکی سەیریان دام.. ئەی خودایە پێ ناچێت بمناسنەوە، دواتر لەبەرامبەریاندا ڕووت و قووت، هەر وەك چۆن لەدایکم بەربووم کراسەکەم داکەند. گوتم دەمەوێ شتێکتان لێ بستێنم، کە پێشتر بنیادەم لێتانی نەستاندووە. تەماشای روخساریان کردم، تەنها روخسارم، دواتر (هارووت) بەهێمنییەوە گوتی:

- ئەگەر جێمانبهێڵیت بۆ خۆت باشترە، نەوەك خوداوەندەکەمان نەفرەتت لێبکات.

(مارووت)یش هەڵیدا و گوتی:

- بگەڕێوە بۆ (ئۆرۆك) شاری فورات، کفر مەکە، وەك قەومەکەت، کردیان.

بەتووڕەییەوە گوتم:

- ئەوا بە ئێوەوە کفرم کرد، بەخواکەشتان، ئێوە چ بنیادەمێکن، ئێوە ئەهریمەنن، زەوی گۆڕاوە، ئەو زەوییەی جاران نییە. بۆ یەکەمجار دوای ئەو ماوەیەی ناو ئەشکەوتەکە، ئاسمانم دیت. نە ئەشکەوتەکە ما، نە درز و کەلێنەکان، نەیش هاڕووت و ماڕووتیش. ئەوە چ جادوویەکی مەزنە، نا ئەوە جادوو نییە پەڕجووە[1]. بەرەو بابل غارمدا، تەنها ئەو کراسەی لەدوو لاوە تلّیشابوو، لەبەرمدابوو، کەزۆری لە جەستەم دەردەخست و کەمی لێ دەشاردەوە.

- هازارد بە تووڕەییەوە گوتی:

- – نەتتوانی دان بەخۆتا بگریت و ساڵەکە تەواو بکەیت؟

ڤینۆس لەسەر زەوییەکە ڕاستەوەبوو، نیگایەکی مەکراویانەی ژنانەی بۆ کرد.

- ئەو هەرچی و پەرچییانەش وەك جادووگەرانی ئۆرۆك لە هەموو ئەوەی لێیانەوە فێری بووم منیان دەستخەڕۆکرد، دواتر خۆم وەك جەستەیەکی سەربڕاو هاتە بەرچاو.

دواتر نیگاکردنەکەی بە نیگاکردنێکی ترسناك ئاڵشت کردەوە.

---

[1] موعجیزە.

هازارد.. من دووجاران نەفرەت لێکرام، جاری یەکەم کە ویستم ئەو دوو فریشتەیە فریوو بدەم، جاری دووەمیش، کفرم بەو هەموو شتانە کرد، کە فێریان کردم، تا بیگەیێنمە هیچ و پووچی وەك ئێوە.

هازارد خۆی لێ کشاندەوە، چون ئەوەی بسڵەمێتەوە. کاتێ بینی بە حەرسەوە لێی نزیك دەبێتەوە، ترسی جادووە ڕەشەی بوو. ئەو جادووە دەیتوانی ئەو ڕۆحە ئامادە بکات، کە دەیەوێت، وەلێ نەیدەزانی ڤینۆس بۆچی تووڕە بووە، لەبەر نەفرەتلێکرانەکەیەتی، ترسا ڕۆحەکەی ونجڕ ونجڕ بکات، ئەو ڕۆحەی لەتەك فریشتەکان بەرەو ئاسمان هەڵکشا، ئەو شەوە وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار داکشا.. ئەستێرەی زوهرە.

.............................

تەواو

ئەم حیکایەتانە بەتەواوی لەهیچ شوێنێك باسی لێوە نەکراوە، بەڵکو بە شێوازێکی درۆزنانە لە تەورات و ئینجیل هاتووە، زۆر بەکورتیش لە قورئان باسی لێکراوە، بەوای[1] ئەم کەمباسییەش، هەندێ لە (موفەسرین)ی قورئان بەسەرگورشتەی درۆزنە لە تەورات و ئینجیلدا کە هاتووە، دەگێڕنەوە، لەوانیش موفەسرینی بالآتر بەرسڤیان دەدەنەوە. نووکە بەتەواوی وەك جادووگەرێك لێی تێگەیشتووم. مەترسە من پێشتر جادووگەر بووم، ئەو ڕێگایەم بەرداوە و دژایەتیشی دەکەم. ئەی پێم نەگوتی ڕەنگە فەنام بکەن.

---

[1] بەهۆی.

چیرۆکە بە درۆکراوەکە.. زۆر بە سادەیی سەرزەنشتی لای خودا دەکات، کە بنیادەمی وەک جێنشینی خۆی لەسەر زەوی داناوە، هەر بنیادەمەکان بوون خوێنیان ڕشت و بەدرەفتارییان لەسەر زەوی بڵاوکردەوە. خودا پێی گوتن.. ئەگەر ئێوەشم لەبری ئەوان دابگرتایەتە سەر زەوی، هەوەسی پەرینم تیاتانا شین بدایە، هەمان کاردانەوەی ئەوانتان دەبوو. فریشتەکان ئەوەیان ڕەتکردەوە و سووربوون لەسەر ڕای خۆیان، ئەوەی بنیادەم کردی ئەمان نەیکەن. ئەللا پێی گوتن.. دوو لەباشترینی خۆتان هەڵبژێرن، دایاندەگرمە سەر زەوی بە هەمان هەوەسبازی و ئەوەی بە بنیادەمم داوە. لەنێو خۆیاندا دوو لەباشترین و خۆڕاگرینییان هەڵبژارد، هارووت و مارووت. ئەللا ئەوەی لە بنیادەمدا کە ڕسکاندبووی، بەو دووانەشی دا و دابەزینە سەر زەوی.

هارووت و مارووت.. وەک دوو دادوەر کاریان دەکرد. ڕۆژێ لە ڕۆژان ئافرەتێکی تا بڵێی جوان و نەشمیل بەناوی (ئینانا) چووە بەردەمیان، لەبەر جوانییەکەی بە زوهرە ناوزەدێریان دەکرد. هەوەسیان چووە سەری و داوایان لێکرد لەتەکیاندا بخەوێت، ئەویش گوتی.. جەستەی خۆم ناخەمە بەر دەستتان، تا یەک لەو سێ شتەی دەیخەمە بەردەستتان ، یەکێکیان هەڵبژێرن، کفر بە ئەللا کردن، کوشتنی نەفسێك، مەی خواردنەوە. ئەوان دووانەکەی یەکەمیان ڕەتکردەوە، کە کفر بە ئەللا ناکەن، کەسێکیش ناکوژن، بۆیە مەی خواردنەوەکەیان هەڵبژارد. تا تێر مەستبوون (مەی)یان خواردەوە، دواتر بەهۆی مەستبوونەوە کفریشیان بە ئەللا کرد و نەفسێکیشیان کوشت. ئەللا نەفرەتی لێکردن، بوون بە نەفرەتلێکراو. چوون بۆ لای پێغەمبەر ئیدریس و داوایان لێکرد لای ئەللا شەفاعەتیان بۆ بکات.

پێغەمبەر سەری سوڕما، چۆن خەڵکی سەرزەوی شەفاعەت بۆ خەڵکی ئاسمان بکات. ما لە ئەشکەوتێك سزا بدرێن، ئەو ئەشکەوتەش تا ڕۆژی پەسڵان بەناویانەوە دەبێت.

بەڕاستی و بێگومان هەر هەموو ئەمانە درۆیە، درۆیەکی هەڵبەستراوە، مەبەست لێی شاردنەوەی بەسەرهاتە ڕاستەقینەکەیە. هەندێ شت هەیە وایان پێ چاکبووە بشاردرێنەوە، نە فریشتەیل دەتوانن دەمە دەم لەتەك ئەللأدا بکەن و لە فەرمانی دەربچن و بڵێن نەخێر نە ئێمەش دەتوانین ئەوە بکەین، فریشتەکانیش زاتی کفر کردنیان نییە، مێبازی ناکەن و نەفسیشیان بۆ ناکوژرێت، مەی خواردنەوە نەبووە و نابێت، ڕاستییەکەی تەنها لای موسوڵمانانە. ئەوان کە ئەستێرەی زوهرەیان بینی لە ئاسمان دەرکەوت، نەفرەتیلێدەکەن، ئەو نەفرەتلێکردنەش بەهۆی زوهرەوە بووە، کە هارووت و مارووتی لەڕێ دەرکرد. ئەوان نەبکوژن نە جادووگەریش، بەڵکو بۆ ئەوە خەڵکیان فێر دەکرد، تا بەسەر جاووگەرانی بابل زاڵ بن. ئینانا هەوەسی وێنەدان، نەشیان ویست ببینن، دووریان خستەوە، ئەو نەفرەتکرا، چونکە دەیویست لە ڕێیان دەربکات. کێشەکە ئەوە نییە ئینانا هەرچی لە هاڕووت و ماڕووت فێر ببوو، وەریگرت و گەیشتە جادووگەرانی بابل، جادووگەرەکان ئەو جادووانەیان پێگەیشت و برەویان وێدا بۆ کاری خەراپ و قێزەونەکانی خۆیان بەکاریان دەهێنا. بۆیە جادووگەرێتی دوو شێوازی هەیە، ئەو جادووەی (ئیبلیس) نەمرودی فێر کرد، ئەو جادووگەرێتییەی هاڕووت و ماڕووت خەڵکی بابلیان فێر کرد. شتێکی گەورە لەو جادووەی دووەمدا بە جادووگەرانی یەکەم گەیشت، ئەوەبوو بۆ کاری ناشایەستە و خەراپ بەکاریان دەهێنا، ئەمە نهێنی دووەمە کە پێتی ڕادەگەیێنم.

بەر لەوەی گەمەکەمان کۆتایی پێبێنین، دەمەوێ دان بەشتێك دا بێنم. ئێمە..مەبەستم خۆم و خۆتە، ئێمە هەرخۆمان نین، حەوت ئەهریمەنی تر لەم دانیشتنەماندا بوونیان هەیە و بەرامبەرمان دانیشتوون، دیقەتی من دەدەن، لەمەڕ گێڕانەوەی حیکایەتەکەم، تەماشای تۆش دەکەن، کە خەریکی خوێندنەوەیت، وەلێ ترست نەبێت، منیش پڕ بە ژوورەکە جادووم گڕ داوە، ئەگەرچی ئەم جادووانەم خۆیان لەبەر ئەو حەوت شەیتانە ناگرن، وەلێ هەرهیچ نەبێت، ئەوەندە بوارم دەبێت هەرچیم هەیە بۆتی بگێڕمەوە.

نووکە لێمگەڕێ ئەم کارتە نەفرەتلێکراوانەت بۆ دەمەو قلّپ بکەمەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵەی سێیەمیشت بۆ ئاشکرا بکەم.... بریتیە لەچوار کارت:

**کارتی یەکەم..** کارتی قەشەکانە، وێنەی چەند قەشەیەکی گومانلێکراوی بەسەرەوەیە، کراس و کڵاوی ڕەنگ قاوەییان لەبەردایە.

**کارتی دووەم..** کارتی سوارچاکانە، وێنەی شۆڕەسوارێکی بەسەرەوەیە، لەو سوارانەی سەردەمی ناوەندی خاچپەرستان، پۆشاکێکی سپی لەبەردا، کە تایبەتە بەسوارەکانی خاچپەرستان، لەناوەڕاستی وێنەیەکی خاچی سووری گەورە هەیە.

**کارتی سێیەم..** کارتی نهێنییەکانە، ئەو مرۆڤەی پێ نەگەیشت تا تێبگات، وێنەی پیاوێکی سەرسوڕماوی بەسەرەوەیە، شتێکی سەرنجڕاکێشی دۆزیوەتەوە.

دواکارت.. کارتی سێزدەهەمین هەینییە، وێنەیەکی بەسەرەوەیە، پێشنیارگەلێکی تاریکی لە ڕۆژمێریی کراوەی سێزدەهەم هەینی بەسەرەوەیە.

ئەم بەسەرهاتەش یەکێك لەو حەوت ئەهریمەنەی کە چاودێریمان دەکەن بۆتی دەگێڕێتەوە، چونکە بەسەرهاتەکە پەیوەستە بەو. نا ، لێم مەپرسە چۆنم بوێت تا بۆتی بگێڕێتەوە، ئەو لە هەوڵی ئەوەدایە چۆن جادووەکە پووچەڵ بکاتەوە و بێتە لام و سەرم ببڕێ. ئەم بابەتانە جارێکی تر پرسیاری تیا مەکە، چونکە بابەتگەلێکن لە جادووی ڕەش، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە داهێنانیاندا بووم. بابەتگەلی جن بە ئاسانی لێیان حاڵی نابیت، چونکە تۆ جادووگەر نیت، پێویستیش ناکا لەسەرت وابیت.

..........................



## بەشی سێیەم

# (نۆ) یان ڕووناکیمان وێدان

## ٩٥٠ پێش زایین - ١٣٠٠ پاش زایین

جوانترین کارێك لەژیانتدا کە دەتوانیت بیکەیت، ڕۆحی خۆتم پێ بفرۆشیت. من هەموو شتێکم هەیە، ئەو مەردوومەی دەیبینی دڵ و عەقڵیانم هەس. من هەموو دەرگاکانت بێ جیاوازی بۆ والآ دەکەم. دەتەوێ بەکوێ بگەیت؟ ملك و ماڵ یا دەسەلأت، یانەخۆ ناوبانگت دەوێت. من بێشومارانە وێتیان دەدەم، بزانە زۆر بلەزیش بەدەستت بگات. من لەتەك داهاتنی کاتدا ئەفرێندراوم. تا دنیا دنیایە من دەژیم. ناوی منت لێ دەشارنەوە، بەوە فریوت دەدەن، کە من خراپەکارم. دەیانەوێت هەموو کێکەکە بۆ خۆیان بمێنێتەوە، وەلێ کێکێکی تایبەتت بۆ دروست دەکەم. مەترسە و لەتەکما بڵێ بەلێ( بافۆمیت). ئەڵبەتە دەتەوێ بمبینیت. جارێ بواری ئەوەم نییە، مەبەستم بەسووك تەماشا کردنت نییە، حاشا. ڕەنگە دڵت بەرگەی ئەو مەزنییە نەگرێت کە دەیبینیت.

من نموونەیەکی خۆمت پێشان دەدەم، نموونەیەك وابەستەی یاسا و ڕێساکانی جیهانی تۆیە، کە جیهانێکی وا مەزنم نەبینیوە. ئازیزەکەم..

لەتــەکما وەرە بــۆ نــاو ئــەو کڵێســەیە، مەپەشــۆکێ و دەســت درێــژ بکــە و دەرگاکە بکەرەوە. من چاوەڕوانت دەبم، توند دەرگاکــە واڵا بکــە و بــە کــام پێت دەتەوێ بچۆرە ژوورەوە، لــەو پیــاوە ڕووتانــە گــەڕێ کــە لێــرەو لــەوێ جووت دەبن، لــەو خوێنــەش گــەڕێ کــە بەســەر پێســت و لێویانەوەیە، لەو هەمووە گەڕێ و بــۆ لای ئــەو مێزە گەورەیــەی لەوێدایــە پێشــکەوە. ئێستا بینیمت؟ ئەوەتام لە ناوەندا، منم.. بافۆمیت.

هــەموو شــتێکت بــۆ دەگێڕمــەوە. مــافی خۆتــە هــەموو شــتێك بزانیــت. لەتەکما وەرە بۆ قودس، قودســی ئــەمڕۆ نــا، قودســی بــەر لــە هــەزار ساڵ، قودسێك لامان وا پیرۆز نەبوو، ڕووبارگەلێکبوو لەخوێن ڕشتن، تا قولــە پێــی ئەســپەکان خــوێنێکی ســوور دەڕۆیشــت، خــوێنی موســوڵمانەکان، خــوێنی سوارەکانیان، منداڵەکانیان، ئافرەت و پیرەپەککەوتەکانیان، موسوڵمانەکان درنــدە بــوون، دواتــر بــۆتی ڕوون دەکەمــەوە. وەلێ ئەمــە قســە و باسـی ئێستامان نییە، باس لەو ڕووبارە سوورانەش ناکەین، بەشەقامەکانی قــودس دا سێلاویان بەست، چون ئــەوەی (فــورات)ێکی تــر بخەنــە ســەر نەخشــەی جیهان، فوراتێکی سووربار. ئەوانەی دەیانبینی، وایان هەست دەکرد زەوی برینــدار بێــت و خــوێنی لەبــەر بــڕوات. بــاس لــەو ئافرەتانــە ناکــەین ، کــە شۆڕەســوارەکانی خاچپەرســتان هێشــتا دەســتیان لــە خوێنــا هیشــك نــەبووبووەوە لاقــەیان دەکــردن. باســی ئــەو منداڵانــەش ناکــەین کــە کەللــەی سەریان بەژێر ناڵی ئەسپەکانیانەوە پان دەبوونەوە، باسی ئــەو مەنجەلــە زل زلانەش ناکەین کــە ئاویــان تیــا دەکولانــد و پیــاو و ئــافرەت و منــداڵیان تــێ فڕێدەدان، باس لەگشت ئەوانە ناکەم، باس لەو (قودس)ە دەکەم، کــە دوای وشکبوونەوەی خوێن لەو خاکەدا، چون دڵــی ئاکنجییــە موســوڵمانەکان وەك

گڕکان گڕی گرتبوو. قودسی داگیر کراو، بە داگیرکراو ناوی دەبەم، چونکە دوای ئەو کارەساتە خاچ پەرستان داگیریان کرد، کە پێشتر مافی ئێمە بوو. ئێمە کێین؟ بۆ ئەوە هاتووم بەرچاو ڕوونیت بکەم.

قسەو باسەکەمان سەرەتا لە منەوە دەبێت. منێکی عەرەب لە قودس فرۆشیاری شتگەلی کۆن و ئەنتیکە بووم، نارەزایی دەرمەبڕە، پێمبڵێ چیت بەسەر مێزەکەوە لەناو کڵێساکەدا بینی، کە پێشتر تۆم بۆ ئەویّ برد، نەیکەی بە پرسیاری پێشوەخت. من پیرەمێردێك بووم، زۆربەی ددانەکانم لەدەستدابوو، جلکێکی شڕو وڕم لەبەردابوو، چەند تەڵە ڕیشێکی خوار و خێچ بەچەناگەمەوە مابوون. ئەوەتا بە نیمچە ڕووتی لە یەکێ لە گەرماوەکانی قودس ڕۆنیشتووم، گەرماوەکەی(عەلادین)ە. وشەی گەرماو بەو بینا بەرزو مەزنانەی ئیسلام دەگوترا، کە سێ ژووری گەورەی تێدابوون، خەڵکی سەردانیان دەکردن، لە ژووری گەرمکەرەوە بووم، جەستەم بەوای هەڵمی گەرمەوە گەرم داهاتبوو، چاوم لەو گەنجە جوانەی تەنیشتم نەبڕی کە بیری لای خۆی نەبوو، چەند ڕۆژێك سۆسەم کرد[1]، ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا لەتەکیدا قسەو باسێك بکەم. ناوی ئەو گەنجە، ناوێکە هەموو شتێك بەوەوە دەستی پێکرد، ناوی (هیۆ بایۆن)ە، سوارێکە لە سوارچاکانی خاچپەرستان لەڕەچەڵەکدا جوولەکەیە. دەمەویّ بنەچەی ئەم جووە لەبیر نەکەیت.

- هیۆ بایۆن.. (کاترین)ی ژنت بەو کردەوانەی زانیوە کە چیت لەئافرەتانی عەرەب کردووە!

هیۆ چون ئەوەی مارانگەز بووبێت، ڕاچڵەکی و ئاوڕی لێدامەوە و گوتی:

---
[1] سۆراغ کردن ، چاودێری

- هێی.. ئەوە باسی چی دەکەیت، تۆ کێیت، ناوی ژنەکەم چۆن دەزانیت؟

بەدەنگی فیشکاندنی مار پێمگوت:

- کاترین کلێری ژنت هەموو کردەوەکانتم پێگوتوە، هەموو ئەو کچانەی دەستبازی و ناوجێت لەتەکیاندا کردووە و دواتر بە شمشێرەکەت پارچە پارچەت کردوون. بایۆن.. زانیم کە تۆ نەخۆشیت، ئێستا بەناو بنەماڵەکەتاندا بڵاوی دەکاتەوە.

هیۆ بە دوو چاوی زەقی سەرسوڕماوەوە گوتی:

- چی.. چۆن باسی دەکات، ئەی پیری خرف تۆ کێیت؟

- بایۆن.. من کارە قیزەونەکانی تۆم، من ڕووڕەشییەکەی تۆم، کە لەپشت دەمامکی شۆڕەسواری و ئاینگەراییدا دەیگێڕیت!

گورگەکەی هزری هیۆ کەوتبووە هەڵچوون، ناقرگەی توند گرتم و گوتی:

- ئەی عەرەبی هیچ و پووچ، پێم بڵێ تۆ کێی؟ چۆن دەتوانی بەو شێوەیە قسەم لەبەرامبەردا بکەیت، ئەم هەموو قسە قۆڕانە لەکوێوە فێری بوویت؟

هەرچی ئارامی بوو وەك ئەوەی نەیبێت وابوو، تەنانەت خۆشۆڕەکانی گەرماوەکەی (عەلادین) ئاوڕیان لێ دایەوە، تا لە شۆڕەسوار هیۆ بایۆن بڕوانن، کە وەك شێت ڕەفتاری دەکرد. هاواری دەکرد و دەستی بۆ کۆڵەگەکەی تەنیشت خۆی دەبرد لەبنا دەریبکات. هیۆ بەتووڕەییەوە لێیانی

ڕووانی، وەك سەگی هار کەوتبووە ئەو ناوە. خەڵکەکە بە سەرسوڕماوییەوە لێیان دەڕوانی، بۆ خۆیشی ئارام و ئۆقرەی نەبوو، گوتی:

- بەڵام.. بەڵام لێرە بوو، کەستان ئەو پیرە قۆڕەتان نەبینی، پێش کەمێك لێرە بوو؟

ڕۆژی جەژنی لقە زەیتوونی مەسیح، یا جەژنی(شەعانین)یان پێدەگوت. دانیشتوانی قودس پێشوازیان لە خاچ پەرستان و حاجییان دەکرد، موسوڵمانانیش وەك تەماشاکەر لێیانیان دەڕوانی، دواتر بە کاروان بەرەو دۆڵی (ئەسپات)ی نزیك بەشار دەڕۆیشتن، تا لەوێ بە کاروانی پیاوانی ئاین و سەرۆك(دێر)ەکان بگەن، یەکێك لەو قەشانە لەپێشەوە خاچی پیرۆزی هەڵگرتووە. ئەو دوو کاروانە یەکدەگرن تا پێکڕا بەرەو گومبەتی بەردەکە[1] بەڕێ بکەون. هیۆ بایۆ لەناوەندیاندا دەڕۆیشت، پێدەچێت ئەو ڕۆژە لە گەرماوی(عەلادین) بە بۆنەی ئەو جەژنەوە لە گەرماوەکەدا بووبێت.

پیاوانی ئاین بە پێشڕەوی هەڵگری خاچی پیرۆز بەدەور گۆڕەپانەکەدا دەسووڕانەوە، ئەمەش بۆ خۆی سونبولێك بوو بۆ گردانی خاچی پیرۆز بەدەور نزرگای سولێمان. لەوێدا لێل[2] تەماشاکاران وێستابووم، بە هێمنی لە هیۆ نزیکبووەمەوە و پێمگوت:

---

[1] قبە الصخرە.

[2] لەگەڵ.

- ئــەو گێلانــە نــازانن لەتــەك ســوڕانەوەیاندا و لــەژێر پێیانـدا گەنجینەیەکە، هەر کەسێك بە دەستی بێنێ، هەموو جیهان بەدەست دێنێ، ئەوەی ونیکرد، هەموو دنیای ونکرد.

هیۆ.. بەسەرسوڕماوییەوە لێی ڕووانیم، کە زانـی مـنم، بـە تووڕەییـەوە گوتی:

- هۆ کابرا.. گوێبگرە، ئەگەر چرکەیەکی تر لەبەرامبەرم بمێنیتـەوە، بەیەك مست فەنات دەکەم.

- نـا، بـایۆن تـۆ گـوێم لێبگـرە.. دوای خۆرئـاوابوون نامەیـەکت لـە ژنەکەتەوە بۆ دێت، کە لە (شـامین)ی فرەنسـایە، بـاس لەخـەونێك دەکات، هەموو شەوێك توشی خەوزڕانی دەکا، وەسفی پیاوێکـت بـۆ دەکـات، ئەگەر ئەوەی باست بۆ دەکەم وا نەبوو، بێ و لەناو بازاڕەکەدا بمکوژە، وەڵێ ئەگەر قسەکەم تەواو بوو، وەرە دوکانەکەم ئەودوایت بۆ باس دەکەم.

- – هەی بێ مێشـك چیم پـێ ڕادەگـەێنیت؟ هـەی پـڕو پـووچ چیت لەژنەکەم داوە؟

چەند کەسێك لەنێوانمان تێپەڕین، کاتێکی باش بـوو لەبـەر چاوی دوور بکەومەوە،

لای خۆرئاوا، هیۆ نامەیەکی لەژنەکەیـەوە پێگەیشـت، دەڵێـت.. هـەموو شەوێك خەونێکی ناخۆش دەبینێت، پیاوێکی پیری ددان شاش دەبینێـت لـە گۆڕەپانی گومبەتی بەردی پیرۆز دەسووڕایەوە، چـاوی لـە(هیۆ)بوو سـێکس لەگەڵ ئافرەتێکی ئەسمەری سەربڕاو دەکا و شمشێرەکەشـی لای سـەریەوە دانابوو.

- هەبێت و نەبێت تۆجادووگەری، وایە؟

لەنێو شت ومەکی کۆن و ئەنتیکەکانی ناو دوکانەکەمەوە دیقەتیم دا، پێمگوت:

- گەورەم من بازرگانی کەل و پەلی کۆن و ئەنتیکەم.
- ئەی مەلعوون تۆ چۆن ناوی ژنەکەم دەزانیت؟ چۆن بە خەونەکانی ئاشنایت؟
- خەونەکەی هەراسانی کردی، دەتەوێ ئافرەتەکانی تر ببینێت، کە چیت لەتەکیانا کردووە؟
- تۆ ئەم هەموو شتە چۆن دەزانیت؟ ڕاست پێمبڵێ تۆ کێیت؟
- بافۆمیت
- چی؟

لەسەرخۆ دەستم بۆ ئەنتیکەیەکی گەورەی سەر ڕەفەکان برد، کە لەسەر شێوەی قودس دروستکرابوو، ئەنتیکەکەم لەسەر مێزەکە داناو گوتم:

- ئەی بایۆن.. من هەر وەك کتێب عەقڵی تۆ دەخوێنمەوە، تۆ ئێستا بیر لەوە دەکەیتەوە کارەکانت لە قودس تەواو بکەیت و بۆ (شامین) بگەڕێیتەوە، بیریش لەوە دەکەیتەوە، ئیدی لەداهاتوودا بەشداری هیچ شەڕێك نەکەیت، بەهۆی ئەو ناوبانگەی لە هەڵمەتەکانی خاچپەرستاندا پەیدات کرد.
- تۆ کێیت؟
- من (بافۆمیت )م، من ئەو کەسەم دەتگۆڕم بۆ دەوڵەمەندترین کەسی ئەوروپا، بگرە جیهانیش.

- باشە بەرامبەر ئەوە چیت لێم دەوێت؟ لەو کەسانەش نیم باوەڕ بە جادووگەران و قسەی پڕو پووچیان بێنم.

- ڕێك وایە، بەو بەڵگەیەی کە ڕۆیشتیت بۆ لای (جۆلیان)ی جادووگەر لە کلۆمۆنت.

هیۆ.. چاوەکانی ئەبڵەق بوون، سەری سوڕما، باسی شتگەلێکم بۆ کرد، هیچ بوونەوەرێك درکی پێیان نەدەکرد، تەنها خۆدی خۆی دەیزانی. ما قسە ڕەقەکانی و بەگژداچوونەوەم بۆ شێوازێکی نەرم و نیانتر بگۆڕێت، منیش هەر بۆ ئەوەم بوو، بەو شێوازەی بگەم، باوەڕم پێبکات، وەك بنێشت بە بن ددانەکانمەوە بێت، چۆنم بوێت وای دەجووم، کوێشم بوێت بۆ ئەوێی هەڵدەم. هەوەڵین تووڕدانیم بۆ (شامین) لە فڕەنسا بوو، لەوێ ئەوەی دەمەوێت، بۆمی جێ بەجێ بکات.

هیۆ بایۆن.. بۆ فڕەنسا گەڕایەوە، لەوێ هەشت پیاوی شۆڕەسواری چاکی لە براو ئامۆزاکانی هەڵبژارد، هەر هەمووشیان لەڕەچەڵەکدا جوو بوون و لەیەك بنەماڵەدا بوون. پێکرا گەڕانەوە قودس. چوونە بەردەم پاشا(بالودێنی دووەم) پاشای قودسی خاچپەرستان. هیۆ باوەڕی بە پاشا هێنا کە ڕێکخستنێکی ڕێك و پێك لەسوارچاکان بۆ پارێزگاری حاجیانی خاچپەرستان دابمەزرێنێت، بۆ ئەو حاجیانەی بۆ حەجکردن بۆ قودس دەهاتن، تا لە دز و جەردەی موسوڵمانان بیانپارێزن. ئەگەرچی پاشا( بالدوێن) باوەڕی بە پێشنیارەکەی هیۆ هێنا، وەلێ هیۆ درۆزنێکی گەورە بوو، موسوڵمانەکان کەسیان نەدەکوشت، بەڵکو ئەوە جەردە و ڕێگرەکان

بوون ئەو کارانەیان دەکرد. لێ کردەی هیۆ بەرامبەر بە پاشا ڕێک ئەوەبوو، کە من داواملێکردبوو.

بەم شێوازە ڕێکخستنی سوارچاکان( سوارچاکانی هەیکەل) بەم ناوەوە دامەزرا. پاشا بالدوێن هەر لەناو حەساری کۆشک نزیک نزرگای سولێمان و لەچیای (هەیکەل) بارەگای بۆ دانان. چیای هەیکەل زاراوەیەکی جوولەکەیە بەمانای حەرەمی پیرۆز دێت، چونکە حەرەمی پیرۆز بەسەر نزرگای سولێمانەوە بوو، واتە بارەگاکەیان چون ئەوەی من دەمویست لەسیلەی مزگەوتی ئەقسا دا بێت.

لێمگەڕێ، زانیارییەکت لەسەر چیرۆکی سوارچاکان پێبلێم، وەک چۆن مەزەندەت کرد، من ئەهریمەنم، بەو ئاوایەی من شەیتانم، واتە لەناو لەشی مرۆڤ بەڕێڕەوی خوێن هاتوچۆ بکەم، هەروەک چۆن لاپەڕەی کتێب دەخوێنمەوە، بیرکردنەوەشیان وا دەخوێنمەوە، هەر ئەوەش نا چۆنیشم بوێت لەعەقڵیاندا دەینووسم و دایدەڕێژم، چۆنم بوێت وای دەئاخنمە هزریانەوە. زۆر ئاسان بوو(هیۆ) باوەڕم پێبکات، لەوەش ئاسانتر باوەر پێهێنانی ئەو هەشت کەسەی دایانییە پاڵ خۆی، چونکە من (بافۆمیت)م، بەلای منەوە کە ئەهریمەنم ئاسانە بیرکردنەوەی بنیادەم وەک مار بۆ ڕاوکردن بئاڵێنمە گەردنییەوە. هاوڕێم لەوەش زیاتر، زۆریش زیاترم لەدەست دێت.

مێژوو هیچ نووسراوێکی نەخستووەتە ڕوو، کە سوارچاکان حاجییەکیشیان پاراستبێت. ئەو ماوەیەی لەقودس مانەوە هیچیان،

کارێکیان بۆ پاراستنی حاجیان و خاچپەرستان نەکرد، هەر خەریکی چالکردن بوون، ئەویش تونێل هەڵکەندن بوو لەژێر (قودس)ی پیرۆزەوە.

- ئەی پیرەمێرد.. بۆ نزیک نابیتەوە چاوێك بە چاڵکردنەکە بگێڕیت، بۆچی هەر لەلێواری گۆڕەپانەکە وەستاوی؟

- گوێ بە من مەدە، بەردەوام بن لەکارەکەتان، ئەگەر پەیمانەکەم نەمێنایە دی، وەرە بمکوژە.

- بافۆمیت.. خوێنت دەخۆمەوە، هەست بە پڕوپووچی بابەتەکە دەکەم.

هەرگیز نەمدەتوانی لەو شوێنە نزیك ببمەوە، ئەگەر لەو شوێنە نزیك بوومایەتەوە، وەك چۆن ئەهریمەن دەسووتێت، دەیسووتاندم.

پیرەمێرد چاوەکانی تەسك کردەوە. بیری ڕۆژگارێکی کردەوە، ڕۆژگارێك وەك گوژاڵك تاڵ، لەهەمان شوێن لە گۆڕەپانەکەدا وێستابووم، ئەمە بەر لەدوو هەزار ساڵ دەبێت. ڕۆژگارێك بوو قەومی فریشتە و شەیتانەکان هەموو شتێکیان لەدەست دابوو. لەسەرەتای ئەفراندنەوە چیمان ویستبێت کردوومانە، وەك بەردی شەترەنج یاریمان بە بنیادەم کردووە، لە ڕاست و چەپ و لای ژوور و خوارییانەوە بۆیان چووین، وەك (با) چۆن ئاڕاستەی بەلەم دەگۆڕێت، گۆڕیومانن. ئێدی ئەو پاشایەمان لێ پەیدا بوو، پیاوێك بوو بە (سولێمان) ناویان دەبرد, کەوەکو چۆن سەگ لغاو دەکرێت, ئێمەی لغاو کرد.

پیاوێك نەپێشتر هەبووە و نەپیاوی وا پەیدا دەبی.

لەتەک جنەکانی بیناکردن منیش کارم دەکرد. ئەوانیش لەژێر فەرمانی پاشا (سولێمان) کاری بیناسازیان دەکرد، ئەو کارانەیان ئەنجام دەدا لەتوانای بنیادەمدا نەبوو ئەو کارە بکەن. ئەوەی کە بینایان دەکرد کۆشکی سولێمان بوو. نەمان دەزانی ئەو پیاوە چۆن حوکممان دەکات، چۆن لەگەڵ باڵندەکان گفتوگۆ دەکات، چۆن قسە لەگەڵ مێروولەدا دەکات، چۆن پاشاکانی جن لەژێر پێی دەکەون، هەرچییەکی بوێت بۆی دەکەن. ئێمە جادووگەریمان بۆ مرۆڤ هێنا سەر زەوی، بنیادەم بمانیبینیایە لەترسا یەکسەردەمردن. نازانم چۆن وایلێکردین، بە ئاژەڵیشمان نەزانێت. کەی بووە تەنها مرۆڤێک بە یەک نیگاکردن بمانسڕێتەوە. سولێمان پاشا نەبوو، جادووگەریش نەبوو، ئەو پێغەمبەر بوو، پێغەمبەرێك بانگەشەی یەکتاپەرستی خوایەکی دەکرد. ئێمە کفرمان کرد، بۆیە بەو دەردەی بردین، کە بەگەورەو بچوکمان لەژێر فەرمانی ئەو بووین.

لەوێ لە گۆڕەپانەکە وەك هەموو ئەهریمەنەکان وێستابووم، هەرکەسێکمان لە کورسییەکەی نزیك بووینایەتەوە دەیسووتاندین. تەماشام کرد، لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، کەس لەم پلەو پایە و کورسی و پاشایەتیی بۆ نەهاتووە، زۆرم ڕق لێبوو، ئیرەییم بە دەسەڵاتەکەی دەبرد. بە هەموو ڕێگایەکی شەیتانی و ناشەیتانی ویستمان زەفەری پێبەرین و لەناوی بدەین، وەلێ ئەو شتێکی هەبوو ئێمە نەمانبوو. نەماندەزانی ئەو شتە چییە، وەلێ ئەو هەیبوو. لەپڕ ئومێدمان وەبەر هاتەوە، هیوای تۆڵەسەندنەوە، ڕەنگە هیوای ڕزگاری یەکجارەکی بێت.

## ئەنتیخریستۆس

لەپڕ سولێمان لەم نەخۆشییە نەخۆش دەکەوێت، دەردێکی گرت ڕاستبوونەوەی بۆ نەبێت، پزیشک نەماو حەکیم نەما لە جنەکان سەریان سوڕ نەمێنێ، باڵندەکان لەمسەرو لەوسەری گۆی زەوی گژوگیایان بۆ چارەسەر کردنی هێنا، وەلێ بێسوود بوو. دەردەکەی وابوو، کە سولێمان لەسەر کورسییەکەی دادەنیشت، وەک جەستەیەکی بێ گیان بێت، هەر وەک مردوو وابوو، ڕۆژ بە ڕۆژ دەردەکەی لێی پیسی دەکرد، تا بەهەموو جەستەیدا بڵاو بووەوە، بێهێز و بێبڕستی کردبوو، ئەوەش بۆ ئێمە هەلێک بوو بۆ لەناو بردنی.

بۆ خۆمان نەماندەتوانی لە کورسییەکەی نزیک بینەوە، لاریمان لەوەدا نەبوو. ئەو پیاوە گەردێك لەو دەردە چووبووە جەستەی، ئەو دەردەی گرتبووی ڕوون و ئاشکرا دیاربوو زوو یا درەنگ ئەو دەکوژێت، بۆیە تۆڵەکردنەوەمان شێوازێکی تری گرتە بەر، شێوازێکی شەیتانی. ما لەو گۆڕەپانە بەدزییەوە بگەڕێین و چاودێری بکەین. خۆمان لەبیناکردنی کۆشکەکەی دزییەوە و لەژێر کورسییەکەیەوە کەوتینە تونێل دروستکردن،

مەزنترین و شارەزاترین نووسەری فریشتەمان هێنا، دەسنووسێکیان بۆ دەنووسینەوە لەو دەسنووسانەی لەڕابردوودا خەڵکیمان فێری جادووی ڕەشنان کردبوون، ئەو جادووانەی ئەگەر دێڕێکی لێ بخوێنیتەوە، ئەوەندە بەهێزە دوور نییە لەناوت ببات، نەك هەر ئەوەش، ئەوەی (هارووت) و (مارووت)یش فێری بووبوون، کە جادوویان لەسەر جادووی ڕەشەوە و هەموو جادوویەکیشیان هەڵدەوەشاندەوە. بەو شێوازەی ئێمە دەمانوویست ئەوەشمان بۆ زیاد کرد، هەموو ئەو هەواڵانەی ئاسمانمان لە فریشتە

گوێرایەڵەکانەوە پێ دەگەیشت کە لەسەر زەوی چی دەگوزەرێت. لێم دەپرسیت بۆچی وامانکرد؟ کاری ئێمە لەسەر کوشتنی سولێمان چییە؟ ئەوا دەستبەجێ وەڵامت دەدەمەوە.

سولێمان.. هەموو کتێب و دەسنووسی جادووگەریی لە مەملەکەتەکەی خۆی کۆکردەوە و سووتاندنی، نەك هەر ئەوە، لەسەردەمی خۆی هەرچی جادووگەریش بوو کوشتنی، تەنانەت شکی لەکێ بوایە دەیکوشت. بڕیاری دەرکرد، هەر کەسێك گوێ لە هەواڵەکانی ئاسمان لەفریشتەکانەوە بگرێت، لە ملی دەدرێت، هەرکەسێکیش بڵێت فریشتەکانی ئاسمان هەواڵی ئاسمان دەزانن، ملی دەپەڕێنێ.

سولێمان بەهۆی ئەو توانایەی هەیبوو هەموو کارەکانی کوێرەوە کردبووین، بۆیە هەموو ئەوانەی فێری ببووین، دەبوو بۆ خۆمانی گل بدەینەوە، چونکە سولێمان یاسایەکیشی بۆ ئێمە دانابوو، نابێت بە هیچ پەیوەندیمان بە بنیادەمەوە هەبێت، مەبەستم پەیوەندی ڕوو بە ڕووبوونەوە، وەلێ تا ئێستاش دەتوانین لەنێو دڵ و هزریاندا کنە بکەین، تا نووکەش دەتوانین لەسەر شێوەی ئاژەڵ لایان دەرکەوین، وەلێ بەهیچ شێوەیەك ناتوانین زەرەرمەندیان بکەین، ناشتوانین پەیوەندیان پێوە بکەین و فێری هونەری زانستی جادوویان بکەین، کە بەر لە سولێمان دەمانکرد. کاتێ سولێمان جادووگەرەکانی کوشت و کتێب و دەسنووسەکانی بە کتێبی ڕەشیشەوە سووتاند، پەیوەندی بنیادەمی لێمان قەدەغە کرد، هیچ شێواز و جۆرێکی جادوو لەسەر زەوی نەما، تەنها جادووی دێهاتە دوور دەستەکان

نـەبێت، وەلێ جـادووی جوولەکـەی لـە ڕەگ و ڕیشـەوە سـووتاند و کـوێری کردەوە.

ئەو کتێبانە بۆ ئێمە نەبوو، لە جیهـانی ئێمـەدا کار بـە کتێـب ناکـەین، بەڵکو بۆ بنیادەمەکان بوو. هەرچی سولێمان بوو، دوای ئـەوەی دەردەکـەی دەیکوژێـت، وەسوەسـە دەخەینـەوە دڵـی بنیادەمـەکان، تـا کتێبـەکان دەربهێننـەوە، فێریشـان دەکـەین ئـەو کتێبانـە هـی سـولێمان بـوو ، کـە چ جادووگەرێکی نەفرەتلێکراوبوو، ئـەوانیش تـا ڕۆژی پەسـڵان[1] هـەر نـەفرەتی لێدەکەن، بەو ئاوایە هونەری خۆمان دەپارێزین و تۆڵـەش لـەو دەکەینـەوە، کە ئەو کتێب و دەسنووسانەی سووتاندنی و قسەی نابەجێی خۆی بوو.

هەر خەریکی چاڵکردن بووین. سولێمان بێ خەبەر بوو کەچی دەکـەین، تـا پێمـانکرا قووڵمـان کـرد، بـۆ ئـەوەی ئـاگری سـولێمان نەمانسـووتێنێت، پیلانەکەمان سەری گرت، وەلێ دڵمـان لەدەسـتماندا بـوو، پێمـان نـەزانێت.. لەژێر کورسییەکەی بینایەکمان درووست کرد، گشت کتێبەکانمان تیاناخنی، ئەو خۆڵەی دەرمان دابوو، بەو خۆڵە پڕمان کردەوە، هەموو کارەکەشمان لە مانگێکدا تەواو کرد.

دەردەکەی سولێمان تا چاکەوەبوو چل ڕۆژی خایانـد، ئـەوجا لـەجاران بـەهێزتر و تونـدو تیـژتر بـوو، تەنانـەت سـولێمان فـەرمان بـە(با)ش بـدات و چۆنیشی بوێت وا هەڵدەکات. توانی بۆ ڕازاندنـەوەی کۆشـکەکەی فریشـتەی تایبەت بۆ دەرکردنی گەوهەر و دوڕ و بـەردی بـەنرخ لـەژێر دەریاکـان بـەکار بهێنێـت. دەسـەڵاتی بەسـەر کۆمـەڵێک ئەهریمـەن زاڵبـوو، کـە وێنـەیان

[1] ڕۆژی قیامەت.

لەدڕندەییدا نەبوو، دەست و پێیانی بەستەوە وەك (لۆسیڤەر)ی مەزن. بۆ یەکەمجارم بوو مەزنێکی خۆمان بەو شێوەیە ببینم. لەهیچ شتێك حاڵی نەبووین، بەڕاستی لەهیچ شتێك تێنەگەیشتین، حوکمی سولێمان بەسەرمانەوە زۆر زۆر سەخت بوو، تا بەمەرگی تەواو بوو، کە لەپڕا بیستمان و لەکۆیلەیی ڕزگارمان بوو. ما چاوەڕوان بین دەستەیەك بێنە ئاراوە، بتوانن ئەو کتێبانەمان بۆ دەربهێننەوە. لەمێژوودا ئەو دەستەیە پەیدا بوون، هەر جوولەکە بوون، وەلێ ناخیان لە ئاژاوەگێڕی کەیل[1] بوو، کەوتنە هەڵدانەوەی خۆڵەکە تا بەکتێبەکانمان بگەن، بەتایبەتی کتێبی جادووی ڕەش.

- بافۆمیت بڕوانە ئەوێ دیوارێکی تەختی لێیە.

دوا نیگام لێ کردن، بەلایانەوە ڕوون نەبوو، هەروەك هەڵفڕینی ئەهریمەنەکان کەوتمە هەڵفڕین، لەگۆڕەپانەکە دوور کەوتمەوە، تەنانەت لەجیهانی بنیادەمیش دوور کەوتمەوە و گەڕامەوە سەرچاوەکەی خۆم، لێگەڕام سوارچاکانی هەیکەل تەختە دیوارەکەش هەڵدەنەوە. ئەمڕۆ کارێکی مەزنم ئەنجامدا، کە چەندین ساڵ خۆم و قەومەکەم چاوەڕوان بووین کۆتایی پێبێت، باوەڕمان نەدەکرد ڕۆژێك بێت و کۆتایی پێبێت.

سوارچاکەکان کتێبەکانیان کە ئەهریمەنەکان بەر لەهەزار ساڵ شاردبوویانەوە دۆزییەوە. ئەوان نەیاندەزانی ئەو کتێبانە گەنجینەن، پێیان وابوو بەدووی گەوهەر و دوڕ و زێڕدا دەگەڕێن، نەیخۆن تاڵە. سولێمان داوای لەخودای خۆی کردبوو، گەنجینەکانی دەست کەس نەکەون، لەگەڵ مردنیدا دەسەڵات و گەنجینەکەشی فەنا بکات، نە خەڵکی سەر زەوی و نەیش

---

[1] پر.

ئەوانەی ئاسمانیش چنگیان لەپارچەیەکیشی گیر نەبێت. بۆیە هەموو زانست و زانیارییەکانی مرۆڤ نە گەنجینەیان بۆ دۆزرایەوە، نە شوێنەواری گەنجینەکەشیان بۆ ئاشکرابوو، تەنانەت هەندێك وەك ئەفسانەی ئاینەکان بە ئەفسانەیان چواند، وەلێ ئەفسانەی ڕاست بە ئێسك و پرووسکییەوە نزرگاکەیەتی، هەندێکی تر سوێند دەخۆن وا لەژێر حەرەمی پیرۆز، وەلێ ڕاست و دروست مەبەست لەنزرگاکەیەتی.

سولێمان هیچ بیناو نزرگایەکی دروست نەکرد، بەڵکو ئەوەی دروستی کردبوو، مزگەوت بوو. باوەڕی بەخوای ئیبراهیم و موسا هەبوو، وەلێ سولێمان پشتی ئێمەی بەوە شکاندبوو، شتگەلی تری پێ درووست دەکردین، لەوانە نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی ئەقسا، کە ئادەم بنیاتی کردبوو، لەوانی تریش بیناکردنی کۆشکی بەهەیبەت، کە لەشووشەی بەنرخ درووستکرا، ئەو کۆشکە سەیرو سەمەرترین کۆشك بوو.

تەنها ئێمە دەزانین گەنجینەی سولێمان لەکوێیە، هەر ئێمەش دەزانین کۆشکەکەی لەکوێیە، تیرەیەك لە ئێمە باوەڕیان بەسولێمان و پەیامەکەی هێنا، ئەوان گەنجینە و کۆشکەکەیان شاردووەتەوە، بنیادەم پێیان نادۆزرێتەوە، گەنجینەکەش لەژێر زەوی چەند وڵاتێکی خۆر هەڵاتی ناوەڕاست لەهەموویان زیاتر لەدوورگەی عەرەبی لەشاری (ئەلعولا) شاردراوەتەوە، دوو پاسەوان پاسی گەنجینەکە دەکەن، پاسەوانگەلێکن کەس زەفەریان پێ نابات، تەنانە جنەکانیش، تا دنیا دنیایە بەو شێوازە پارێزراو دەبێت، زێڕ و گەوهەر و دوڕ و بەردی بەنرخ کە وەك خۆر و مانگ

دەدرەوشێنەوە، وەلێ ئەو گەنجینەیە دوای سولێمان نە بۆ بنیادەم و نە بۆ جنەکانیش دەبێت.

بەکورتی سوارچاکان بێجگە لە کتێب و دەسنووسەکان هیچی تریان نەدۆزییەوە، بەلأم نەیاندەزانی ئەو کتێبانە چ گەنجینەیەکە، گەنجینەی وا دەتوانێت زانست و مێژووی ئەو سەردەمە سەرلەبەری بگۆڕێت، گەنجینەیەك بەدەستی هەرماسەکانەوە نووسرابێت، زاناو بیرمەندی شەیتانەکان نووسیبێتی دەبێت چی بێت. سوارچاکان بلأوەیان بە مەردوومەکە کرد، هەموو کتێبەکانیان خوێندەوە، لەگەڵ خوێندنەوەی نهێنییەکی تری ئەم جیهانەیان بۆ ئاشکرا دەبوو، بۆ بنیادەم هیچ نەبوو لەئەو نهێنییانە بزانێت.

ڕێم بدە بتبەمەوە ئەو کلێسایەی کە سەرەتای گفتوگۆکەمان بردمیتە ناوی، ئێستا چاك چاوەکانتی لێبکەرەوە، بەوردی دیقەت بدە، ئەوانە سوارچاکەکانن، ئاخۆ لێمدەپرسیت بۆچی کاری سێکسی هاوڕەگەزبازی لەنێو خۆیاندا دەکەن، یا پرسیارم لێدەکەیت، بۆچی خوێن بە پەرداخ دەخۆنەوە؟ ئەوە نەریتێکە ڕەنگە بۆ یەکەمجار نامۆ بێت، وەلێ دەتگەیێنێتە سەرچاوەی ڕووناکییەکە، دەتگەیێنێتە ئێمە. جارێکی تر بڕوانە سەر مێزەکە، ئەو کەللەسەرە دەبینیت، کە لەناوەندی مێزەکەدا جێگیر کراوە، ئەوە کەللەسەری(بافۆمیت)ە، کەللەسەری ئەهریمەنە. ئەو کەللەسەرەی ئەهریمەن ئێستا قسەت بۆ دەکات. ئەوانەیش کە لەونەریت و ڕێوڕەسمەوە بوونەوە، قسەیان لەتەکا دەکەین. ئەوان جەستە و گیان و ئاکاریشیان لەپێناو شەیتان(بافۆمیت) فرۆشت.

دەدرەوشێنەوە، وەلێ ئەو گەنجینەیە دوای سولێمان نە بۆ بنیادەم و نە بۆ جنەکانیش دەبێت.

بەکورتی سوارچاکان بێجگە لە کتێب و دەسنووسەکان هیچی تریان نەدۆزییەوە، بەلاَم نەیاندەزانی ئەو کتێبانە چ گەنجینەیەکە، گەنجینەی وا دەتوانێت زانست و مێژووی ئەو سەردەمە سەرلەبەری بگۆڕێت، گەنجینەیەك بەدەستی هەرماسەکانەوە نووسرابێت، زاناو بیرمەندی شەیتانەکان نووسیبێتی دەبێت چی بێت. سوارچاکان بلاَوەیان بە مەردوومەکە کرد، هەموو کتێبەکانیان خوێندەوە، لەگەڵ خوێندنەوەی نهێنییەکی تری ئەم جیهانەیان بۆ ئاشکرا دەبوو، بۆ بنیادەم هیچ نەبوو لەئەو نهێنییانە بزانێت.

ڕێم بدە بتبەمەوە ئەو کڵێسایەی کە سەرەتای گفتوگۆکەمان بردمیتە ناوی. ئێستا چاك چاوەکانتی لێبکەرەوە، بەوردی دیقەت بدە، ئەوانە سوارچاکەکانن، ئاخۆ لێمدەپرسیت بۆچی کاری سێکسی هاوڕەگەزبازی لەنێو خۆیاندا دەکەن، یا پرسیارم لێدەکەیت، بۆچی خوێن بە پەرداخ دەخۆنەوە؟ ئەوە نەریتێکە ڕەنگە بۆ یەکەمجار نامۆ بێت، وەلێ دەتگەیێنێتە سەرچاوەی ڕووناکییەکە، دەتگەیێنێتە ئێمە. جارێکی تر بڕوانە سەر مێزەکە، ئەو کەللەسەرە دەبینیت، کە لەناوەندی مێزەکەدا جێگیر کراوە، ئەوە کەللەسەری(بافۆمیت)ە، کەللەسەری ئەهریمەنە. ئەو کەللەسەرەی ئەهریمەن ئێستا قسەت بۆ دەکات. ئەوانەیش کە لەونەریت و ڕێوڕەسمەوە بوونەوە، قسەیان لەتەکا دەکەین. ئەوان جەستە و گیان و ئاکاریشیان لەپێناو شەیتان(بافۆمیت) فرۆشت.

لێم دەپرسیت بەرامبەر بەوە چییان دەست کەوت؟ دەتەوێ تۆش وەك ئەوانت دەست بکەوێت؟ ئەوەیان دەست کەوت کە کەس لەو سەردەمەی ئەواندا هیچیان بەدەست نەهێنا. سوارچاکەکان گەڕانەوە ئەوڕوپا، لە سوارچاکانی هەزارەوە بوون بە دەوڵەمەندترین کەسانی ئەوڕوپا، بگرە جیهانیش، بەڕادەیەك دەوڵەمەندبوون، پاشا و میرەکانیش قەرزیان لێدەکردن، پلەو پایەو کەسایەتییان لەنێو خەڵکیدا زۆر بەرزبووەوە. لەمێژووی خاچ پەرستاندا باشترین ڕێکخستنی سەربازی بوون، توانیان ڕێکخستنێکی وا ڕێکبخەن، بەو ڕێکخراوە توانیان لە هەڵمەتی خاچ پەرستاندا دەردێك بە موسوڵمانان بدەن، با بەدەواری شڕی نەکردبێت، وەلێ سەلاحەدین کە دەستبەسەریانی کرد، پێچەوانەی دەستبەسەرەکانی تر، وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەوتاوانانەی کە بەرامبەر موسوڵمانەکان کردبوویان هەموویان کوشت، هۆکاری تاوانەکەشیان هەڵبژاردنی دز و جەردەو پیاوکوژان بەو ئاواتەی ببن بە سوارچاك و تۆڵە لەموسوڵمانەکان بکەنەوە. ئەوەی خەڵکی نەیدەزانی بۆچی دەرگای کڵێسەکانیان لەسەر خۆیان کڵۆم دەدا. هەر ئێمەبووین هەموو شتێکمان دەربارەیان دەزانی، ئێمە ڕووناکیمان وێدان تا دەبن بە هەڵگری ئەو ڕووناکییە هەر وێیان دەدەین، بۆ ئەوەی بگەن بە ئەنتیخریستۆس.

لەپڕ هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرابوو، ئەوڕوپا لەم ڕیسواییەیدا بێدار بووەوە، هەواڵی دەستبەسەردا گرتنی سوارچاکەکان ئاشکرابوو، پاشا فیلیپ فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەرکردن. دوای ئەوەی دەوڵەمەندییەکەیان بی سنوور بوو لەبیانوویەك دەگەڕا تا لەناویان ببات، پاشا و میرەکان کەوتنە ژێر قەرزیانەوە، خۆدی پاشا فیلیپ تا ناقرگەی

قەرزاریان بوو، ناچار بوو بیانوویەك بۆ لەناوبردنیان بدۆزێتەوە، ئەوبوو فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەرکردن، گوایە سوارچاکەکان خەریکی جادووکردنن و بێڕێزی بەرامبەر خاچ دەکەن.

لەمێژووی ئەوروپادا ڕۆژی سێزدەهەمین هەینی ڕووداوێکی گرنگ بوو، لەسەر ڕێگای هاموشۆی پاریس سەکۆی تەختەدار دابەسترا، سوارچاکەکانیان بەسەر تەختە دارەکەوە دانا. خەڵکەکە کە بەو هەواڵەیان زانی، تووشی شۆك بوون، ئاخر ئەوان کوڕەکانی خۆیان خستبووە ئەو ڕێکخستنەوە، تا شەرەفی بەدەستهێنانی ئەو ڕووناکییەیان بەرکەوێت. وەلێ لەپڕ ئەستێرەیەلێك لەکوێربوونەوەدابوون، شەرەفیش بەسەر خاکا ڕژا، سەرکردەی سوارچاکەکان بەسەر سەکۆ دارەکەوە بوو، خەڵکێکی زۆر لە ماڵەکانیانەوە هاتنە دەرەوە بەرامبەر بە سووتاندنی سوارچاکەکان بە واقوڕماوییەوە ڕاوەستان، تا بەچاوی خۆیان ڕووداوەکە ببینن، خەڵکانێکیش چاویان بەرایی نەدەدا بیانبینن دەسووتێن. لێل فەرمانی پاشا، ئاگر لە دارەکان بەر درا.

هەراو زەنای خەڵکەکە لەگەڵ گڕدانی دارەکان بەرزەوەبوو، بێ ئەوەی گوزارشت لە شتێك بکات. فەرمانی پاشا فیلیپ بێ بیانوو نەبوو، بەهۆکارگەلێك فەرمانی سووتاندنی سەرکردەکانی سوارچاکان دابوون، کارکردنیان بە جادووی ڕەش و تف کردن لە خاچ و قسەی ناشرین بە پیاوانی ئاینیی و تاوانی نێربازی لەناو کڵێساکاندا و تاوانی ئامادەکردنی ڕۆحی ئەهریمەنەکان و تاوانی بەدرۆ خستنەوەی مەسیح. دوای ئەوەی پاشا فیلیپ دەستگیری کردن و ئەشکەنجەیەکی وای دان بەرگەی نەگرن، دانیان

بـە هـەموو تاوانەکانیانـدا هێنـا ، مردنیـان بـەلاوە باشـتر بـوو. کێشـەکە لەهەڵگیرسـانی ئـاگرێکی ئاسـایی لەلایـەن سـەربازەکانەوە نـەبوو، بـەپێی فەرمانی پاشا دەبێت ئاگرێکی وا بێت هێدی هێدی بیانسووتێنێت، چونکە خودی پاشا نەیدەویست زوو بمرن، دەیویست بـە ئازارکێشانەوە خەڵکەکە بیانبینن کە دەسووتێن.

لەتـەکما بـۆ کڵێسـاکە چـوویتە ژوورەوە، دەگەڕێینـەوە تـا ببیـنین، سەربازەکان خۆیان بە کڵێساکەدا کرد، هەرچی شتگەلی سوارچاکەکان بـوو، لەناویان برد. بەدووی هەموو شتێکدا گەڕان، تەنانەت دەستیان بۆ ئەو کەللە هیشککراوەی ناو سندووقی زیوینی نەخشکراویش برد، یەکێك لەسەربازەکان قێزی لێکردووە، تا دەستی گرتی تووڕی دام، کەوتمە ژێر پەیکـەری خاچێك دەمـەو خـوار کرابـووەوە. مەترسـە و تەماشـای چـاوم بکـە. سوارچـاکەکان هەموو ئـەو کتێبانـەی کـە لەچاڵکردنەکەدا دەریـان هێنـابوو، شـاردبووەوە. ئەوانەی پاشا دەستگیری کردبوون، هەموو سوارچاکەکان نـەبوون، نیوەیـان بوون، ئەوانی دی بۆ شوێنێك هەڵهاتن، دەسـتی پاشـایان نـەگاتێ، شـوێنێك بەسـەرکردایەتی (ویلیـەم والآس) بـۆ جیابوونـەوەو سـەربەخۆیی لەتـەك ئینگلتەرادا لە ململانێدا بوو. سوارەکان بەرەو ئۆسکۆتلەندا هەڵهاتن.

*******

تەواو

بەو جۆرە سێزدەهەمین هەینی بوو بە ڕۆژێکی شووم، وەلێ دوای ئەو کارەساتە من دەڵێم ڕۆژێکی دڵخۆشکەر بوو. چیرۆکی سوارچاکەکان لە کتێبەکانی مێژوودا ئاشکرایە بەڕۆژێکی شووم، بەزیندوییێتی سووتێنران، وەلێ لەکتێبە مێژووییە بییانییەکان دوودڵ دەبن ، هەر کە دەهاتە سەر ئەو شتەی کە نۆ سوارچاك لەبن عەرشی پیرۆزدا چاڵیان دەکرد تا بیدۆزنەوە. ئەو کتێبانە زۆر بەسەرهات و مەزەندەی بەدووی خۆیدا هێناوە، لەیەکێك لەو حیکایەتانە.. سوارەکان چاڵیان هەڵدەکەند و کتێبی جادووگەرییان دۆزیەوە. ئەوەی ئەم چیرۆکە بەڕاست دەخاتەوە، بوونی بەرامبەری لە تەفسیرەکانی قورئاندا هەیە، موفەسیرەکان لەسەر یەك ڕا کۆکبوون، لەئایەتی هاڕووت و ماڕووت کە لەقورئاندا هاتووە. ئەهریمەنەکان کتێبی جادووگەرییان لەژێر کورسییەکەی سولێماندا شاردبوونەوە، واتە لەژێر حەرەمی پیرۆز، دواتر خەڵکانێك پەیدا بوون، هەر شەیتانەکان بوون، وەلێ لەسەر شێوەی بنیادەم، شوێنی کتێبەکانیان پێگوتن، لەکوێ شاردراونەتەوە. کتێبەکانیان دەرهێنا، وەلێ موفەسیرەکان نەیانزانی ئەوانە کێ بوون، کە ئەهریمەنەکان ڕێیان نیشاندان. لەنێوان کتێبە مێژووییە بیانییەکان و تەفسیرە عەرەبییەکان ئەو ڕاستییەت بۆ دەردەکەوێت، کە ڕوویدا، وا ئەمڕۆ لەسەر زاری شەیتانی بەناوبانگ، کە سوارچاکەکان دەیانپەرست، بۆتی دەخەمە ڕوو، بافۆمیتی ئەهریمەن "شێوەی (بافۆمیت) بەلاتەوە ئاساییە، ئەو تەگەیەی[1] چوارمەشقی دانیشتووە و دەستێکی بەرز کردووەتەوە وئەوی تریانی داگرتووە، هەر ئەو تەگەیەیە کە کەللەسەری

---

[1] بزنی نێر.

دەخەنە نـاو ئەسـتێرەی داوودەوە، بـەو سـوئبوولەی شـەیتانی بـەناوبانگ کـرد". جادووگـەر( ئەلیسـتەر کـراولی)ی ئەهریمـەن پێیـانی گـوت.. ئـەوان دەستەی پەرستنی ئەهریمەن، کەچی پەرستیاری شەیتان( ئـەنتۆنی لیڤی) دەڵێت.. ئامادەکاری لە کەش و نەریتی سوارچاکەکاندا هەبوو.

خوداوەندی سوارچاکەکان بافۆمیتی شەیتان لە کەڤاڵێکی بەناوبانگدا و لـە نزرگاکەیانـدا بـۆ رێـز سـەرزیان کردووەتـەوە. واپێدەچێت ئـەو کتێبانـە سوارچـاکەکانیان فێـری زۆر شـت کردبێـت، وا دەوڵەمەنـد بوویـوون، لـە دەوڵەمەنـدەکانی ئـەورووپاش دەوڵەمەنـدتر، رێکخراوێکـی بـانکی جیهانیـان دامەزراند، قەرزیان بەهەمووان دەدا، تەنانەت قەرزی تایبەتیشیان بە پاشا و میر دەدا، لەبەر ئەوەی فایز (سوو) لە کڵێسەکانی کاتۆلیك حەرام بـوو، هـەر بۆ ئەوە فێڵێکیان داهێنا و ناویان لێنا کرێ یانە سەرانە.

سوارچاکەکان بەرەو ئۆسـکۆتلەندا هـەڵهاتن، چونکە تـەنها مەملەکـەت بـوو سـەر بـە کڵێسـای کاسـۆلیك نـەبوون. پاشـای ئۆسـکۆتلەندە (رۆبێـرت ئەلبرۆس) پێشوازی لێکردن، دەیزانـی باشـترین چـەکن شکسـت بـە ئینگلیـز بێـنن، بەوانـەوە توانیبیـان سـەربەخۆیی ئۆشـکۆتلەندە بەدەسـت بهێنـێن، بەوەش هەیبەتیان لە ئۆسکۆتلەندا پەیدا کرد، ئەوجا دووبـارە دەسـتیان بـە بیناکردنی نزرگەی تایبەت بـەخۆیان کـرد، بـەرەمزی شـەیتان رازاندیانـەوە، وەڵێ ئـەمجارە لـەوەی لـە ئینگلتـەرا تـەمێخواردوو بـوون، وایـانکرد رێکخستنەکانیان بەبەرچاوی خەڵکەوە نەبێت، بەنهێنی بێت، نـەبادا شـکیان پێبـەرن و ناوەکەشـیان گـۆڕی. نـاوی رێکخراوەکـەیان بەلاتـەوە ئاسـاییە( بنیاتنەرە ئازادەکان freemasons( ماسۆنییەکان).

لە ئۆسکۆتلەندا.. بەردەوامبوون لە نمایشکردنی ئەوەی لە ئینگلتەرا پێشتر نمایشیان دەکرد. ئەمڕۆ نەك لەکڵێساکان بەڵکو لەبینای تایبەت بە ناوی ئەنجوومەنی ماسۆنییەتەوە کۆدەبنەوە، کە لەناوەوە لەسەر شێوازی هەیکەلەکەی سولێمان درووستیان کردبوو. تەنها بالآخانەیە لە تەورات وەسفێکی وردی بۆ کراوە.

تێگەیشتن هێزیان لە نادیاریدایە، نەك ئاشکرایی. لەزانستی شەیتانیدا ئەوەی لای ئەوان بوو، لای کەسی تر نەبوو، خۆیان و ڕێکخراوەکەیان پێ پێشخست، فێری ئەوەش بوون کتێبەکان بشارنەوە، تا کەس گومانیان لێنەکات، فێری کۆد کردنیش بوون، کە پێشتر لەمێژوودا (کۆد) هەر نەزانراوە، بۆ پەرەپێدانی ڕێگایەکی تریان داهێنا بەناوی (گۆتیك) یانی ڕێبازی ئەهریمەن، کە بیناکانیان بەجوانترین شێواز دەنەخشێنرا، ئەو جوان ڕازاندنەوەشیان بۆ کۆکردنەوەی نهێنییەکانیان بوو، کۆدیان بەسەرەوە کردبوو، بێ کۆد کردنەوەی بۆ نەبوو، بەو شێوەیە زۆرێك لەباڵەخانە و ئەنجوومەن و کڵێسایان بنیات نا و لەهەموو ئەوڕوپا بلاّوبوونەوە. لەو ڕێبازەدا دەتوانیت ڕەمز و پەیکەرگەلێکی شەیتانی بۆ بافۆمیت و ئەو دوایان ببینیت، کەس لەمانای حاڵی نابێت، وادەزانن هەر بۆ جوانکارییە.

(بیناسازانی ئازاد)یان لەخۆیان نا، بەوای ئەو داهێنانەی بەو شێوازە سەرنج ڕاکێشە تەلاریان سازدەدا، سونبولی ڕێکخراوەکەشیان (ڕاستە و پەرگاڵ) بوو.

جاریکی تر (سوارچاکانی هەیکەل) بەوای ڕێکخراوە نهێنییە تازەکەیانەوە (ماسۆنییەت) بوون بە دەوڵەمەندترین دەوڵەمەندەکانی

ئەورووپا. شەیتان ناتوانێت لەزێڕ و پارە بەولاوەهەموو شتێکت بۆ مەیسەر بکات, نادیارییان نهێنی هێزیان بوو، کەسیش ناتوانێت شتی نادیار لەناوبەرێت.

دەربارەی ماسۆنییەت زۆر بیستراوە، وەلێ بەو وردەکارییە نا، ئەوەش بۆ خۆی مەبەستیانە. من بۆ خۆم پێشتر ماسۆنی بووم. ئەوە بە نهێنییەکی ترت زانی.

من پلەی بیست و یەکی ماسۆنیم. ماسۆنییەت سی و سێ پلەیە. هەر کە بە ئەندام لەماسۆنییەت وەرگیرام، فێری جادووگەرییان کردم و بووم بەجادووگەر. مەرج نییە هەرکەسێك لایەنگری ماسۆنییەت بێت ببێت بەجادووگەر، تەنها ئەوکەسانەی خۆیان مەبەستیانە بۆیان هەیە ببنە جادووگەر، بۆ خۆم یەکێك بووم لەوانەی هەڵبژێردرام بۆ جادووگەریی، ئەوەتا هەر هەمووم توورِ داوەتە پشتی خۆم، وا لێرە لەبەرامبەرت دانیشتووم، تا ڕاست و درووستیت پێبڵێم.

ماسۆنییەت.. بەکورتی شەرمەزاری نییە، ئەوەی سێزدەهەمی ئیسرائیلن، وەك دەزانیت، یا نازانیت، خودا جوولەکەی بۆ دوانزە بەش پەرت و بڵاوکردەوە، واتە دوانزە تیرە، هەر تیرەیەکیش سیستەمی تایبەتیان لەژیان و گوزەراندا هەیە، هەرچی ماسۆنییەتە کۆمەڵەیەکن لە جوولەکە، کە ئامانجیان هەڵوەشاندنەوەی ئەو دابەشکردنەیە، تا سەر لەنوێ لەژێر نازناوی جوولەکە هەموویان یەکخەنەوە.

کاری تیرەی سێزدەهەم لە قودس بیناکردنی هەیکەلی سولێمان بوو. لێم مەپرسە بۆچی ئەوە دەکەن، چونکە دواتر پێتیڕادەگەیێنم، نووکە

ئەوەی دەبێت بیزانیت، ئەهریمەنەکان وایان دەویست و دەبوو ئەوانیش فەرمانەکە جێ بەجێ بکەن. هەست دەکەم لەچاوانتەوە شۆخیت بە شتەکە دێت و گاڵتەت بەقسەکانم دێت! وەلێ پەلە مەکە، دواجار هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە.

بزانە ماسۆنییەت و کابالا هەردووکیان یەك شتن. کابالا.. نهێنیی سەرزارەکی جوولەکەیە، جوولەکەکان پێیان وایە خودا پەیامی سەرزارەکیی بە موسا داوە، لەبەر ئەوەی نهێنی بووە، نەینووسیوەتەوە، بەڵکو زۆرترین لایەنگرانیان هەر بەسەرزارەکییەوە پێیان ڕاگەیاندوون. لە کابالا سی و دوو پلەی پەند و فەلسەفەیان هەیە، هەر کەسێك لەسەری بڕوات، لەکۆتاییدا دەتوانێت بەخودا بگات، بۆیە ماسۆنییەتیش بوو بە سی و دوو پلە، پلەی سی و سێ پلەی شکۆدارییە، بۆ بەرزبوونەوەش بۆ ئەو پلەیە، لەناو تیرە گەورەکەی سێزدەهەمی جووەوە ناو نووسین ئەنجام دەدرێت.

بۆیە بووم بەجادووگەر، ئەو ڕێگاو ڕێبازەشم کە گرتە بەر، زانیارییەکی نۆر و زەبەندی تێدابوو، بۆ نموونە .. نهێنییەك لە گەورەترین نهێنییەکانی کابالا لە پلەی نۆزدەهەمیندا فێری بووم، کوشتنی خەڵکی بە یەك تەماشادا کردن! ئەوەش بە چاوی شەڕ ناسراوە، سەرچاوەکەشی لەئێرەییەوەیە. چاو و ئێرەیی بردن دەتوانن زیان بە مەردووم بگەیێنن. وەلێ چۆن دەتوانیت ئەو هێزە دەستەبەر بکەیت، چۆنیش بتوانیت دەسەڵاتت بەتەواوی بەسەریا بشکێت. ئەوەبوو پەرۆشی فێربوونی کردم.

ڕێکخراوێکی نۆر لە ماسۆنییەتەوە بڵاو بۆتەوە، ئەڵبەتە بیستووتە.. خاچی پەمەییان ڕۆز کرۆشن (Rosicrucianism) کەڵلەسەر و

## ئەنتیخریستۆس

ئێسکەکان، کوکلوکس کلان (KKK)، ئیلۆمیناتی (illuminatus)، بۆ هەر ڕێکخراوێکیش چالاکی تایبەت هەیە، وەلێ هەر هەمووشیان بۆ سەرچاوەی ماسۆنییەت و ڕێکخراوی سوارچاکەکانی نزرگای کۆن دەگەڕانەوە.

ئێستا سێ کارتی تازەم هەیە، لەسەر مێزەکەی بەرامبەرت دامناون، گەمە نەفرەتلێکراوەکەمان لەتەك ئەهریمەنەکان تەواو دەکەین.

**کارتی یەکەم..** کارتی پەرداخی پیرۆز، کە ڕەمزە بۆ عیسای مەسیح لەسەر مێزی دوایین خوانی شامدا وێنەی پەرداخە پیرۆزەکەی بەسەرەوەیە.

**کارتی دووەم..** کارتی خەنجەری پیرۆز(خەڕبە)، کە وێنەی خەنجەری پیرۆزی بەسەرەوەیە و لە قەپرغەی مەسیح بەسەر خاچەکەیەوە چەقیوە، تا بێگومان بن لەمردنی.

**کارتی سێیەم..** کارتی جیهادە، وێنەی خەباتگێڕانی موسوڵمانانی بەسەرەوەیە.

ئەم بەسەرهاتە ئەهریمەنێك لەو حەوت ئەهریمەنە بۆتی دەگێڕێتەوە، کە چاودێریمان دەکەن. ئەوەی لەسەر تۆیە بێدەنگی و گوێگرتنە، لە جادووگەری و ماسۆنیەت گشت ئەم زاراوە تاریکانەی لەجیهانێکی تردان دوورمان دەخاتەوە، جیهانێك ڕەنگە زۆر لەوانەی پێشووتر تاریکتر بێت.

*********

تەواو

## بەشی چوارەم

# نایابترین جۆری ژەهر

## ٤٠٠ پێش زایین- ٦٦٠ پاش زایین

بە دیقەتێکی وردەوە لەنەخشەی جیهانی خۆت دەڕوانیت، کون و کەلەبەری بە دووی مندا دەگەڕێیت و نامدۆزیتەوە. ئەگەرچی جیهانەکەت بە تەواوی سووتاوە، وەلێ هەر نامدۆزیتەوە. تۆ لەنەخشەی هەڵەدا چاو دەگێڕیت. ئەو نەخشەیە کە جوگرافیاییە وەلای دەنێیت، نەخشەیەکی دی هەڵدەدەیتەوە، کە نەخشەی مێژووییە، ئەوجا پێت دەڵێم نەخشەی ڕاستت هەڵبژارد، وەلێ هەر نامدۆزیتەوە. لێرەوە بڕیارێکی تر دەدەیت، کۆمپیوتەرەکەت پێدەکەیت، چاو لەتەختەی بیندەرەکە دەبڕیت، نەخشەی مێژووت بۆ دێتە سەر بیندەرەکە، و شتێکی سەیر بەسەر نەخشەکە بریسکەی ئاگرێك دەردەکەوێت، تۆش چاوت لە ئاگرەکە بڕی. ئێستا دەمبینیت، بەسەر نەخشەی جیهانەکەتەوە هەڵدەکشێم، سەرەتا بچووکم و بە بەرکەوتنی یەك خاڵی سەر نەخشەکەت وەبەر کەڵبەکانم دەکەومە هەڵلووشینی دەورو بەری خۆم تا گەورەتر دەبم، ئەوجا بەچوار لاوە هەڵدەکشێم، هی دی لووش دەکەم، گەورەتر و گەورەتر دەبم، هەڵدەکشێم،

تا بەقەد نەخشەکە گەورە بم، هەڵدەکشێم ئاگر لەو ناوە بەردەدەم، ژار لە کەڵبەکانمەوە دەنێم بەو شوێنەی بەرەو ژوورتر هەڵدەکشێم، ئێستا زانیت لەکێ دەڕوانیت، لە(سێربینت)ی مار دەڕوانیت.

هەوەڵ هەڵکشانەکەم لە (بابل)ەوە بوو، خاکی نەفرەتلێکراو، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ چوارسەد ساڵ بەر لەوەی مەسیح لەدایکبێت. جوولەکەیەکی زۆر هەبوون لەفەلەستین ئاوارەبوون، وەك كۆیلەی زەلیل و داماو بەرەو (بابل)یان بردن، چون ئەوەی تۆڵەیان لێ بکەنەوە، ڕقیان لەخۆیان و ئایینەکەیان و خواکەشیان بووەوە، تەوڕاتیان بەدەستەوەبوو، دوای ئەوەی لەدڵیاندا کەوت، ئێدی باوەڕیان بەو هەموو پەیمانانەی خواکەیان نەما کە وێیدابوون نووکە کۆیلەن. ژنیان حەڵاڵە و خوێنیشیان حەڵاڵە. مەملەکەتیان وێرانبوو، تەنانەت خەون و پیرۆزییەکانیشیان وێرانبوو، ما بەو حەسرەتەوە لەژێر پێی خەڵکە بیانی و دڵڕەقەکەی بابل کاربکەن. خاکیان سووتا، دڵیان سووتا، ناموسیشیان لەدەستچوو.

لەپڕ ئومێدیان لێ دەرکەوتەوە. ئەو هەورە ڕەشەی بابلییەکان کە مێژوویانی کوێر کردبووەوە، لە ڕەواندنەوەدا بوو، مەملەکەتی بابل لەسەر دەستی مەملەکەتی فارس شکستی هێنا، فارسەکان لێگەڕان جوولەکەکان بۆ مەملەکەتەکەی خۆیان بگەڕێنەوە. بەر لەوەی بێنەوە سەرخۆیان، بگەڕێنەوە لای تەوڕاتی خواکەیان، دەمم تەواو لێ پان کردنەوە، تا توانیم ژەهری شەیتانی خۆمم بەدڵیاندا کرد، دڵە نەخۆشەکانیان لێیان وەرگرتم، پیاو ماقووڵانیان کۆ بوونەوە، بە کتێبێکی پیرۆزی تازە لە تەوڕات هاتنە دەرەوە، توندترین دانووستان و بیرکردنەوەیان تیادا نووسی، کە بە ژەهری

سەختی من ئاوێتەیان کرد. تەلمود. وەك ئەهریمەنێکی یاخی دەرکەوت و تەوراتیشی خستە ژێر پێیەوە. گوتیان (تەلمود) نهێنییە سەرزارەکییەکەیە کە موسا لەخودای وەرگرت، بەم نهێنییە سەرزارەکییەشیان دەگوت.. کابالا، ئەوجا موسا ( کابالا)ی، بەلایەنگرە تایبەتەکانی دا، ئەوانیش بۆ لایەنگری تایبەتی تریان شۆڕ کردەوە، تا تایبەتمەندی تایبەتمەندترینەکانیان بۆ ئەوەی ون نەبێت بیياننووسنەوە، ئەوەی نووسرابوو، بوو بە کتێبی تەلمود. زۆر جوانە کەسانێکی دڵسۆز بە بیروباوەڕت هەبن کە تۆ متمانەیان پێدەکەیت لەدڵیانی بنێیت. پێمخۆشە سەرکەومە سەر ئەو سەکۆ پیرۆزە و چاو لەو (تەلمود)ە ببڕم کە زۆر بەوریاییەوە دانراوە، حەز دەکەم بیخوێنمەوە.

((خودا لەوەدا نەماوە گەمە لەتەك نەهەنگدا بکات، سەماش لەتەك حەوادا ناکات، کە پێیخۆشبوو. لەوەدا نەماوە گەمە بکات، یان سەما بکات، بوو بە هۆکاری وێرانەیی (هەیکەل). هەموو شەوێك وەك شێر دەیەنەڕاند و دەیگوت، وەی لەخۆم ماڵی خۆمم وێران کرد، لێگەڕام (هەیکەل)ەلەکەشم وێران بێت، وەلێ سەبرتان بێت هۆ جوولەکە خودا ئەوەی پێیە کە دڵخۆشتان دەکات، سەبرتان بێت فریادگوزاری بە ئەمەك بەڕێوەیە، لە تاریکییەوە دێت، هەیکەلەکەی خودا بنیات دەنێتەوە، وەلێ ئەی جوولەکە هاوپشتتان نایەت تا حوکمی ئەو گۆییمانە[1] تەواو نەبێت، ئەی جوولەکەییە.. هەر خۆتان بنیادەمن، ئەوەی لەئێوە نەبێت بنیادەم نییە، گۆییمن؟ خودا گۆییمەکانی بۆ خزمەتکردنی ئێوە ئەفراندووە، وەلێ لەسەر شێوەی بنیادەم

---

[1] هەر میلەتێکی غەیری جولەکە.

دایهێناون تا کارەکانتان بۆ مەیسەر بکەن و لەخزمەتتاندا بن، چاك بزانن کوشتنی ئەو بنیادەمە گۆییمانە قوربانییە بۆ خودا، ئەگەر لەوانە یەکێکتان بینی کەوتە چاڵەوە تا دەمرێت چاڵەکە بە پڕ بکەنەوە، ئەی ئافرەتانی جوو ئێوەش بزانن ئەگەر یەکێکتان لە گەرماوەوە دەرچوو، سەگێك یا گوێدرێژێك یا بەرازێك تەنانەت مارمێلکەیەکیشی بینی، ئەوا پێش بوو، دەبێت بگەڕێتەوە گەرماوەکە و دووبارە خۆی بشوات. ئەی جوولەکە ئەگەر یەکێکتان پزیشکێکی زیرەك بوو، ئەو گۆییمانە چارەسەر نەکات، خۆ ئەگەر پزیشکێکی نەزان و بێ ئەزموون بوو، با چارەسەریان بکات، بەڵکو بەوای چارەسەرکردنەکەی ڕاستەوە نەبێت.))

((بزانە یەسوعی ناسری منداڵێکی زۆڵە، دایکی بە بێ نوێژی و داوێنپیسی سکی پێ پڕ بوو، یەسوعی ناسری درۆزنە، شێتە، سیحرباز و جادووگەرە، بتپەرستە و هێڕ و گێژە، بزانن کەشیشە مەسیحییەکان داوێن پیسن. قەشەکانیش نێرەمووکن، کڵێساکانیش قەحپەخانەن))

ئەی جوولەکە.. کاتێ پیاوێکی کامڵ کچێکی بچووك مارە دەکات، هیچی تێدا نییە، تەنانەت ئەگەر تەمەنیشی سێ ساڵان بێت، بابەتەکە وەك ئەوە وایە پەنجە بکەی بەچاوا، ئەگەر نێرینەیەك لەگەڵ منداڵێك نێربازی بکات، ئەوە کاری سێکسی نییە، گوناهێکی ئەوەندە گەورە نییە لێی بترسی))

نەمزانی ژارەکەم لەدڵیاندا جێی خۆی کردەوە، بەڕاستی نەوەی ئیسرائیل سەرسامیان کردم. خواکەیان لەتەوراتی کۆن پەیمانی وێدابوون دوای ئەوەی لەوڵاتی خۆیان دەربەدەر دەکرێن، جارێکی تر خاکەکەیان

بەدەست دێننەوە و مەسیح دادەبەزێت و لەعەرشی (داوود)ەوە بەیەکسانی فەرمانڕەوایی هەموو جیهان دەکات. کاتێ پەیمانەکەی خواکەیان دێتە دی بابل شکست دێنێت و جوولەکە دەگەڕێنەوە فەلەستین و مزگەوتی ئەقسا نۆژەن دەکەنەوە. ئەو مزگەوتەی باوکی بنیادەم (ئادەم) دروستی کرد و پێغەمبەران ئیبراهیم و ئیسحاق و یاقووب نوێژیان تێدا کرد، دواتر سولێمان نۆژەنی کردەوە. ئێدی جوولەکەکان نۆژەنتری دەکەنەوە و بە عەرشی داوود یا هەیکەل ناودێری دەکەن. ئەودەم مەسیح دێتە خوارەوە و لەو عەرشەوە بەیەکسانی فەرمانڕەوایی هەموو جیهان دەکات.

هەر کە مەسیح( عیسای کوڕی مەریم) دابەزییە ناویان، ڕەتیان کردەوە و گوتیان ئەوە زۆڵە، کاتێکیش بەچاوی خۆیان بینیان بەسەر خاچەوە گیانی لەدەست دا، وتیان ئەوە ساختەچییە.. مرد و بەسەر عەرشی (داوود)ەوە و بەو پەیامەی کە حوکمی هەموو دنیا بکات، نەگەیشت. نەیانزانی پێغەمبەر عیسا کە ڕەوانەی ناویان کرا ئەوەی لەتەوراتدا هاتبوو، مەسیحی ڕاستەقینە بوو، نەشیانزانی بەسەر خاچەکەوە نەمرد، بەڵکو خودا بۆ ئاسمان هەڵیکێشا. لەکۆتایی دنیادا دادەبەزێتەوە سەر زەوی و هەر لە فەڵەستین و بەسەر عەرشی (داوود)ەوە حوکمی هەموو دنیا دەکات کەس بەوەی نەزانی.

گوتیان ئەوەی باوەڕی بەتەورات هەبێت و باوەڕی بە (تەلموود) نەبێت ئەوا باوەڕ پێکراو نییە، تەلموود زۆر لەتەورات پیرۆزترە، چونکە نهێنییە سەرزارەکییەکانی لەخۆ پاراستووە، لەبەرامبەردا تەورات نووسراوەیە. کەس نەیدەزانی هەر لەبنەڕەتەوە هیچ نهێنییەك نەبووە، بەڵکو ئەوە غایەلەی

شەیتان بوو لەمزریاندا، ژەهری ماریی خۆی خستە دڵیانەوە. (سێرپێنت)ی شەیتان خۆی خزاندە وڵاتەکەیان و تا تێری لێ خوارد، خواردی، دواتر بەدوای دڵێلێکی تر لە دێیەکاندا دەگەڕا. ئەو مارەش من بووم.

دوای چەندین ساڵ لە کۆچی(عیسای کوڕی مەریەم) بە ژارەکەی خۆمەوە بۆ ئۆرشەلیم گەڕامەوە. پەیامبەرانی عیسا دەستیان بە بڵاوکردنەوەی ئینجیل کرد، کە بانگەشەی خۆشەویستی و یەکسانی لەنێو خەڵکدا دەکات، تەوڕاتی جوولەکەش کە بۆ موسا دابەزی ، هەمان ڕای لەسەر عیسا هەبوو، عیساش مژدەی پێغەمبەرێکی دوای خۆی بەناوی محەممەدەوە ڕاگەیاند،. ما نەوەکانی عیسا بەرپەرچدانەوەی هەموو ژارەکانم بکەن، کە لە (تەلموود)ی جوو بڵاوم کردبووەوە. هەروەك چۆن ژارەکەم کاریگەریی بەسەر لایەنگرانی تەوڕاتەوە هەبوو، بۆیە هەر بەو شێوەیە، دەمویست کاریگەریی بەسەر لایەنگرانی (ئینجیل)یشەوە هەبێت.

لەپڕ پیاوێك بەناوی (شائوول)ەوە لەنێو حەوارییەکاندا قیتەوە بوو، سام دایگرتن. شائول. پیاوێکی بەهێزی جوو بوو، لە لایەن گەورەپیاوانی جوووەوە بۆ دەستگیرکردنی حەوارییەکان بە زیندوویی یا مردوویی ڕاسپێردرابوو. پیاوێك لەلایەن کۆمەڵەی جوولەکەوە نێردرابوو، ئەو کۆمەڵەیەی کە بۆ کوشتنی شوێن کەوتووان و حەوارییەکان و لەناوردنی بیروباوەڕی مەسیحییەت دامەزرا پاشاکانی ڕۆمان سەرپەرشتی ئەم کۆمەڵەیان دەکرد، حەوارییەکان لەترسا نەیانزانی چی بکەن، وەلێ چاویان ئەبڵەق بوو، کاتێ شائول گوتی:

- من قینم (رق) لێتان دەبووەوە، بۆیە بەردەوام چاودێریتانم دەکرد، تەنانەت سەربڕینیشتان دڵی دانەدەمرکاندمەوە. وەلێ ڕووناکییەکی مەزن لە ئاسمانەوە پێم گەیشت، دەنگێك بە گوێمدا هات، دەنگێك چون ئەوەی دنیا بێدار بکاتەوە، پێی گوتم.. ((ئەی شائوول، تۆ بۆچی شوێنکەوتوانم ئازار دەدەیت؟)) دەبێ بڕۆیت بۆ دیمەشق، و لەوێ پێتدەڵێم چی بکەیت، ئەو ڕووناکییەی بۆم هات عیسا بوو. وا هاتووم چونکە باوەڕم بە عیسا هێنا، نامەوێ کافر بم، بۆ ئاشتی هاتووم، نەك بۆ کوشتن.

حەوارییەکانی عیسا واقیان وڕمابوو، هێشتا شۆکی ڕاچڵەکین بەرامبەر شائوول بەریانی نەدابوو، چونکە زۆرترین کات ئازاری دابوون، وەلێ (برنابا) نێوەندگیرییانی کرد، ما گوێی لێ بگرن، ئەوجا ژارەکەی پەرداخی نەسرانییەتی پڕ کرد، تا لێی ڕژا و بەسەر زەویدا جۆگەلەی بەست. لەتەکیاندا گوێی لە قسەکانی شائوول گرت، کە ناوی پیرۆزی بوو بە (پۆلس) و ئێدی بوو بەوەرگری ڕاستەوخۆی پەیامی مەسیح(عیسا) و لەسەر زەوی بڕیار لەسەر جێگرەوەی عیسا بە پۆلس درا.

خودا یەکەو نابێت بەدوو، لە پەیامی مەسیح وا هاتووە خودا شەریکی نییە، وەلێ لە پەیامی پۆلس سیانن، خودا و عیسا و ڕوحی پیرۆز.

لەپەیامی مەسیحدا هاتووە، هیچ شتێك نییە لەخودا بچێت، وەلێ لە پەیامی شائوول خودا باوکە و عیساش کوڕێتی.

شەرعی خودا لەتەوڕات بەناوی(نامووس)ەوە هاتوو، یانی یاسا و ڕێسا، لەو شەرعەدا مەی و گۆشتی بەراز و مردارەوەبووی حەڕام کردووە و نوێژ و ڕۆژووشی فەرز کردووە. هەموو ئەو قەدەغەکراوانە لەپەیامی پۆلس ڕێگا

پێدراوبوو، هیچ ئەرك و فەرمانێكی تێدا نەبوو، لای پۆڵس نوێژ و ڕۆژوو نەبوو، تەنها و تەنها باوەڕكردن بوو، باوەڕ بەخودا و كوڕی خودا و ڕۆحی پیرۆز، كە بە سیانەی پیرۆز ناوبانگی دەركردووە.

هەندێك لە حەوارییەكانی مەسیح باوەڕیان بە پۆڵس نەهێنا و ئینكاریان كرد، كەچی هەندێكی تریان باوەڕیان پێ هێنا، وەلێ زۆرینەی زۆریان ڕایان لەگەڵیدا نەبوو، بۆ ڕەتكردنەوەی ئەو یاسا و ڕێسایەی لە تەوراتدا هاتبوو. مەسیحییەت بوو بە چەند تایەفەیەك، بۆ ماوەی سێ سەدە لەنێوانیاندا ڕیككەوتنێك هەبوو، لەماوەی ئەو سێ سەدەیە هەرچەند ئینجیلم دەكردەوە و دەمخوێند قسەی سەیرم لا ئاشكرا دەبوو.. پێغەمبەر (لووت) دوو كچی هەبوو، (مەی)یان دەرخواردی باوكیان دەدا، لەبەردەمیشیا خۆیان نمایش دەكرد، تا حاڵ گەیشتە ئەوەی لەتەكیاندا بخەوێت، (لووت) لەو كچانەی زۆڵی خستەوە.

یەك لە كوڕەكانی (یاقووب) كە ناوی (ڕۆبن)بوو، سێكسی لەسەربانی ماڵ لەتەك دایكیدا دەكرد.

یەهوزا بەڕەچەڵەك جوو بوو، ئارەزووی دەچێتە سەر بووكەكەی خۆی، ڕۆژێ لەسەرە ڕێگادا ڕێی پێدەگرێت و سواری دەبێت، لە بووكەكەی بڕێ منداڵی زۆڵ دەخاتەوە.

لە ئینجیلدا زینای حەڕام كراو هاتووە، وەلێ ئەوە ئینجیل نییە كە ئەو باسانەی تێدا هاتووە، ئەوە نووسراوی ئەو كەسانەیە كە من ژارم لەدڵیاندا ڕۆ كرد، لە پێنووسەكانیانم ڕۆ كرد.

ئەوجا ئیمپڕاتۆری خواوەندپەرستی ڕۆمانی (قوستەنتین) هات و گەورە پیاوانی تایەفەکانی مەسیحی بۆ یەکخستنی ڕا جیاوازەکانیان لە (نیقییە) کۆکردەوە، بەو بۆنەوە خواوەندی مەسیحی خستە دەنگدانەوە، هەر تایەفەیەك ڕا و بۆچوونی خۆی دا، کۆبوونەوەکە بە بڕیارێکی فەرمی کۆتایی هات، عیسا خواوەندێکە لەتەك خودادا و کوڕی خوداشە. ئەوە بەسبوو کە ژارەکە چووە دڵیانەوە، دوای ئەوەی باوەڕیان بە یەکبوونی خودا هەبوو، بە نۆشکردنی ژارەکە (شەریك) هاوبەشیان بۆ خودا درووستکرد، هەموو شەرعی خودا بە حەڵاڵ و حەڕامیەوە ڕەتکرایەوە. قەد ژەهری وا کاریگەرتان بینیوە؟

عیسای پێغەمبەر لەپڕ دەبێت بە کوڕی خودا و خواوەند لەتەك خودادا، یاسا و ڕێساکە ڕەتکرایەوە، گشت ئەمانە لەدەمی جوولەکەیەکەوە دەرچوو، کە لەژیانیدا مەسیحیشی هەر نەبینیوە. پیاوێك بەدوای حەوارییەکانی دەگەڕا بیانکوژێت، لەشەو و ڕۆژێکدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕووناکییەك لە ئاسمانەوە دابەزیووەتە لای. ئەو ڕووناکییە عیسا بووە، عیسا هەر پێغەمبەر نەبووە، خواوەند بووە و کوڕی خوداشە. داوێن پیسیی ناڕەوا لە کتێبی ئینجیلی خودا دا هاتووە، کە پێغەمبەرانی خودا و کوڕەکانی ئەو داوێنپیسییەیان کردووە. کەسێکی بتپەرستی ڕۆمانی پرۆسەی دەنگدان لەسەر خوداوەندی مەسیح دەدات، ئەوانیش دەنگی لەسەر دەدەن، وەك ئەوەی لە هەڵبژاردندا بن. خەوش لەعەقڵی خەڵکەکەدا نەبوو، بەڵکو لەدڵیاندا بوو.

بەو جۆرە هەموو ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە خودا بۆ مەردووم دایگرتبوونە سەر زەوی بەتەواوی هەڵوەشانەوە. گەڕامەوە سەر نەخشەی جیهان، کەوتمە گەڕان بەدوای دڵانی تر، دوای سێ سەد ساڵ لەو کۆبوونەوەیە دۆزیمەوە. لەپڕ ئێمەی ئەهریمەن لەو فریشتانەی گوێ قووڵاغی هەواڵەکانی ئاسمان دەبوون، باسیان لە ڕووداوێکی فرە مەزن دەکرد، کە لەسەر زەوی ڕوو دەدات، ڕووداوێک سەرلەبەری شتەکان دەگۆڕێت، مەزەندەی ئەو ڕووداوەم دەکرد و چاوەڕوانی بووم، هەر هەمووشمان چاوەڕوانی بووین، گۆی زەوی لە پێشوازی لەدایکبوونێکی نوێدا بوو، لەدایکبوونی محەممەد.

ئەوەی لەو پیاوە بینیم، هەمووتەمەنم نەمبینیبوو، بەر لەدایکبوونی بە دوو مانگ ڕووداوێکی ئەفسانەیی ڕوویدا، چەندین سەدە شتی وا ڕووی نەدابوو. ئاسمانی مەکە هەرهەمووی باڵندە بوو، بەشێوەیەک ئاسمانمان لێوە دیار نەبوو، جۆرێک بوون لەباڵندە شتی وامان پێشتر هەرگیز نەبینیبوو، باڵندەیەک بەقەبارەی باز، ملیان درێژ و پێیان سوور، کە دواتر ناوی سیمرغیان لێ نان. ئاسمانی مەکە یەکپارچە سیمرغ بوو، هەر باڵدارێکیش بە دەنووکی بەردێکی چکۆڵەی هەڵگرتبوو، هەروەسا بە قاچەکانیشییەوە. لەخاکی مەکە سوپایەکی گەورە لەیەمەنەوە بە فیلەوە هاتبوو کەعبە بڕووخێنێت، دیمەنەکە ئەفسانەیی بوو،، چەکدارانی سوپاکەش لەو باڵدارانە واقیان وڕمابوو، بەترسەوە لە ئاسمانیان دەڕوانی، فیلەکانیش شڵەژابوون، لەیەکرا باڵدارەکان کەوتنە بەردباران کردنیان، بەردەکان بچووکبوون، وەلێ هەر کە بەر جەستەیان دەکەوت، وەک تیر

جەستەیان دەبڕی. ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوەیش مایەوە پارچە پارچە لە لەشی بەردەبووەوە تا وەك جووجەڵەیەکی سەربڕاوی لێدەهات.

بۆ بیستنی هەواڵەکە بەرەو ئاسمان وەك چۆن لەدێر زەمانەوە ڕاهاتبووین تێمانتەقاند، وەلێ شتێك لە ئاسمانا وەك خۆی نەمابوو، بەسەرسوڕمایەوە تەماشای یەکمان کرد و بەرەو سەرووتر هەڵفڕین، لەپڕ چاومان بە تەنی گڕاوی کەوت بەسەرمانا دەکەوتن، هەولی هەڵهاتنمان دا، وەلێ سووتاندیانین و دابەزینەوە سەر زەوی، پێدەچوو دەسەلاتداریمان بەسەر بچێت، سەردەمی خواوەندێکی تر هاتە کایەوە، سەردەمی محەممەد.

خاکی مەککە کەوتە لەرزین، سێ سەد و شەست بتی بە مێخ[1] هەڵواسراوەوە بە دیواری مەکەوە سەربەرەو خوار کەوتنە خوارەوە. ئاگری فارس کوژایەوە، ئەوی دەپەرسترا، بەر لەهەزار ساڵ هەر ئەو ئاگرە بوو کە بەردەوام لەلایەن کاهینەکانەوە هەڵدەکرا، ئەورۆ کوژایەوە. ئێمەی ئەهریمەن خۆمان گەیاندە لای ماڵی دایکی تا لەدایکبوونی سەح بکەینەوە، لەوێ ئەوەی دیتمان باوەڕمان نەکرد، لەساتێکدا مەریمی کچی عومران و ئاسیای ژنی فەرعۆن و ژنێکی تر کە لەجوانیادا شتی وامان نەدیبوو، هەر هەموویان بەدیار ئامینەی دایکی محەممەدەوە وەستابوون، چاوەڕوانی لەدایکبوونی محەممەدیان دەکرد، سەرمان لەوە سوڕما چۆن ئەمانە بێرە گەیشتن، هەر کە هاتە دنیاوە، چاوەڕوانی قونجرکی ئەهریمەن بووین، تا بیخاتە گریان، لێ شەیتان نەهات، محەممەد بێ گریە لەدایك بوو، دواتر ئەهریمەن پێی گوتین کە زاتی نزیکبوونەوەی لە محەممەد نەکردووە، بە

---

[1] بزمار ، سنگ.

سەرسوڕماوییەوە دیقەتی یەکترمان دا. ئەوەی ڕۆیی و بوو بەڕابردوو شتێك بوو، وەلێ ئەمەی ئەوڕۆ شتێکی ترە، جیاوازە لە هەموو ڕووداوەکان. هەرچی ژارم بوو لەخۆمدا گوشیم، بەجەستەکەوە خۆم خزاندە مەککە و زانیم هەر لەوێ دەمێنمەوە.

ساڵان ڕۆیی و تێپەڕی محەممەدی پێغەمبەر سەریهەڵدا. ئەو پیاوە هەرچی ژەهرم ژەندبووە سەر گۆی زەوی تەنها بە گوتنی ڕاستییەکان هەر هەمووی پووچەڵکردەوە. ئەو گوتبووی.. ئیبراهیم و موسا و عیسا بانگەشەی یەك ئاییني خودایان دەکرد. جوولەکەش وازیان لەکتێبی تەورات هێنا و بەمەزەندەی خۆیان تەوراتێکیان لەدرۆ هەڵچنی، نەسرانییەکان مەسیحی پێغەمبەری خودایان کرد بە کوڕی خودا و خوداوەند، کە خودا بۆ خۆی یەکە و نە لەدایکبووی هەیە و نەیش دەبێت. هەر محەممەد گوتبووی.. نەسرانییەکان بە دڵی خۆیان دەستکاری ئینجیلیان کردووەو نووسیویانەتەوە، عیسا نەمردووە و خودا بۆ ئاسمان هەڵیکێشاوە و لەکۆتایی زەماندا دەگەڕێتەوە تا پەیامەکەی بەجێ بگەیێنێت و فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکات، شەرع و یاسا و ڕێسای خودا دابهێنێتەوە کە نەسرانییەکان شێواندبوویان. سولێمان لەو تاوانەی جادووگەریی کە جوولەکەکان نابوویانە پاڵی بەری بکات و بە پێغەمبەری خودا ناوی دەبات، بەفەرمانی خوداش بنیادەم و جنۆکە و باڵدار و چوارپێی و (با) ی خستبووە ژێر دەسەڵاتییەوە. هەرچی دەوڵەتی محەممەد بوو کە دوورگەی عەرەبی نەبواردبوو، وەلێ پیاوێلێکی دوای خۆی خستبوو کە دەیانتوانی فەتحی هەموو جیهان بکەن، پیاوێلێك تەنانەت ئەهریمەنەکانیش پێیان نەدەوێران،

بۆیە هیچ ڕێگا چارەیەکمان نەبوو بۆ شکستهێنانیان تەنها بەکوشتنیان نەبێت، لەسەرووشیانەوە محەممەد.

خۆم خزاندە قەراخ شار، ڕێک بۆ ناو گەڕەکی جوولەکەکان، دوای ئەوەی دڵیانم ژاراوی کرد، لەناویان دەرچووم. ئافرەتێکی جوو مەڕێکی سەر بڕی و برژاندی، بەدیاری دایە پێغەمبەر محەممەد و ئەسحابەکانی. ئەو ئافرەتە جووە لە پیاو ماقووڵانی جوولەکەی پرسیبوو، کاریگەرترین ژەهری کوشندەی بۆ بێنن، دواتر پرسیاری حەزی پێغەمبەر محەممەد لەگۆشتخواردندا لەکوێی مەڕدایە، پێیان ڕاگەیاند، باڵەکەیەتی[1]، زۆرترین ژەهرەکەی بە دەستی مەڕە برژاوەکەوە کرد. پێغەمبەر محەممەد دیارییەکەی قبووڵکرد و لێل ئەسحابەکانی دەستیان بەخواردن کرد، پێغەمبەر پێش ئەوان دەستی برد و پارووییەکی لە دەستی مەڕە برژاوەکە خوارد، ئەسحابەکان ویستیان دەست بۆ گۆشتەکە بەرن، پێغەمبەر نەیهێشت و گوتی:

- دەست بکێشنەوە، گۆشتەکە پێمی ڕاگەیاند کە ژەهراوی کراوە..!

ژەهرەکەم کاری خۆی کرد، زانیم ئەو پارووە گۆشتە ژاراوییە بەسبوو بۆ کووشتنی محەممەد نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکی زۆر سەخت، سێ ساڵ بەدەمییەوە دەیناڵاند. لەسەرەمەرگدا گوتی:

- ژەهری ئەو گۆشتەم هەر تیا ماوە، لەشادەمارم دەخات.

---

[1] قۆڵ، باسک.

بەو هۆیە ڕێگام بۆ کرایەوە زۆرترین ژەهر بڕێژم. زۆر هەوڵمدا بەهەموو توانامەوە ئایینی محەممەد بلەوتێنم، وەلێ محەممەد شتێکی دوای خۆی جێهێشبوو ژاراوی نەکرێت، هیچ شتێك نەما ڕوون و ئاشکرای نەکردبێت، دڵی ئەسحابەکانی وەك پۆلا وابوو، گرفتی هەرە گەورەش ئەوەبوو خودا بە پێغەمەبری ڕاگەیاندبوو قورئان ئەزبەر بکرێت، هیچ ڕێگا چارەیەکمان لەبەردەمدا نەما بۆ بەلادا ڕێ بردن، هەرچی هەبوو لە قورئاندا باسی لێوە کرابوو. ئەوە من نیم ژارم کاری خۆی نەکات، گەڕام و گەڕام تا درزێکم دۆزییەوە. هەردوو سەحابەی پێغەمبەر ( ئەبوبەکر) و (عومەر) کۆچی دواییان کرد، دوای ئەوان دەسەلات کەوتە دەست عوسمانی کوڕی عەففان. دەوڵەتی ئیسلامی کەوتە پەلهاویشتن و هەر لە چینەوە تا تونسی گرتەوە، ئەگەر لێیان گەڕابام، دنیایان داگیر دەکرد. محەممەد نەوەیەکی لە کەسایەتی ڕۆشنفیکر و بیری ئیسلامی بە ئەمەکی دروست کردبوو. لەمێژوودا ئایین و نەوەی وا نەبووە و نابێت، تەنانەت مەزنترین شارستانییەتی جیهان ئاواتەخواز بوون یەك لەو کەسایەتییانەیان هەبوایە، ئەی ئەو شارستانیەتەی سەدان هەزار لەو کەسایەتییەی تێدایە، دەبێت چی بێت. ئەمجارە کەسێکی وام شك نەدەبرد، ژارەکەمی لەڕێیەوە بلاو بکەمەوە، دەبوو بەخۆم دابەزمە گۆڕەپانەکە، لەشێوەی مار دەرچووم و شێوەی بنیادەمم لەخۆم گرت، خۆم خزاندە (مەدینەی منەوەرە)، ئەو شوێنەی ئەو هەموو پیاوانەی تیا درووست بوو. لەسەر شێوەی پیاوێکی ڕەشپێستی (یەمەن)ی چوومە ناویان، ناوی خۆم نابوو(عەبدوڵلا).. عەبدوڵلای کوڕی سەبەی.

دەستم بەژەنینی ژارێك لەدڵیاندا کرد. چاوم لەبیرو باوەڕ و کتێبەکانیان و پێغەمبەرەکەیان بڕی، هیچ کەلێنێکم نەبینییەوە ژاریان تێبکەم، وەلێ لە

چاودێری کردن نەکەوتم، تا دۆزیمەوە، ئەو درزەم دۆزییەوە کە زارەکەی تێبکەم. دوای کۆچکردنی پێغەمبەرەکەیان، گەورە پیاوان و ماقوولانیان لەژێر سایەی ( بەنی سەعد) کۆ بوونەوە، تا یەکێك هەڵبژێرن جێنشینی پێغەمبەر بێت، وەلێ یەك لە سەحابەکانیان بیرچووبووەوە یا بانگهێشت نەکرابوو، بەهۆی سەرقاڵبوونی شووشتنی پێغەمبەر و کفن و دفنکردنی، ئەویش (عەلی) بوو.. عەلی کوڕی ئەبوتالیب، ئامۆزای پێغەمبەر و لەهەمان کاتدا زاواشی بوو.

گرفتی من ئەوەبوو، ئەستەمبوو بیروباوەڕیان کە تێکەڵ خوێنیانبوو، لەق بکەم. لەوەش سڵم دەکردەوە نەبادا کاریگەری ئەوان بەسەرمەوە بڕسکێت، دەبوو زارەکەم بەسیاسەت بکەم. عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە بنەماڵەی پێغەمبەر بوو، خودی پێغەمبەر نازناوی جێنشینی لێنابوو، کە دوای خۆی کاروباری ئیسلام بەڕێوە ببات، کاتێ کە بێ عەلی کۆ بوونەوە بۆ هەڵبژاردنی جێنشینێك بێ ئەوەی پرسە گورگانەیەکیشی پێبکەن، ئەوجا زانیم کە هیچم پێناکرێت.

لە (مەدینە) دەرچووم، چونکە هەر هەموو خەڵکی مەدینە ڕایان لەبڕیاری ئەو کۆبوونەوەیە دابوو، کە (ئەبوبەکر) جێی بگرێتەوە، تەنانەت خودی (عەلی)ش گفتی قایلبوونی وێدا. ئەوان تەواو لە قسەکانی پێغەمبەریان حاڵی بووبوون، وای دانابوو دوای خۆی لە سەحابەکان ئەبوبەکر و دواتر عومەر و دواتر عوسمان و دواتریشیان عەلی جێنشین بکەن. بەربەرەکانیی ئەو سێ کەسە، دزینی جێنشینییەکەی عەلی بوو.

ئەو ژارەم ڕۆ کرد، ئەگەرچی دەمزانی کاریگەری تەواوی نابێت، وەلێ بەوای کەمی بیرو باوەڕیانەوە هەندێکیانی گرتەوە، بۆیە ڕووم لە (شام) کرد و هەوڵمدا بیری خۆم لەوێ بخەمە گەڕ، لەوێش هیچم بە هیچ نەکرد. میری شام (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) شامی بەڕێوە دەبرد، ئەستەمبوو دوو زمانی لەلای ئەودا ببێتە هۆکاری هەڵچوون و ئاگر نانەوە. لە (شام)یشەوە دەرچووم، ڕووم لە عێراق کرد، لەوێ ئەوەی بەدووی دا دەگەڕام دۆزیمەوە.

سەرەتا قسەم بەمیرەکانی وڵات کرد، ئەگەرەکو بەلایانەوە ئاسایی بوو، ئەوا هەرچییەك بە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان بڵێم لێمی قبووڵ دەکەن، ڕێك زۆربەی زۆری خەڵك قسەکانیان قبووڵ کردم، تەنانەت گەورەی سوپاش (نەشتەر ئەلنەخاعی)یش هیچ کاردانەوەیەکی لەمەڕ تیروتوانجەکانم نەبوو، ما ئەوەندە قسەیان پێبکەم تا سێ هەزار دەنگم لەتەك خۆمداکۆکردەوە، دواتر چووینە ناو شار و ڕوو بەڕووی خەلیفە عوسمان بووینەوە و داوامان لێکرد جێنشینی بۆ عەلی جێبهێڵێت. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، تەنانەت محەممەد دوو بە دوو بە خەلیفەی گوتبوو.. دوای من خەڵکانێکی دووزمان داوات لێدەکەن ئەو کراسەی خودا لەبەرتی کردووە دایکەنیت، نەکەی بەقسەیان بکەیت. بەوشێوەیە عوسمان دابەزینی لەجێنشینی ڕەتکردەوە، بۆیە دەورمان لێدا و ئاومان لێبڕی تا بەکوشتماندا.

بەو شێوەیە خەڵکی بۆ جێنشین گفتیان بە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)دا، وەلێ سەحابە گەورەکان ڕایان جوودا بوو، برێکیان پێیان وابوو، (عەلی) تۆڵەی خوێنی عوسمان بکاتەوە و ئەوسا گفتی وێدەدەن، لەسەروویانەوە (عایشە)ی ژنی پێغەمبەر و (تەڵحەی کوڕی عوبێدولا) و (زوبێری کوڕی

عەوام). برەکەی تر سەر بە خەلیفە عەلی بوون، پێیان باشبوو تۆڵەسەندنەوەکە دوا بخرێت، ئەویش بەوای سیاسەتەوە، چونکە بکوژەکان لە گەورە پیاوانی هۆزەکانی (عێراق)ن کە دەکەونە خۆرهەلاّتی مەملەکەتی ئیسلامییەوە و ئەوان تازە بەتازە موسوڵمان ببوون، ئەگەر تۆڵەسەندنەوەکە بکرێت، ئەوا مەملەکەتی ئیسلامی دەبێتە دوو بەشەوە. ڕای (عەلی)یان وەرگرت، ڕاکەشی سیاسیانە بوو، لەناو لایەنگرانی دژ بە عەلی بیرۆکەی ئەوە بلاّو بووەوە، کە عەلی ڕقی لە عوسمان بوو، بۆیە دان بە بکوژەکانی عوسمان دێنێت، ئەمەش بیانوویەك بوو بۆ ئەوەی بکوژانی عوسمان هەڵبێن. وا پێدەچوو ژەهرەکەم کاری خۆی کردبێت.

بۆ تۆڵە سەندنەوە لە بکوژانی عوسمان کوڕی عەففان، (تەڵحە) و (زوبێر) بڕیاریاندا بە پێنج هەزار سوارەوە بچنە عێراق و بەدەستی خۆیان تۆڵە بکەنەوە، وەلێ (عایشە)ی خێزانی پێغەمبەرییشان لەتەك خۆیاندا برد، بۆ نەرم کردنی دڵی هۆزەکان. کاتێ گەیشتنە عێراق داوایان لەهۆزە عەرەبییەکان کرد، بۆ تۆڵەسەندنەوە بکوژانی عوسمانیان ڕادەست بکەن، هۆزەکان زۆر بەتوندی ئەو ڕادەستکردنەیان ڕەتکردەوە، ئەویش ڕێك ئەو بۆچوونەی عەلی بوو کە مەزەندەی کردبوو.

لێرەوە (عەلی) خودی خۆی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بەرەو عێراق کەوتە ڕێ، گلەییشی لە تەڵحە و زوبێر و عایشەش کرد، کە باوەڕیان بە سیاسەتەکەی نەهێنا، وەك چۆن مەزەندەی کردبوو. هەرهەموویان دامرکانەوە و گفتی جێنشینیشیان بە عەلی دا و کۆکبوون لەسەر (ڕا)کەشی. وا پێدەچوو عەلی توانیبێتی ئاو بەو ئاگرەدا بکات، وەلێ وا نەبوو، شەوێ

دوای ئـەوەی هـەمووان نووسـتن، خـۆم و چـەند پیاوێـك (تەڵحـە)و چـەند کەسێکمان لەناو دەوارەکەیاندا[1] کوشـت، دواتـر چـووینە دەواری پیاوەکـانی عـەلی و لـەویش چـەند کەسـێکمان کوشـت، ئـەوجا جـاڕی خیانـەتمان دا، پیاوەکـان دەسـتیان دایـە شمشـێرەکانیان، عـەلی هـاواری لێیـان کـرد شـەڕ ڕابگرن، (عایشـە)ش لـە وشـترەکەی هاتـە خـوارەوە و داوای شـەڕ ڕاگرتنـی کرد، تیرێکی زۆر بەر وشترەکەی کەوت، کەس نەیزانی لـەکوێوە ئـەو تیرانـە هاوێژرا، عەلی خۆی کـرد بـە بەربەسـت بـۆ عایشـە و ڕێگـای بـۆ کـردەوە لـە گۆڕەپانەکە دوور بکەوێتـەوە، ئـەوجا فـەرمانی بـە ئافرەتـانی بنەماڵـە کـرد بیگەیێننە مەدینە. تەڵحە بە تیرێکی نادیار کوژرا، عەلی کە چـاوی پێکـەوت، دای لەپرمەی گریان، (زوبێر)یش بـە خەنجـەری خیانـەت لـە نوێـژی نیـوەڕۆ کوژرا. کەسێك هەواڵی کوشتنی زوبیری بۆ عەلی هێنا، عەلی پێیگوت.. مـژدە بەو بکووژە بدە لەناو ئاگری دۆزخ دەسووتێت. عەلی بەدەستی خۆی کفـن و دفنی کرد و گوتی:

- ئاواتەخوازبوم، من و تەڵحە و زوبێر و عوسمان ، ئـەوەی کـە خـودا لەمەڕیانەوە گوتبـووی " هەرچـی کینـە و ڕقـە لەناخیانـدا دەرمـان هێنـاوە، بەرامبەر بەیەك بران"

لەبـەر ئـەوەی عێـراق لـە ئـارامی چـووبووەوە، خـودی (عـەلی) لەکوفـە مایەوە، تا حوکمی موسوڵمانان بکات، بەو هیوایەی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) وەختەبوو ئاگرەکە دابمرکێنێتەوە. نەیخوات تاڵە، ئەی من لێرە چی دەکەم، پیاوانی (سەبەئـ)یش هەر لێرەن. کەلێنێکی زۆر کەوتبوو ئاراوە. عـەلی دوای

---

[1] خیوەت , ڕەشماڵ.

گەیشتنی بەمەرامی خۆی ما هۆزەکان لەخۆ بگرێت، ئەوانەی فەرماندە و سەرکردەی سوپا بوون، وەك خۆی هێشتینییەوە، لەوانەش (نەشتەر نەخاعی)، کە سیمبوولی بەگژدا چوونەوەی عوسمان و لایەنگرانی بوو. دەنگم لێ هەڵبڕی و لەناو خەڵکەکە هاوارم کرد.. بڕوانن (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) چۆن شاری پێغەمبەری خودای جێهێشت، تا لە کوفە جێنشینی بکات، دەیەوێ ڕێ بۆ بکوژانی عوسمان بکاتەوە تا نەکەونە بەر تۆڵە، بڕوانن لەشکرەکەی چۆن شەڕی دژی لەشکری عایشە و تەڵحە و زوبێر کرد، ئەوەی کەوتە بەردەستیان کوشتیانن، نایەوێ بکوژانی عوسمان بکوژرێنەوە، خەڵکینە.. ئەوە ڕق و کینە نییە بەرامبەر بە (عوسمانی کوڕی عەففان)؟ زۆرم هاوار کرد ژارێك بنێمەوە، وەلێ کاریگەری قسەکانم تەنها لەسەر ئەوانەی تازە موسوڵمان ببوون. موسوڵمانان زۆر چاك دەیانزانی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) کێیە، ئەو ئامۆزای پێغەمبەرە و مێردی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە، ڕاوێژکاری هەرسێ جێنشینەکانی پێش خۆی بووە، پێغەمبەر دەربارەی عەلی گوتبووی" خودا فەرموویەتی نەوەی هەموو پێغەمبەران لەپشتی خۆیانەوە بووە، وەلێ نەوەی پشتی من لە (عەلی)یەوە دەبێت، جێگرەوەی منە دوای خۆم. هاوارەکەم هیچ سەدا و کاریگەرییەکی پێوە دیار نەبوو.

ئەوانەی بەدەنگمەوە هاتن و بوونە هاوکارم، سەر بە وڵاتێکن کە هەر لەسەرەتاوە دژ بە هەڵوێستی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) بوون، گفتی جێنشینیی وێنەدەن تا تۆڵە لە بکوژانی ( عوسمانی کوڕی عەففان) نەکاتەوە، ئەویش وڵاتی (شام) بوو، ئەوانە میر موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و یەکێ لە سەحابە بەناوبانگەکانی ( عەمری کوڕی عاس)بوون.

پێشووتر کە هاتمە شام هیچم پـێ نـەکرا، وەلێ ئەمێستا بـەوای هەڵوێستی دژیان لەبەرامبەر هەڵوویستی عەلی، بڕێك ئاگرەکەی بۆ خۆش کردبووم.

هـاوارم لـەناو لایـەنگرانی ( عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب) کـرد و گـوت.. موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان گفتی جێنشینیی بە عەلی کوڕی ئـەبو تالیب نادات، چونکە بکوژی خاڵی و براکەیەتی، موعاویە گەورە پیاوی بنەماڵـەی ( ئومەیە)یـە، کـە عوسمـانی کـوڕی عـەففانیش لەوانـە هـەر بەخۆیشـی تۆڵەکەرەوەی خوێنی عوسمانە. هەرچەند هاوارم کرد، دادی نەبوو، خـەڵکی دەیانزانی ( موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) کێیە و دەشیانزانی لەو پیاوانەیە کە پێغەمبەر متمانەی تەواوی لـە نووسینەوەی قورئانـدا پێبـوو، پێغەمبـەر نزای بۆ کردبوو، گوتبووی.. خودایە بیکەی بە ڕێپیشاندەر و ئیمـان پێدەر. موسوڵمانەکان لەتەك نزای پێغەمبەر مامەڵـەی دەستوور دەکـەن. خوشکی موعاویە ژنی پێغەمبەر بوو، بۆیە بە خاڵۆی موسـوڵمانان ناودێریـان دەکـرد، بـاوەڕی تـەواویان پێیبـوو، لـەکاتی جێنشـینییا (عومـەری کـوڕی خـەتاب) زۆرێك لە (والییەکانی وەك خالیدی کوڕی وەلید و ئەبو موسـای ئەشعەری و سـەعدی کـوڕی وەقـاس و عـەماری کـوڕی یاسـری لابـردووە، وەلێ لەبـەر دادپـەروەری و زیرەکییەکـەی لـە حوکمـدا هـەقی بەسـەر موعاویـەی کـوڕی ئەبوسوفیانی نەبووە.

سـووربوونی موعاویـە لـە گفتنـەدانی جێنشـینی عـەلی زۆری خایانـد، سـەحابەکان ئەوانـەی لایـەنگری عـەلی بـوون، ئامۆژگارییـان کـرد، بـۆ شـام دەربچـێت تـا حـوکم بگەڕێنێتـەوە و دەسـتبەرداری کردنـی لەجێنشـینی وادەکات خەڵکانێك لە دەوڵەت جیابنـەوە. بەوشێوەیە عـەلی بـە لەشکرێکی

سەد و بیست و پێنج هەزار کەسی بۆ بەدەستهێنانەوەی شام کەوتە ڕێ. موعاویە.. لەشکرێکی نەوەد هەزاری خستە ئامادەباشییەوە. زۆر کەیفخۆش بووم. سەحابەکان ئەوانەی دڵیان پۆڵا بوو، لەوەدا بوون یەکتر ببڕنەوە, دەوڵەت بڕووخێت. کەواتە مارەکە قوربانییەکی نوێی دۆزییەوە.

هەردوو لەشکرەکە تێکهەڵگژان، نزیکەی چل هەزار کوژرا. ئەوەی بەلامەوە مایەی سەرسوڕمانبوو، کەمێ هەڵوەستەم کرد لەو دۆخە حاڵی ببم، ئەو خەڵکە بەڕۆژ شەڕیان لەگەڵ یەك دەکرد و بەشەویش سەردانی یەکیان دەکرد! سەدای قورئان خوێندن لەمبەرەوە بەرز دەبووەوە و لەوبەریش بۆی هەڵدەستانەوە. هەر لایەنێکیش بە بڕوای خۆیان شەڕ لەپێناو ئایین دەکەن. لایەنی یەکەم بۆ تۆڵەسەندنەوە شەڕیان دەکرد، چونکە دواخستنی تۆڵە سەندنەوەکە دژی شەریعەتی ئیسلامە، لایەنی دووەم بۆ بەرقەرار کردنی ئارامی و ئاسایشی دەوڵەتی ئیسلامی شەڕیان دەکرد. ئەوەی بەلامەوە سەیرتر بوو، لەکاتی شەڕەکەدا هەردوو پیاو باوەشیان لەیەك دەدا، بێ ئەوەی شیر لەیەکتر ڕاست کەنەوە، هەموو ئەو کوشتارەی کە ڕوویدابوو، لایەنگرانی من بوون. ئەوانیش لە کەم باوەڕەکان بوون و سەحابە نەبوون. ژارەکەم سەری نەگرت، ماوەیەکی تر هەردوو لا ئاشت دەبنەوە، ئەوسا بەهێزتر دەبن.

هەر بەڕاست هەردوو لا ئاشتەوە بوون، ئاگربەستیان بۆ ساڵێك ڕاگەیاند. لەماوەی ئەو ساڵەدا تا پێمکرا ژەهرم خستە دڵی کەمباوەڕەکانەوە، بەوان دەوێرام، بەسەحابەکانیشەوە واملێکردن وابزانن ئەوەی لەو شەڕەدا بەشداری کردووە، کافرن.واملێکردن بەسەر جێنشینی

دەوڵەتی ئیسلامی بکەونە کۆدەتا کردن، کە عەلی بوو. دڵی (عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلجەم)م وازاراوی کردبوو سەرقاڵی کوشتنیم کرد، وام خستبووە دڵییەوە بە کوشتنی عەلی دەچێتە بەهەشت. پێغەمبەر لەمەڕ بکوژی (عەلی)یەوە گوتبووی.. ئەوەی دەستی بچێتە خوێنی عەلی هەردوو دنیای بە ئازارەوە دەبێت. هەروەها گوتبووی ئەو تایەفەیەی (خەوارج)ەکان دەکوژن، یەك لە تایەفە هەقدارەکانە کە تایەفەی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)ە. ئەو تایەفەش کە بکوژی (عەماری کوڕی یاسر)ن ئەو کۆمەڵە زاڵمەن کە سەر بەتایەفەی ( موعاویەی کوڕی ئەبوسفیان)نن. ئەوەی مایەی سەرنج و سەرسوڕمان بوو، پێغەمبەر فەرموودەی وای لە ڕووداوە داهاتووەکاندا دەگوت، ڕێك لەبانەڕۆژدا هاتنە دی. ئەوەی هەق بێت.. مێژوو هەرگیز وەك ئەم گەلەی نەبینیوە.

دوای مردنی(عەلی کوڕی ئەبوتالیب) حەسەنی کوڕی جێی گرتەوە. حەسنی کوڕی عەلی بۆ پاراستنی دەوڵەتی ئیسلامی کارێکی بەجێیکرد، هەموو گێروگرفتەکانی لەناو برد، ئەویش دوای شەش مانگ لەجێنشینی دەچێتە لای موعاویە و دەست لەجێنشینی بۆ موعاویە هەڵدەگرێت. بەو شێوەیە هەمووان ئاشت دەبنەوە، دڵیان لە ئاست یەك پاك دەبێتەوە. ئەم پیاوە پیاوێکی زۆر نامۆ بوو، پیاوێك بوو تا بڵێی زیرەك بوو، پێشتریش ئامۆژگاری باوکی دەکرد، کە جێنشینی دەوڵەت بوو. ئەگەر عەلی بە ئامۆژگارییەکانی بکردایە، ، کێشەکان وا گەورە نەدەبوون. ئامۆژگاری باوکی کردبوو، بۆ عێراق دووی عایشە نەکەوێت، نەچێتە شەڕ لەگەڵ موعاویە دا، ئەوەتا جێنشینییەکە دەبەخشێتەوە موعاویە. پێغەمبەری باپیری، لەمەڕ( حەسەن)ەوە گوتبووی.. حەسەن دەبێتە هۆکاری ئاشتبوونەوەی دوو

تایەفەی زۆر گەورە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا. جارێکی دی پەیامی پێغەمبەر هاتە دی و ئاو بەو ئاگرەدا کرا، ژارەکانی منیش کوێر بوونەوە، بەخۆمم گوت.. لەتەك ئەم گەلە شکستم هێنا، بەڕاستی دۆڕام، نازانم دڵیان لەچی درووست کراوە، هەر بەڕاستی لەچی درووست کراوە؟

********

تەواو

بەڕاستی ئەم بەسەرهاتە ماندووی کردم، بێزاریشی کردم. سێرپێنت مار ئەهریمەن سیمبوولی هەڵخەڵەتاندن بوو، تەورات دەربارەی دەڵێت.. ئەو مارەیە کە ئادەم و حەوای هەڵخەڵەتاند و لە بەهەشت وەدەرینان، وەلێ ئەوە ڕاست نەبوو، ئەوەی ئادەم و حەوای فریو دا، لۆسیفەر بوو. سێرپێنت.. شەیتانێك بوو پیشەی شێواندنی بیرو باوەڕ بوو، بە دوو زمانی و ئاگر نانەوە، لەهەچ ولاتێك دابەزیبایە، دەیشێواند.

سەرم لەو دیمەنانە سوڕ نامێنێت کە بەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان دەیانبینم، کاتێ جوولەکەکانی ئیسرائیل منداڵان دەکوژن و سەریان دەبڕن، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو سەربازە جووە نازانێت ئەوەی دەیکوژێت بنیادەمە، چونکە بە پێی تیۆری(تەلموود) ئاژەڵ دەکوژێت. گوایە خودا لەسەر وێنەی بنیادەم دایهێناوە. بەلای ئەو سەربازەوە ئەو ئاژەڵە گرفتە بۆ سەر خاکەکەی، بۆیە ئەرکی خاك پاراستنەکەی کوشتنی ئەو ئاژەڵەیە، وەلێ هەر هەموو جوولەکەکان باوەڕیان بە (تەلموود) نییە، تایەفە هەیە باوەڕی

بەس بە تەورات هەیە، تایەفە هەیە پێی دەگوترێت( خوێنەرەکان) ئەم تایەفە باوەڕیان بە عیسا و محەممەد هەیە کە پێغەمبەری خودان، تەنانەت پێغەمبەر محەممەد باسی لە جوولەکەکانی سەردەمی خۆی کردووە، کە وەك چۆن بەر لە لەدایکبوونی منداڵەکانی خۆیان ناسیبێت. ناسیویانە،

بە بۆنەی ئەو ئاژەلانەی لەسەر شێوەی بنیادەمدان، ئەنجومەن و جڤاتی ماسۆنییەکان سەرپەرشتی بلاوکردنەوەی بیردۆزی زانستیان کرد بەتایبەت داروین کە گوایە مرۆڤ لەسەرەتادا مەیموون بووە. ئەمەشیان بۆیە کرد، تا لە هزری جوولەکە و ئاژەڵئاساکاندا بە قووڵی ئەوە بچەسپێنن، کە با و باپیریان لە مەیموونەوەیە، وەلێ جوولەکەکان بۆ خۆیان باوەڕیان بەو تیۆرە نییە، بەڵکو ئەوە ئەو گۆییمانەن[1] کە بوونەتە بنیادەم. ئەگەر ڕای من وەردەگریت لەمەڕ ئەو تیۆرەوە، دەڵێم.. تەنها مرۆڤی گەمژە و بێ عەقڵ بەوشێوەیە بیردەکاتەوە کە ڕەچەڵەکی بنیادەم لەمەیموونەوە بێت.

لەبیروباوەڕی مەسیحییەکانیشدا لەبارەی کارو کردەوەی مارەکەوە دەڵێم.. بەدەر لەڕێ لادەری کە گەیشتبووە ئەوپەڕی کە من خۆم (ئینجیل)م بە هەموو دەسنووسەکانیشییەوە خوێندووەتەوە، تەنانەت یەك وشەش نییە مەسیح بەخۆی گوتبێت من خوداوەندم، یا کوڕی خودام، یان داوای کردبێت بیپەرستن، تەنانەت ئەوەشی پێ ناخۆش بووە مەردوومەکە بە پیاوچاك بانگی بکەن، ئەو گوتبووی.. چاك هەر خودایە. من دەزانم مرۆڤ پێویستە بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بکەیت یا نەکەیت، پێویستە شتێکی کردبێت تا بڵێت من ئەوەم کردووە. وەلێ مەسیح(عیسا) هیچی لەمەڕ خۆیەوە

---

[1] هەر میللەتێکی غەیری جولەکە.

نەگوتووە، کە وای کردووە یا نەیکردووە، نە گوتوویەتی من خوداوەندم، نەیش گوتوویەتی کوڕی خودام، هەرگیز بەو ئاراستەیە کاری نەکردووە.

مرۆڤ گەیشتووەتە ئاستێك لە زیرەکی و هۆشیاری، ڕێ بەکەس نادات قسەی وا هەڵەق و بەڵەق بڵێت، ئەگەر ئەو بەر لەدایکبوونی خوداوەند بووبێت، ئەدی کە ئەجەلی هات نامرێت؟ ئەگەر ئەم خوداوەندە و نان و ئاوی لێ ببڕیت، نامرێت؟ باشە کە مرد چۆن خوداوەند بوو تا بمرێت؟ دواتر من بیستوومە بەمنداڵی سوونەت کراوە، ئاخۆ سوونەتکەرەکە کە سونەتی کرد، سونەتی خوداوەندی کرد؟ چۆن خوداوەندی گرت و سونەتی کرد؟ کاتێکیش بەسەر خاچەوەبوو، هاواری لەئاسمان کرد و گوتی بۆچی جێتهێشتم؟ ئەوە ڕاستە خواوەند بەکەسێك بڵێت بۆچی جێتهێشتم؟ دواتر چۆن دەڵێن خودا شتێکە و مەسیح شتێکی ترە و ڕوحی پیرۆزیش شتێکی جوداترە، هەر ئەوان نەبوون دەیانگوت هەرسێکیان یەك کەسن کە خودایە، بەڕاستی نازانم سێرپێنت چۆن ئەمەی کرد، بەر لەوەی تەواوی عەقڵیان لەدەست بدەن گەمەی بەعەقڵی ئەو خەڵکەوە کرد.

ڕەنگە پێمڕانەگەیاندبیت کە من ئێستا موسڵمانم. بەدەر لەوەی وەك ئێستا نەبووم، بەڵام ئەوەم کرد و بووم بە موسڵمان، دوای ئەوەی هەموو شتێکم زانی، دوای ئەوەی لە دەریای ماسۆنییەتم دا و جادووگەرێتیم کرد، بمزانیبایە ئەوەم نەدەکرد، کە بینیم (سێرپێنت)ی مار لە شێواندن و وێرانکردنی بیروباوەڕی سەحابەکان شکستی هێنا، وەك چۆن لەتەك (حەواریی)یەکاندا شکستی هێنا، وەلێ دوای تێپەڕبوونی سێ سەدەی یەکەم دواجار توانی ژارەکەی بخاتە دڵی خەڵکەوە. نەوەی ئەو سێ سەدەیە

نەوەیـەکی زێـڕین بـوون، ئەهریمەنـەکان لەدەسـتیان هەڵـدەهاتن، چونکە بیروباوەڕێکی پۆڵایینیان هەبوو.

دوای ئەو سێ سەدەیە، (سێرپنت)ی مـار تـوانی بـەوای ژەهرەکەیـەوە کۆمەڵێك لەژێر سایەی ئیسلامدا جیا بکاتەوە، کە بە شیعە ناوزەد کران، ئەم ڕووداوە ڕێك دوای شەهیدبوونی (حوسێنی کوڕی عەلی) لە کەربەلا داهات.

سەرەتا گرووپێك بوون بـەناوی (زەیـدی)، تـەنها کۆمەڵـە خـەڵکێکبوون خۆیـان بەڕاسـتتر لـە پـەیڕەو کردنـی ئیسـلامدا دەبینـی، ئەوانـەش لەسـەر بیروباوەڕی(زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێن)بوون.

زەید پیاوێکی خـەباتگێڕ بوو(مجاهـد)، لەهـەموو شـتێك لەتـەك خـەڵکی موسـوڵماندا بـوو. ئـەو پێیوابوو(عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب) پێشـتر بـوو لـە (ئەبوبەکر) بۆ جێنشینی، ئەگەرچی چاکەی (ئەبوبەکر و عومەر)یشی لەپێش چاو بوو، زەید بەر لەمردنی ڕەحمەتی بۆ ناردن.

دوای مردنی زەید هەندێ لـە لایـەنگرانی لەڕەحمـەتکردنی (ئەبوبـەکر و عومەر) کەوتن، لێرەوە لادەریی دەستی پێکرد، ئەوانەی لەو ڕەحمەتکردنـە کەوتن، بە (ڕافزی) ناوزەد کران و بوون بەزیاتر لە حەفتا بەشەوە.

مێژوویان بۆ دەوڵەتی ئیسلام لێوانلێو بووە لەخیانەت، هاوپەیمانێتییان لەتـەك دوژمنـانی ئیسـلام بەسـت. مـن زۆرتـر سـەرم لـەوەدا سوڕمابوو ئـەو هەموو ڕێبازەی(مەزهەب) شیعەگەرایی پەیدا بوون، لەکاتێکدا موسوڵمانەکان پشـتیان بـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەر دەبەسـت، نـەدەبوو فـەرموودەکان دەستکاری بکرێن. ئەوەی جێی داخە موسوڵمانەکان لەسەدەی یەکەمـدا بە

گواستنەوەی فەرموودە و شەریعەت و تەفسیردا بوون، وەلێ شتێکی زۆر گرنگیان لەبیر چووبوو، ئەویش نووسینەوەی مێژووە.

کاتێ موسولمانەکان لەبیریان چوو مێژوو بنووسنەوە، شیعە وریاتر بوون و چالاکتر بوون لەنووسینەوەی، هەموو ئەو ڕووداوانەیان نووسییەوە، کە دووزمانی بوون، لەوانەش.. بەسەرهاتی ئەو دووزمانییەی کەوتبووە نێوان سەحابەکان و بەزیادەوە نووسییانن. بە پشت بەستن بەو ڕووداوانەی دوو زمانی تێدا کراوە، بۆ لێدانی موعاویە بووە، یا ئەودوای سەحابەکان بەناوبانگترین چوار شیعە مێژوویان نووسیووەتەوە و ناوبانگیان دەرکردووە، کە فەرموودەی ساختەیان داهێناوە، ئەوەی مایەی نیگەرانییە، ئەو مێژووە چووەتە بەرنامەی خوێندن لەولاتانی ئیسلامیدا، ئێدی سەرزار و بن زاری قوتابییەکانیان توانج گرتنە لە موعاویە، کە وابوو و وا بووە، یەزیدی کوڕیشی وابووە و وابووە، ئەبوسوفیانی باوکیشی وابووە و وابووە.

لەمەڕ ئەو بەسەرهاتانەی دەرهەق بە( یەزیدی کوڕی موعاویە) گوتراوە، هەمووی بە پشت بەستن بەدرۆکانی دەم شیعەکانەوە بووە، لەهەمووشی خراپتر مێژووەکەیان بە شێواوی نووسیوەتەوە، (یەزیدی کوڕی موعاویە)یان بەو تۆماتبار کردووە، کە کابرایەکی سەرخۆش و مەیخۆر و ژنانی بووە، بۆی نییە دوای موعاویە جێنشینی بکات، ئەوەی بۆ ئەو جێنشینییە پێشتر بێت (حوسێنی کوڕی عەلی)یە. ئەوەشیان بەدووزمانی کرد، کە گوایە بە فەرمانی یەزید حوسێن لەکەربەلا کووژراوە.

سەیر لەوەدایە، ئەو گێڕانەوە ڕاستەی دەربارەی یەزید کراوە، لەلایەن (محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب)ەوە بووە، بەخۆی گێڕاویەتەوە، ئەو

لەسەردەمی یەزید ژیاوە و باش ناسیویەتی، پیاوێکی بێ غەل و غەش بووە، بێجگە لەشیعە کەس ئینکاری پیاو چاکیی یەزیدی نەکردووە، لەوەش سەیرتر ئەوانەی دوای ئەمان دێن باوەڕ بەو تاوانبارییەی یەزید دێنن، کێ لەو باوەڕەدایە ئەو سەحابانەی خۆیان بە کوشت دەدا وڵاتیان فەتح دەکرد، چۆن قبووڵ دەکەن جێنشینەکەیان پیاوێکی سەرخۆش و ژنانی بێت. ئەوە توانج بوو لە سەحابەکانیان دەگرت، ئەوەندە بەسبوو(عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) کە دادپەروەرێکی ئیسلامی بوو بۆ ئەو سەردەمە هاتە نێو خەڵك و گوتی.. من لەو کەسانە بەدوورم کە گفتی جێنشینی بە یەزیدی کوڕی موعاویە نادەن.

ئەوەی سەیربوو، کە موعاویە بۆ جێنشینی دوای خۆی یەزیدی کوڕی هەڵبژارد، سێ لە سەحابەکان بەرپەرچیان[1] دایەوە، ئەوانیش حوسێنی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر و عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر بوون، کاتێ بەرپەچیان دایەوە، هەرسێکیان یەك قسەیان کرد.. ئەم میراتە قەیسەرانەیە یا کیسرایيانەیە. وەلێ ئەگەر توانجێك هەبێت لە ئاکاری یەزید، وەك بڵاوکرابووەوە، دەبوو ئەو دەم بگوترایە، بەڵام حیکایەتەکانی شیعە زۆر درۆیان بەدەم سەحابەکانەوە هەڵبەستووە، کە نەیانکردووە.

با لەو قسە و باس و وتە وتە بێنین، ئاگر لە مێزەکە بدەینەوە.. ئەمێستا دوو کارتمان بەدەستەوەیە،

کارتی یەکەم .. کارتی وڕینەیە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە بەوای سەرئێشەوە چاوی داخستووە، هەندێ وڕینە بە مێشکیدا گوزەر دەکات.

---

[1] تانە.

کارتی دووەم.. کارتی تیرۆر کردنە.

ئـەم بەسـەرهاتە هـیچ کـام لـە ئەهریمەنـەکان بـۆتی ناگێڕنـەوە، بـا شەیتانەکان وەلا بنێین. بەڕاستی من بە دوور و درێژی باسم لە کاری شیعە کـرد، ئـەوەی ئـەم بەسـەرهاتەت بـۆ دەگێڕێتـەوە یەکێکـە لـەوان، ڕێـك لەتایەفەی(نزاریی)یە، پیاوێك لە تیپێکی ترسناك کـە بـە حەشاشـین (تلیـاك خۆر) ناوزەد کراوە. جارێکی تـر پـێم مەیێـژە چۆنی دەگێڕێتـەوە، تـەنها و تەنها گوێ بگرە.

********

## بەشی پێنجەم

# شۆڕە سوارێك لە جێگای بڵند..

## ١٠٠٠ پاش زایین - ١٢٥٠ پاش زایین

کە بۆ یەکەمجار چوومە بەهەشتی نەمرییەوە تەنها کراسێك لە ئاوریشمی سپی نەبێت، هیچ بەسەر جەستەمەوە نەبوو، دوو فریشتەی باڵای هەرە زراف پیلمیان گرتبوو، دەستیان بەردام، چون ئەوەی پێم بڵێن ئەی خاوەن ڕوحی ڕەزامەند بفەرمە بەخۆت بگەڕێ، کە خودا چی بۆت ئامادە کردووە. بەسەرسامییەوە لەدەورو بەری خۆمم ڕوانی، لەیەکەم نیگامدا چاوم بە ڕووبارێك کەوت چون ئەوەی ڕووباری شیر بێت. ڕوانیمە ئەوبەر دارخورما هەرە بەرزەکانم بینی، زۆر جوان و خورمایەکی زۆر لەژێریاندا پەرش و بڵاو ببووەوە، سوێیان بە بنیادەم دەکرد، بەڕاست لەم بابەتانەم خوێندبووەوە، ئەمە ڕاستییە یانەخۆ خەونە. من تەواو بێدارم، وەڵێ هەست دەکەم مێشکم بەردەوام سڕە، وەڵێ وریام، بەوای ئەو بۆنە خۆشەوە کە هات بە لووتمدا، چون ئەوەی بۆنی سروشت بێت، .

## ئەنتیخریستۆس

" ئەی پشتیوانانی (ئالوبەیت)، بەهەشت چاوەڕوانتانە، خۆشەویستانی عەلی.. بەهەشت لەوێیە، پێویستیتان تەنها بەوەیە پالێك بە دەرگاکانەوە بنێن"

شتێکیتر بەناخما ڕۆچوو، جۆرێك لە ئاوازی خۆش، هەرگیز لەژیانمدا گوێم لەئاوازی وا نەبووە، چاوم بۆ لای شوێنی ئاوازەکە گرِدا، شتێك چون ڕارەوێك لە دار درووستکراوم بینی، ئاوازەکە لە ژوورەوە دەهات. هەستێکی سەیرە لە بەهەشتی نەمرییدا بیت و درك بە شوێنێکی نویٚ بکەیت ، ئەوجا بۆی بچیت تا بزانیت چی دەگوزەرێت، ئەوەی دەیبینیت ئەوپەڕی خۆشبەختییە، ئەمەیە مانای بەهەشت. ئەم قسانەی دەیکەم وەسفی ئەوە ناکات کە من دەیبینم و هەستی پێدەکەم، وەلیٚ هەولْدەدەم بە وشە وێنای بکەم. لەو ڕارەوە نزیکبوومەوە، کە گوێم لەو ئاوازە بوو، هەستم کرد ئاوازەکە پەلکێشی لای خۆیم دەکات.

" ستایش و شوکرانەی خوداوەندی یەکەم دەکەم، پیرۆزیی خواوەندی دووەم دەکەم، دوو خوداوەندی دێرین و مەزن، نە یەکەمیان هەیە نەیش سێیەم"

بەڕاستی ئەوەی لە ژوورەوە بوو، سەرسامی کردم. یەکەمجارم بوو کە چێژێکی وا خۆشی بکەم، ڕوحم لەخۆشیدا جێی بەخۆی نەدەگرت، زۆر کەیفخۆشبووم، هەستم بە بەختەوەری دەکرد، هەر کە چوومە ژوورەوە دە ئەوەندە خۆشییەکەم زیادی کرد، فرە دڵخۆشبووم، ئاوازێلێك بەگوێمدا ڕاهاتن، جۆرییان نەبوو، زیاتر بۆم روون بووەوە, ئەوانەی دەمبینین دەمناسینەوە، برایەلی هەمان بیروباوەڕبووین، بەسەر تەختەی جۆری

شاهانە پاڵیان لێدابووەوە، کچێڵێکی فرە قەشەنگ و جوان بەدەوریانەوە، فریشتە ئاسا. بەزمێك بوو گەمە و پێکەنینیان هەر مەپرسە، بەکراسی تەنك و ئاودامانەوە سەمایان دەکرد، بڕێکیان بە کراسی سوور و بڕێکی تریان بەکراسی سپییەوە. هەر کە دەرکەوتم دوو کچی جوان و نەشمیل بەپیرمەوە هاتن و دەستیان گرتم، پیاوم دەویست بەرگەی ئەو زەردەخەنەییان بگرێت. دەستیان بۆ درێژ کردم، کە بەر دەستم کەوتن، شتی وام بەخۆمەوە نەبینیبوو، ئەو دەستە نەرم و شلانە، بە نەرمە نەرمە بۆ لای کۆمەڵەکەیان بردم.

" جێنشین بکوژن، دەچنە بەهەشت، ئەگەر لەو ڕێیەدا کوژران هەر دەچنە بەهەشت"

لەسەر تەختەی شاهانەیی دایاننیشاندم و دەستییان ماچکردم. تکایە پێمبڵێن ئەمە خەون نییە، ئەگەر خەونیش نابینم پێمبڵێن سەرخۆش نیم، ئەگەر سەرخۆشیش نیم ، ئەدی ئەم هەموو ناز و نیعمەتە یانی چی، ئەم خۆشی و بەختەوەرییە لەکوێی دنیادا بووە. نەمدەزانی بەهەشت ئەم هەموو نازو نیعمەتەی تێدایە، هەتا بۆ مێشکی مرۆڤیش خۆشی و لەزەت و مەست بوون هەیە, گەورەی چیاکان پێشەوای مەزن ( حەسەن سەباح) یەکەم جار ئەو وایلێکردم هەر پێی دەگوتم دەتنێرمە بەهەشت, مێشکم ئیسراحەت بکاو مەست بێت.

لێرە بەچاوی خۆم بینیم هاتە ناو ئەو کۆمەڵە جوانە، پێشەوا خۆی بوو، ئەم پیاوە مەزنە چ هەیبەتێکی هەیە. بیرمە ئەو دەمەی پێشەوای مەزن فەرمانی بەو گەنجە دا لەسەر شوورەی قەڵای (ئالاَموت) ڕاوەستێت، باڵ

بکاتەوە و خۆی هەڵداتە خوارەوە. گەنجەکە بێ سێ و دوو لەسەر لووتکەی شووراکە باڵی لێ کردەوە و خۆی بەرەوە دا. پێشەوامان ئەو فەرمانەی بێ مەبەست نەبوو، دەیویست بەو خاچپەرستەی پیشان بدات، کە هاتبوو بۆ سەردانی، لایەنگرانی چەندە دڵسۆزی پێشەوان، ئامادەن لەهەچ ساتێکدا بێت خۆیان بەخت بکەن. ئەڵبەت ئەو گەنجە لە بەهەشت ڕادەبوێرێت. ئەو خاچپەرستە نەیزانی ئێمە بۆچی ڕوحی خۆمان دەبەخشین، ئەگەر ئەوەی من هەنوکە دەیزانم و دەیبینم ، ئەو بیبینیایە، هەڵبەت چاك تێدەگەیشت.

پێشەوای مەزن حەسەن سەباحی مەزن پێیگوتین:

پشتیوانانی خودا.. ئەم هەموو ناز و نیعمەتەی وێتان دراوە، لەچاو ئەو نازو نیعمەتەی خودا پەیمانی داوە چ نییە، لە چاو جێگای بڵندەکانی بەهەشت کە بە (شەهید)ەکان دەدرێن چ نییە. ئەمڕۆ من هاتووم تا ئەو جێ بڵندانەتان بۆ ئاسان بکەم، تەنها گەیشتنتانە بە پلەی شەهیدی، ئەی باوەڕپێکراوان، کێ ئەو پلەی(شەهید)ییەی دەوێت؟!

هەرهەمووومان بە سەرساامییەوە وێستابووین، هەر هەموووشمان لەچاوەڕوانیدا بووین، کێمان بەختی ئەو هەڵبژاردنەمان دەبێت. ئەگەر نازو نیعمەتێك وابێت، دەبێت ئەوی دی کە جێی بڵندی بەهەشتە چی بێت، دڵم هاواری ئەو پلەیەی بوو. لەبەختی مندا پێشەوا منی هەڵبژارد.

ئەو هەلانە بەین نا بەینێك پێشەوا پێمانی دەبەخشی. دەبوو فەرمانەکانی خەلات بن بۆ ئێمە، هەرچی خراپەکار هەیە تۆییان ببڕینەوە. ئەوەتا یەکێك لە جێنشینەکانی (سەردەمی عەباسی) دەکوژین، کە لەڕاستیدا ئەوان دوژمنی خودا و پێغەمبەرەکەین.. پێشەوا وای وریا

کردبووینـەوە، یـا یـەك لـەو خاچپەرستانە بکـوژین کـە دوژمنـی خـوداو پێغەمبەرکەیانن، یانەخۆ یەك لەو زانایانەی بیروباوەڕی ژاراوییـان دەخستە مێشکی خەڵکییـەوە، ئەوانـە بیروباوەڕیـان زۆر لـە جێنشینەکان پیسـترن. ئەوەی ئەمجارە کوشتن نەبوو، چالاکییەکی زۆر ئاسان بوو، دەبوو نامەیـەك بگەیێنمە دەستی (ئامووری پاشا)، پاشای قودسی خاچپەرستان. بەخۆمم گوت چەند بەختەوەرم کە منی هەڵبژارد. خـودا پێشـەوایەکی بـۆ ناردووین، ڕێنیشاندەرمان بێت. ئێمەش مافی ئەوەمان هەیە پێشەوایەکی مەزنی وامان هەبێت، پێشەوایەك نێردراوی خودا بێت، فەرمایشـتمان بکات و لێوەی فێر بین.

لەڕاسـتیدا ڕێگاکـە زۆر دوورو درێـژ بـوو. بـە سـواری ئەسـپە ڕەسـەنە عەرەبییەکەم بەرەو قودس بەڕێکەوتم، ماوەی مانگێکم لەپێشبوو بە قـودس بگـەم، ئەسـتێرەکان بـەبان سـەرمەوە ڕێنیشـاندەرم بـوون. بیرۆکـەی زۆر بەهزرمـدا هـاتن، هەسـتکردنم بـەو شـانازییەی کـە منیـان بـۆ ئـەو کـارە هەڵبـژاردووە، بـیری پـەروەردە و گـەورەبوونی خـۆم دەکـردەوە لـە قـەڵای (ئالاموت)ی مەزن، چۆن بەهەتیویی و بەڕەڵایی و دەردەسـەری دەژییـان و لەپڕ پێشەوا هات و دەستی گرتین، لـە کۆشـکەکەی خـۆی مـن و بڕێکـی تـر لەمناڵانی لەخۆ گرت و پێیگەیاندین، باشـترین جـۆری خـواردنی وێدەداین، جێگای بۆ دابین کردین. ئێمـە فـامی هیچمان نـەدەکرد، ئـەو فێـری هـەموو شتێکی کردین، فێری سوارچاکی و شەڕە شمشێر و ڕمبازیکردنی بان ئەسپی کـردین، تەنانـەت فێـری هونـەری شەڕیشـی کـردین، چـۆن شمشـێر و ڕم بەکاربهێنین، چۆن ببین بە تیروکەوانبازێکی دەست ڕاست، چۆن ئەسـپ بـەو پەڕی تیژڕەوی تاو بدەین، فیری دڵسۆزی کردین، فێری شیعەگەرایی کردین،

کە شیعەی عەلی و بنەماڵە بین، فێری کردین لە ئاست دوژمنەکانمان دڵمان بکەین بە بەرد، فێری کردین کافرە ژنپەرستەکانی جێنشینانی عەباسی و ئەوانەی لایەنگریشیانن بکوژین.

پێشەوا باشترین خواردن و خواردنەوەی پێدەداین، خواردنەوەیەکی بۆنخۆشی وێدەداین مێشکمانی بەرز دەکردەوە، هێزی وێدەداین، خواردنەوەیەك گەشەی بە عەقڵمان دەدا.

لەسەفەرەکەمدا بیری ئەو خواردنەوەیەم کرد، لە بەر باخەڵم دەرمهێناو مژم پێوە نا، مێشکم حەسایەوە. هەستم بەجۆرە شانازییەك دەکرد، چون جەنگاوەرێکی بێ وێنە لەخۆم دەڕوانی، پێشەوا کردمی بە بەهێزترین کەسێك لەدنیادا، بۆ ئەو دونیاشم ئەو هێزەم پێویست بوو. پێشەوا پەیمانەکەی بەجێ گەیاند و گەیشتمە بەهەشت. بۆ ئەو چوونەم بۆ بەهەشت بەسەرهاتێکی مەزن هەبوو، ئا بیرم کەوتەوە، با بۆ کات بەسەر بردن بیگێڕمەوە.

سێ ساڵ لەمەو بەر، لە ئاواییەکی نزیك نەهاوەند زۆر بەوریایی چاودێری کاروانێکی سوڵتانم دەکرد، هەر کە لەئەسفەهان دەرچوو بوو، پێیان ڕاگەیاندم لەنێو کاروانەکە وەزیرێکی دەوڵەتی عوسمانی بەناوی(نیزام مەلیك)ەوە هەیە، سەلجوقی بوو، لەو سەلجووقییانەی جێنشینی بنەماڵەی عەباسی دەسەلاتیان پێدرابوو پلەی دادوەریان دەدا. ئەم (نیزامە) ئامانجم بوو. ئەم پیاوە کێشەی خستبووە نێو دەوڵەتەکەمان(نزاری)ەوە، ئامانجمانی بۆ لەناوبردنی جێنشینی دەوڵەتی عەباسی پەکخستبوو. لەپڕێ

کاروانەکە وێستا، چاوم لە ئامانجەکەم نەبڕی، لە ئەسپەکەی دابەزی، هەموو سوارەکان لە ئەسپەکانیان دابەزین.

کاروانەکە دەوری (نیزام)یان دا، ئەو قسەی بۆ دەکردن، ئەوانیش گوێیان بۆ ڕادێرابوو، پێدەچوو هەلەکەم بۆ ڕەخسابێت، ئەگەر ئێستا دەستی خۆم نەوەشێنم، دەبێت ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بم تا دەرەفەتم بۆ دروست دەبێت. ئەسپەکەم شاردەوە، عەباکەی سەرشانم داکەند، جلکێکی شڕم لەبەر کرد، خۆم لە خۆڵەکە گەوزاند، سەرو قژم لە خۆڵەکە وەردا، لە سواڵکەرێك سواڵکەرتر دەچووم، دواجار خەنجەرەکەی ژێر کراسەکەم سەح کردەوە کە شاردبوومەوە، هەروەك گەدایەك لێیان نزیکبوومەوە:

- بەڕێزان ئا لێرەدا کوژران، سەحابەیەکی زۆر لەم نزیك ئاواییە کوژران، خۆشبەختی بەهەشتیان پیرۆزە ئینشائەڵا، جێگایان جێی بڵندی بەهەشت بێت.

ئەم وەزیرە مارە چی لەجێگا بڵندەکانی بەهەشت دەزانێت، ئەو گێلانەش دەڵێی پێغەمبەر قسەیان بۆ دەکات، وا گوێقولاغ بوون. ڕاستە و ڕاست بەرەو وەزیرەکە بەڕێکەوتم و پێمگوت:

- گەورەم، پیاوێکی باش دیاریت، لەوەی خودا پێیداوی، وێمبدە، خێرم پێ دەشێت.

- گەورەم.. لە ساختەچی دەچێت، هیچی مەدەرێ، نە کەمئەندامە نەشەل و گۆجە.

- نا.. دەیدەمێ، پێغەمبەر (د.خ) پێمانی ڕاگەیاندووە.. داواکار ئەگەر بەبان ماینیشەوە بوو، بیدەنێ. دەگێڕنەوە عیسا (ڕ.خ) گوتوویەتی داواکار هەقی خۆیەتی بەبان ماینێکی لەزیو بارکراویش بێت بیدەنێ.

ما قسەیان بۆ بکات و لێیان بڕوانێت، لەپڕ خەنجەرەکەم لە لاقەبرغەی گیر کرد، ئەودەم بێدەنگبوو، نیگایەکی تێبڕیم، بەلامەوە سەیر دەهاتە بەرچاوم. خەڵکەکە شپرزەبوون، ئەو کەوتبووە گیانەلاَن، پاسەوانەکانی شمشێریان لێ ڕاست کردمەوە، وەلێ وەزیر ڕێیی نەدان و گوتی:

- بکوژەکەم مەکوژنەوە، من لێی خۆش بووم.

یەك چرکە لێی نەوەستام بە زەلیلی خۆم پێچایەوە و بلەز هەڵهاتم، ترسام دووم کەون، چونکە بەهۆش خۆیان نەهاتبوونەوە. خۆم گەیاندەوە قەلاَکە، پێشەوا(حەسەن سەباح) بەگەرمی و دەستخۆشییەوە پێشوازی لێکردم. ئەو شەوە خەونم جارێ وەئاگا نەهاتبووم، دوو فریشتە دەستیان گرتم و بەرەو بەهەشت بردیانم، نوکە لە مەبەستی پێشەوای مەزن حاڵیبووم، کە گوتی:

" ئەگەر کوشتتان دەچنە بەهەشت، ئەگەریش بەخۆتان کوژران، هەر دەچنە بەهەشت"

ما یادەوەرییەکانم بەسەر بکەمەوە، تا گەیشتنم بەم ئامانجەم، قودس کۆشکی ئامووری مەلیك خاچپەرستان و پاشای قودس و ڕۆژگارەکانی. چوومە بەردەم پاشای خاچپەرستان، نامەی پێشەوای مەزنم وێدا، کە بۆ پاشای ئامووری مەزن نووسرابوو.. ئەگەر نامەکەم پێتان گەیشت، بزانە من

لە لایەنگرانی تۆم، پێشنیاریش دەکەم، هێزەکانمان یەکخەین بەرامبەر دوژمنی هەردوولامان، کە دەوڵەتی عەباسی زۆردار و داگیرکەرە، هاوەڵە دڵسۆزەکانم لە ئامادەباشیدان بۆ هەر هێرشکردنێك بەمەرجێك باجی ساڵانەمان لەسەر لابەن، کە سوارچاکانی هەیکەل لێمانی دەسێنن، ئەویش بڕی دوانزە هەزار پارچەی ئاڵتوونە، دوای ئەوەی پیاوەکانم (کۆمتی دی تریبۆلی)یان کوشت، ئەمەش سەرەتایەك بۆ هاوپەیمانێتی نێوانمان دەبێت، بەرامبەر دوژمنی هەردوولامان. خودا پشت و پەنای سەرکەوتووانە.

ئامووری پاشا بەو هاوپەیمانییە ڕەزامەند بوو. پێدەچوو پێشەوای مەزن پیلانێکی باشی هەبێت، پێشەوا لەهیچ پیلانێکیدا شکستی نەهێناوە، خودا ئاماژەی پێدەکات. بەلای منەوە ئەمەش گرنگ نەبوو، سەرقاڵی ئەو چالاکییە بووم کە بەسەرکەوتوویی ئەنجاممدا. دڵخۆشبووم بە سەربەرزییەوە دەچمە لای پێشەوای مەزن و چاوم بەو بەهەشتە دەکەوێت کە خەونم پێوەی دەبینی. سواری ئەسپەکەم بووم و بەرەو قەڵاگەڕامەوە، مێشکم هەر لای ناز و نیعمەتی بەهەشت بوو، ئەو ئاوازە سروشتییە، ئەو ڕووبارەی ئەمبەر و ئەوبەری پەرییان لێی ڕاکشاون.

- هەواڵێکم پێگەیشتووە، سوارچاکانی نزاری ناشکێن.

بلەز ئاوڕم لەدووی خۆم دایەوە، بەدووی دەنگەکە گەڕام، دەستیشم بەسەر مستی خەنجەرەکەمەوە بوو. شۆڕەسوارێکم بینی، عەبایەکی بەسەر شانەوە بوو، هێمای خاچێك بەسەر عەباکەیەوە، عەباکەی کڵاودار بوو، ئەسپەکەی ژێریشی پەشتەماڵێکی بەسەر پشتییەوە، ئەویش هێمای خاچێکی بەسەرەوە بوو.، بەو پۆشاکەیەوە ناسیمەوە، کە لەسوارچاکانی

خاچپەرستانە و سوارەکانی هەیکەل، خۆم بۆی وریا کردەوە. بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئێوە پێتان وایە پێویستیمان بە چەند سوارێکی هەر وەکو کاغەزی وەك ئێوەیە، وادیارە سەرۆکەکەتان گێلە و خۆی ناناسێت.

بەزمانێکی توندتر بەرسڤم دایەوە:

- ئەی خاچپەرستی شرپوشێت، یەکجار پێت دەڵێم و دووبارەی ناکەمەوە، یەك وشەی تر بە پێشەوامان بڵێیت، لەخوێنی خۆتا دەتگەوزێنم.

سوارەکە عەباکەی لێ فرێدا و شمشێرەکەی هەڵکێشا، بەتاو شالاوی بۆ هێنام. ئەسپەکەی حیلاندی، بەپشتا خۆم بردەوە و خۆم لەسەر پشتی ئەسپەکە هەڵدایە خوارەوە، بەو ئاوایە خۆم لە ڕاوەشاندنی شمشێرەکەی پاراست، بەدەوری خۆمدا خولامەوە، عەباکەم لێ فرێدا و خەنجەرەکەم هەڵکێشا، تا تینم تیابوو لۆم هاویشت، خەنجەرکە لەملی ئەسپەکە چەقی، ئەسپەکە هەر ئەوەندەی پێکرا لەتاو ئازارەکەی هەردوو دەستی بەرزەوە کرد، سوارەکە لەسەر پشتی ئەسپەکە خۆی هەڵدا، بەرامبەرم گرت، دەموچاویم بینی، چاوێکی لەدەستدابوو، سەرو سیمای زۆر ناشرین بوو، بەدەنگێکی زل هاواری لێکردم:

- من( جاوتێر مایزنیل)م، لەدۆزەخ بە براکانت ڕابگەیێنە، کە من تۆی هیچ و پووچم بۆ لایان ناردووە.

بۆ دووەمجار شمشێرەکەی لێ ڕاست کردمەوە و بەغاردان بۆم هات، خۆمم لە شمشێرەکەی پاراست و لەسەر زەویەکە گلۆر بوومەوە، ئەوجا

شمشێرەکەم لێ هەڵکێشا. بەگاڵتەجاڕییەوە لێمی دەڕوانی. پێشتر لێی حاڵی نەبووم، دواتر تێگەیشتم لە پشتم دەڕوانێت. بلەز ئاوڕم لەپشتی خۆم دایەوە، دە چاوم بینی گاڵتەجاڕانە تێیان دەڕوانیم، شمشێرەکانیان هەڵکێشابوو، چاوێلێك هی مرۆڤی ئاسایی نەبوون، بەڵکو چاوانی شۆڕەسوارێلێك لەسوارچاکانی هەیکەل بوون .

جارێکی تر بەتووڕەییەوە تەماشام کرد، وەلێ ئەو بواری نەدام، ئاوڕدانەوەم بەسبوو تا ئەو مەودایەی نێوانمان ببڕێت، هەر ئەوەندەم زانی شمشێرەکەی لەسنگم چەقاند، لەسەر چۆك کەوتم، پێی لەسەر سنگم دانا و پاڵی بە شمشێرەکەوە نا، تا لەپشتمەوە دەرچوو. ئای لەو چرکەساتەی هەست دەکەیت دەمریت، ساتێکی ترسناکە، لەدیقەتدانی دەوروبەرت دەکەویت، کەچی دەگوزەرێت، بۆ کۆتاییت سەرقاڵی شتێکی تربیت، سەرەتا ژیانت دەکەوێتە بەرچاو کە دەڕۆیت و هەمووی جێ دەهێڵیت. دوای ئەوەی نمایشەکە تەواو دەبێت، پەردە دادەدرێتەوە. لەدەورو بەری خۆت دەڕوانیت، شوێن برینەکەت چاك دەبێتەوە، هەستێکی سەیر داتدەگرێت، هەوڵ دەدەیت خۆت گرد بکەیتەوە، بڕیار دەدەیت نەمریت، گشت ئەو خوێن و زامە نەترمێنن، مادام هەناسە دەدەیت نامریت. هێشتا لەسەر چۆك بووم، سوارەکان بەدەنگی بەرز دەخەنینەوە، سەرم بۆ لایان وەرچەرخاند، دەمویست شکست بەمەرگ بێنم. هەموو ئەوانەی مردن، خۆیان خۆیان بەدەستەوە دا، وەلێ من خۆم بەدەستەوە نادەم.

" ئەگەر کوشتیانت دەچیتە بەهەشت، ئەگەر کوژراشی هەر دەچیتە بەهەشت"

بەهەشت.. بەهەشتی نەمرییە، پڕە لەپەرییان، لە کچی نەشمیل، ڕووبار و ئاوازێلێك لەدنیاد نەبووە و نابێت. ئەگەر کوژرام دەچمە بەهەشت، پێشەوا پەیمانی وێداوم. ئەوەتا هەست بە قورساییەك بەسەر سنگمەوە دەکەم، هەناسەم قورسە، تا دێت دڵم دەگوشرێت، خوێن هەڵدێنمەوە، تا بڕستم لەبەر ماوە دەمەوێ بەهێز و توانامەوە هەناسە هەڵمژم، وەلێ ناتوانم. بە هەموو خۆباوەڕییەوە ویستم ئەم غایەلەیە لەخۆم دەرکەم، بۆم ناکرێ، زانیم کۆتاییمە، دەمرم، لەسەر لا لێی ڕاکشام.

هەر بەڕاست توانیم لەسەر لا ڕاکشێم، دیمەنەکان سەرەو خوار دەمبینین، پێی چوارپێی ئەسپەکان، خۆڵەتەپان، میروویەك بەسەر زەوییەوە دەڕوات گشت ئەمانە لەژیاندا دەمێننەوە، من دەمرم. گوێم لە ناڵە ناڵی ئەسپەکان بوو، لێم دوور دەکەوتنەوە. خەڵکەکە لێم نزیکەوە بوون، چەند بە حەسرەتەوەبووم یەکێکیان فریام کەوێت، هەر لێم نزیك دەبوونەوە، یەکێکیان دەسکی شمشێرەکەی گرت و لەسنگی هەڵکێشام، دەمبینین بەدەورمەوەبوون، دیقەتم دەدەن، بەچاوێلێکی بەزەییانەی عەرەبی لێیان دەڕوانیم. ئەو هەستەت چۆنە کە سەد کەس بە بەزەییەوە لێت بڕوانن، تۆش لەگیانەلادای. وەلێ ئەو پیاوەی لەوێیە کێیە؟

لەنێو کەللەسەرەکان بینیم، ڕەشتاڵەیەکە، هێدی هێدی دەهات و دەڕۆیشت، بەساردییەکەوە دیقەتی دەدام، چاوم لێ نەبڕی، تا کەوتە بەری پشتم، سەرم بە بنباری دەستیانەوە بوو. جاروبار دەستیان بە نێوچەوانمەوە دەگرت، وەلێ من لەخوارەوە دەمبینین، لەپڕ لەنێو دەمووچاوەکان دووبارە لێم دەرکەوتەوە، هەر ئەو ڕەشتاڵەیەبوو، کە...

من هەڵخەڵتاو بووم، سوور دەمزانی هەڵخەڵەتاوم، وەلێ نەمدەبردە سەر خۆی. دەمزانی شتێك هەیە هەڵەیە، پێشەوا، بەهەشتی نەمریی، کوشتنی زانایانی موسوڵمانان، هاوپەیمانێتی دەگەڵ خاچپەرستان، نە نوێژکردن، نە ڕۆژووگرتن، حەجیش هەر نا، گوایە ئێمە بە پلەیك گەیشتووین لەخودا نزیکبووینەتەوە، خودا گشت ئەو ئەرکانەی لەسەرمان لاداوە، دەزانێت لەباوەڕدارانیی ئەوین، کەمردین، بێ سێ و دوو دەمانێنرێتە بەهەشت، دواتر زیندوومان دەکاتەوە. دەیەوێ باوەڕی پێبکەین، وادەزانێت تەواو باوەڕمان پێ هێناوە، ئینکاری ناکەم، هەندێ شتم تێکەڵ بەیەك کردووە. کە چوومە بەهەشت، عەقڵم بەسەرمەوە نەما، وام هەست دەکرد سەرخۆشم، یا بەخەیاڵ هەڵدەفریم، پێشەوا هەموو شتێکی بۆ ڕێکخستووین، لەژن و ڕابواردن، هەموو ئەرکێکیشی لەسەرمان لادابوو، ئای چ ئایینێکە. ئەو ئایینەمان وەرگرت! نەمانزانی عەقڵمان لەپشتی خۆمان ڕۆ کردبوو.

ئەمڕۆ بەهەشتی نیم، ئاورێك ڕوحم دەسووتێنێت.. ئای خودایە تەنها ساتێکە ئەگەر بمگەڕێنیتەوە عەقڵی خۆم، ئەو پێشەوایە بەدەستی خۆم دەکوژم. دنیا تاریکبوو، هەستم بەخۆم نەدەکرد، دواتر درکم بەوە کرد تاریکی نییە، شتێکە لەتوونێل دەچێت، ڕوحم هەڵدەفرێت. هەستم کرد لەتوونێلەکە دەرچووم، بەرەو ڕووناکی. هەمان دیمەن لە گۆشەیەکی ترمەوە دەبینم، کەللەیەك لێم دەڕوانێت.

لەسەر ئەو لایەم وەرچەرخێنرامە لایەکەی ترم، چون ئەوەی دیمەنگەلی تر ببینم، خەڵکەکە وەك مرۆڤی زەبەلاح دەهاتنە بەر چاوم، ئەو خەڵکە لە دەمەوەریی خۆیان نەدەکەوتن، تەماشایان دەکردم، یەکێکیان زۆر لێم

نزیکبووەوە، پیرەپیاوێك بوو، زەردەخەنەیەکی مۆتەکەیی بەسەر لێویەوە دەرکەوت، گەیشتە سەر سەرم و بزەخەنەکەی والآتر کرد، ددانەکانی دەرکەوت، چەند تەڵەڕیشێکیشی بەردابوونەوە، چاوەکانی چون چاوی مار گۆڕا، چاوم ئەبڵەق بوو، تەماشای دوورم کرد، ڕووناکی بەدەرەوە نەمابوو، دەتگوت هەورێکی ڕەش بەری ڕووناکییەکەی گرتووە، ئەوە مردنە، ئەی خودایە من مردووم.

لەسەر زەویەکە دەتلامەوە، هەر بۆ ئەوەی دەموچاویانم لێوە دیار نەبێت. خەڵکەکەی دەوروپشتم دەیانویست شتێکم پێ بڵێن،

" بڵێ (لا إله إلا الله) خودا تەنهایە و خودایەکی تر نییە"

دەموچاوی پیرەمار لەنێو دەموچاوی خەڵکەکە دەرکەوتەوە، زمانی لێ دەرکردم.. ئەی خودایە ئەمە کێیە، ئیزرائیلە؟ خودایە بمگەڕێنەوە، ئەوەم پێ مەکە.

ویستم بەهەموو هێزمەوە هاوار بکەم، کۆکەیەك گرتمی.. کەسێکتان ڕزگارم بکات، یا یەکێکتان بمکوژێت. کەسێکتان هۆشیارم بکاتەوە، قورئانم لەسەر بخوێنن، هەرچییەکتان لەدەست دێ بۆ ڕزگارکردنم بیکەن.

هەندێ شوێن لەجەستەمدا بەگیر وەستا، دەبوو بجوولێمەوە، هەردوو لاقم لەسەر یەك دانا، کەمێك پشتم بۆ چەمانەوە، ئەوجا ملم بەگیر کەوت، هەستم بەتەنگە نەفەسی کرد، ئەوە پەیوەندی بە ملمەوە نەبوو، تەنگە نەفەسییەکە لەسینەمدا بوو، بەئاسانی گوێم لەترپەی دڵم دەبوو، دواتر دەرکەوتەوە، بینیم هەر خۆی بوو.

سێ کەس بوون، یەکێکیان ئەو ڕەشتاڵەیەبوو، کە لەنێو خەڵکەکەدا بینیم، ئەو دووانەیتر. یەکێکیان کوتومت وەك ئەو ڕەشتاڵە بوو، کە بینیم، ئەوی تریان لە هەردووکیان جوداتر بوو. ئەوەی بینیم فریشتە بوو، فریشتەی ڕاستی، وەك فریشتەی بنیادەمی نەبوو، کە لە بەهەشتی( حەسەن سەباح) بینیبووم! ئای چ ناوێکی قێزەونە، چەند ڕقم لێبووەتەوە.

ئەودوای ئەوەی کە ڕوویدا، هی گێڕانەوە نییە. بەهەر سێکیان ڕۆحم لەبەر هەڵکێشرا، وەك چۆن سیخ لە خوریی تەڕ دەردەهێنرێت. لەو ڕۆح هەڵکێشانەم، هەستم بەبۆنێکی بۆگەن کرد، چون ئەوەی گۆڕ بێت.. ئەی خودایە چما من بەم شێوەیە خراپم. ئەو ئازارەی من بینیم کەس نەیدەبینی، تەنها دڕکیان کرد خوێن لەشا دەمارەکانمدا لەگەڕ وەستا، چاوەکانم لە بینین دەکەوتن. ئەوان هیچیان نەبینی، وەلێ من ڕۆحی خۆمم بینی لەجەستەم جیادەبووەوە، فریشتەکان لە پەڕۆیەکی پیسیان نا. دواتر خۆشم بینی بەرز دەکرامەوە، هەموو شوێنەوارێکی بوونم لەسەر زەوی کوێرەوە بوو، شتی تر کە چاوی بنیادەمەکان نەیاندەبینی جێیان دەگرتنەوە، شتگەلێك نەدەبوو بنیادەم بیانزانێت، تەنها ئەوانەی کە دەمرن.

********

تەواو

ئەو ماوەیەی لەژیانمدا ماوە، بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات، چرکە چرکی کاتەکە چون ئەوەی قسەی ترسناکم بۆ بکات، وەلێ نا، جاری کاتم بەبەرەوەیە. ئەو ڕوو بە ڕووبوونەوەیەی کە لەمێژوودا هاتووە، دانسقەترین ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان دوو شۆڕەسوار بوو، سوارچاکی هەیکەل و تیپی تلیاکخۆران (الحشاشین)، کە ترسناکترین ڕووبەڕووبوونەوەبوو، تلیاکخۆرەکان سەر بە قەڵای(ئالاموت)بوو، کە ئەو قەڵایەیان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، حەفتا قەڵای تریشیان لە فارس و عێراق و شام داگیرکردبوو.

ئەگەر لەو سەردەمەدا ژیابوویتایە، لەهەر گۆشەیەکەوە بتڕوانیبایەتە قەڵاکە ، دیمەنگەلێکی ئەفسانەییت دەدیت، قەڵاکە وا دەهاتە بەرچاوت کە مۆڵگەی جنۆکان بێت، قەڵاکە شەش هەزار پێ بەرزە و بەهەور دەورە دراوە، قوولەکانی بەبان هەورەوەن، مەحاڵبوو مەنجەنیق پێیان بگات، هیچ لەشکرێکیش دڕی بەقەڵاکە نەدەبرد، مەگەر سەربازەکان لە توولە ڕێی سەر چیاکەوە بە شووراکەدا هەڵگژابن، ئەوەش زۆری لێیان بەکوشت دەدا. قەڵایەکی وا، وانەزانیت تەنها بینایەکی تیا بینا کراوە، چەندین بینای تیا درووست کراوە، حەسەن سەباح ناوێک دامەزرێنەری تلیکاخۆرەکان (الحشاشین) بوو، قەڵاکەش بە مەردوومەکەیەوە لەژێر فەرمانیدا بوون، ناوەوەی قەڵاکەش بەهەشت ئاسا بوو.

حەسەن سەباح.. لەوەتەی دەستی بەسەر ئەو قەڵایەدا گرتبوو، لێی نەچووبووە دەرەوە، کەس لەدەرەوەی قەڵاکە نەیبینیوە، تەنانەت لەچیاکەش نەبینراوە، زۆربەی کاتی بۆ پیلان گێران تەرخان کردبوو،

بەدیوێکی تر سەرقاڵی دەرمانی گژ و گیا دەبوو، بەتایبەت ژاراوەکانیان و لە پیلانەکانیدا بەکاری دەهێنا. داهێنانێکی کردبوو، بەوەی دەرمانێکی بێهۆشکەری لە گژ و گیا دۆزیبووەوە، بەرێژەیەك هەر خۆی سەری لێ دەردەچوو، دەرخواردی لایەنگرانی خۆی دەدا، تا بێ هۆش بن، ئەوسا چی لێ بویستابان، ڕەتکردنەوەی بۆ نەبوو.

توانای زۆر بوو، دراو هەبوو ناوی قەڵای(ئالاموت)ی بەسەرەوە بوو، واتە توانی کۆمەڵگایەکی سەربەخۆ پێکبهێنێت. بیروباوەڕی لادەریی هەبوو، ئامانجیان کوشتن بوو بەناوی ئایینەوە، ئەوەش بیروباوەڕێکی هەڵەبوو، کوشتن بۆ پارێزگاریکردنە لە ئایین، وەلێ کوشتن بەناوی ئایینەوە تاوانە.

تلیاکخۆرەکان (الحشاشین) لەبری جەنگ ڕێبازی تیرۆر کردنیان هەڵبژارد، سێ جار هەوڵیاندا(سەلاحەدین) تیرۆر بکەن، هەر هەموو هەوڵەکانیان شکستی هێنا. سەردەمیان بەوە کۆتایی هات، کە تەتەر(مەغۆل) لە خۆرهەڵاتەوە سەریان هەڵدا، ئەوانەی هەموو شتێکیان بهاتبایەتە بەردەم، لەناویان دەبرد، تۆوی لەشکری تلیاکخۆرەکانیان بڕییەوە، ئەوەشی مایەوە دواتر (زاهیر بیبەر) فەنای کردن.

ئەڵبەتە بە گەمەی ڤیدیۆی بەناوبانگ( Assassins Creed)ت بیستووە، یا بیروباوەڕی تلیاکخۆرەکان، ئەم یارییە لە گرووپی تلیاکخۆرە ڕاستەقینەکانەوە وەرگیراوە هەمان پۆشاك و چەك و هونەر و خراپ ڕەفتارییانەوە دروستکراوە.

دەزانم قسەکردن لەسەر بیروباوەڕی لادەریی ژەهر دەخاتە جەستەوە، بەم سەربردەیە کۆتاییمان بە بەسەرهاتەکانیان هێنا، دەرد و مەینەتی و

ئازاریش کۆتاییان پێهات، با چاو لەو کارتانە بگێڕین، کە تا ئێستا نامەوێ ناویان بێنم. ئەمجارە دوو کارتمان هەس، بەسن بۆ ئەوەی لەوەی بۆی دەچین حاڵیمان بکەن.

کارتی یەکەم.. کارتی (فامبایەر)ە، یانی خوێنمژەکان، وێنەیەکی ناشیرینی خوێنمژێکی ترسناکی بەسەرەوەیە.

کارتی دووەم .. کارتی ( کۆنت دراکۆلا)یە، وێنەیەکی (کۆنت دراکۆلا)ی بەسەرەوەیە، کەوا بەناوبانگەکەی لەبەردایە و بزەیەکی گاڵتەجارانە و ترسێنەری بۆ کردووە، لەپشتیشییەوە قەلا تاریکەکەی دەرکەوتووە.

*********



## بەشی شەشەم

# هۆ دراکۆلا بخوێنە

# ١٤٥٠ پاش زایین

- هۆ دراکۆلا بەدوامەوە بخوێنە.. دژ بەو دوژمنە نەفرەتلێکراوە کە ئەهریمەنە پەنا بۆ خودا دەبەم.

دراکۆلا بە بێزارییەوە چون ئەوەی بە عەجەمییانە بەدوومەوە کەوتە خوێندنەوە. تەماشای دەموچاویم کرد، نەمدەزانی بۆچی بەم گەنجە ناڕەحتبووم.

- لێرە لەتەکما وریا بە، مێشکە بچووکەکەت کێوە چووە، دەی بیلێرەوە.. "ئەگەر لەسەر زەوی بالا دەست بێت، خەراوی دەکات".

لەوە ناخۆشتر نییە دراکۆلا برات بێت، لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە دراکۆلا لەسیلەتدا بنوێت، لەهەر هەمووی ناخۆشتر...

- پرۆسەی کیلان و زورپییەت وێران دەکات، خوداش خراپەکاریی پێباش نییە.

ما دراكۆلا دوا بەدوای شێخ ئایەتەكان بڵێتەوە. دیاربوو دراكۆلا ڕقی لە مامە شێخ دەبووەوە، ئەوە سەیر نییە، براكەی من ڕقی لەهەموو كەسێكە و ڕقی لەمنیشە، تەنانەت خۆشی بەم جێگایەش نایەت، ڕقی لە قورئانە. ئەم دیمەنە سەرسامی كردیت، چاوەكانت بە شۆخییەوە واڵاتر كرد، چون ئەوەی وابزانیت چیرۆكێكی كۆمیدیت بۆ دەگێڕمەوە. نا.. هاوڕێ، ئەوە منم (ڕادۆ) بەگۆشت و خوێنمەوە و لەمزگەوت دانیشتووم، ئەوەش دراكۆلای برامە و لەتەنیشتمدا دانیشتووە و بەدوای شێخەوە ئایەتەكان دەڵێتەوە. شێخیش زوو زوو بەسەریا هاوار دەكات، ئەم دەبەنگییەی هەراسانی كردووە.

بۆ ئەوەی لەسەرسوڕمانت بخەم، لێگەڕێ سەرگورشتەكە لەسەرەتاوە بگێڕمەوە.. باوكم فەرمانڕەوای مەملەكەتی (واڵاكیا)بوو، گەلی واڵاكیا ناوی دراكۆلایان لێ نابوو، كە زاراوەیەكی ڕۆمانییە بەمانای ئەژدیها دێت، باوكم لەڕێكخراوی سوارچاكەكان بەناوی ڕێكخراوی ئەژدیها ئەندام بوو، باوكم نیشانەی ئەژدیهای لەسەر دراوەكە دانابوو، هەر هەمان نیشانەی بەسەر قەڵغانەكانی جەنگیشەوە دانابوو، ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی نازناوی دراكۆلا بەسەر باوكمدا بسەپێنرێت.

- گەورەم دراكۆلا.. نامەیەكمان لە سوڵتانی عوسمانییەوە پێگەیشتووە.

- كەواتە كێشەكان دەستی پێكرد، گوناهی ئێمە هەر ئەوەندەیە كەوتووینەتە نێوان بەرداشی دەسكە هاوەنی عوسمانییەكان و سندانەی هەنگارییەكانەوە. ئەوان دەیانەوێ یەكتر ببڕنەوە، بەلایانەوە گرنگ نییە، واڵاكیاش لەو بەینەدا ببێتە دۆزەخ.

دراکۆلا نامەکەی سولتانی بەهەند وەرگرت و خوێندییەوە.. دەولەتی عوسمانی بەرامبەر پارێزگاری کردنتان لەهەنگارییەکان سەرانەتان دەخاتە سەر، بەو مەرجەش هەرکاتێك پێویستی بەسەرباز بێت پیاوەکانتان بێننە ریزمانەوە، داواکارین بەزووترین کات وەلامان بدەنەوە. ئەوەی باوکم کردی شتێکی زۆر سەیربوو، من و دراکۆلای براگەورەمی بۆ (ئەدریانۆبل) یان (ئەدرنە)نارد، کە شوێنی سولتانی عوسمانی موسولمان بوو.

-دارکۆلا وەك (ڕادۆ)ی برات فێر بە، ئەو تا ئێستا دە ئایەتی ئەزبەر کردووە، جەنابیشت یەك ئایەت چییە لەبەرت نەکردووە.

ئەوەی دراکۆلای باوکمان کردی زیرەکانە بوو، مەحالبوو پەلاماری دەولەتێك بدات، کە خودی جگەرگۆشەکانی خۆی بۆ ئەو ولاتە وەك متمانە ناردووە. من و دراکۆلای برام تەمەنمان لەدوانزە سالی تێپەڕی نەکردبوو، خۆمان بەنامۆیی لەولاتی غەریباندا بینییەوە، کە بینا و پۆشاك و مێزەرەکانیشیان بەلامانەوە نامۆ بوون، تەنانەت ڕیش بەردانەوەیان و شێوازی کۆشکەکانیشیان بۆ ئێمە نامۆ بوون. براکەم ڕقی لەهەر هەموو ئەمانە دەبووەوە، وەلێ سولتانی موسولمانان گرنگی تەواوی وێدابووین، فێری ئەسپسواری و ڕمبازی و زانست لە هەموو بوارەکان بەتایبەت زانستی ئیسلامی کردین, دراکۆلا بەوانە خۆشحال نەبوو، وای هەست دەکرد دەستبەسەرە و ئەوانیش دوژمنین. ئەوان کە فێریان دەکردین بۆ ئەوەی ڕقمان لێیان نەبێتەوە، وەلێ بەلای منەوە بارودۆخەکە ئاسایی بوو.

- هۆ گەنجی قژ ئالتوونی ناوت چییە؟

- ناوم (ڕادۆ)یە، ئەدی تۆ؟

- من محەمەد کوڕی موڕاد، کوڕی سوڵتانم.

نەمزانی منداڵی و هەرزەکاریم لەتەک محەمەدی کوڕی موڕاد دەبەمەسەر، ئەو پیاوەی دوای چەندین ساڵ بە (محەمەدی فاتیح) ناوبانگی دەرکرد، هەر ئەویش بوو ( قوستەنتینییە)ی فەتح کرد.

من و محەمەدی فاتیح دوو هاوڕێی خۆشەویست و دڵسۆزی یەکبووین، تا تەمەن هەڵدەکشا زیاتر هاوڕێیەتییەکەمان بەهێزتر دەبوو، هەردووکیشمان دژایەتیی ئاکاری دراکۆلامان دەکرد، محەمەدی فاتیح و دراکۆلا هەر لەمنداڵییەوە خۆشییان بە یەك نەدەهاتەوە، گرفتیشیان ئەو پێکەوە ژیانە بوو، کە فەرزکرابووە سەریان. هەر بەیەکەوە فێری سوارچاکی و ڕۆشنفیکری و زانستەکان بووین، ئەوەش بەلامەوە نامۆ نەبوو، ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، یەکێکیان شۆڕەسوارێکی چاپووك و ئەوی دیشیان ئەهریمەنێکی ڕاستەقینەبوو.

- ئادەی ڕادۆ تیرەکەت بهاوە.. دەی تێیبگرە.

تیرەکەم هاویشت و لەناوەندی ئەو بازنەیەی بەسەر تەختەکەوە نەخشێنرابوو، چەقاندم. بۆ خۆم هەر لەمنداڵییەوە نیشانە ڕاست بووم، وەك سەرکەوتنێك من و محەمەدی فاتیح ناولەپمان لەیەکدا و لەسیلەیدا وەستام تا ڕێ بۆ دراکۆلا چۆڵ بکەم.

- دراکۆلا نۆرەی تۆیە، تیرەکەت باوێژە.

دراکۆلا تیرەکەی لەکەوان ڕاکێشا و ڕووی لەتەختە نیشانەکە بوو، لەپڕ ئاڕاستەی تیرەکەی گۆڕی و ڕووی لە من و محەمەدی فاتیح کرد، بە ڕقەوە لێیدەڕوانین، لەترسا چاوم ئەبڵەق بوو.

- دراکۆلا.. ئەوەچییە، تۆ شێت بوویت، ئەوە چی دەکەیت؟

دراکۆلا تیرەکەی بۆ هاویشتن لەئامادەباشیدا بوو، لەچاوتروکانێك تیرەکەی بە ئاڕاستەی نیشانەکە گۆڕی و هاویشتی، ڕێك لەناوەندی بازنەکەی چەقاند. هەستم کرد ئاواتەخوازبوو، دڵی محەمەدی فاتیح لەجێی نیشانەی بازنەکەدا بوایە، یانەخۆ دڵی من.

شەش ساڵمان بەو حاڵە بەڕێخست، چووینە قۆناغی هەرزەکاریی. ئەوەتا هەرسێکمان بە ئەسپە ڕەسەنە عارەبییەکانمان لە پێشبڕکێداین. نووکە من قژێکی ئاڵتوونیی درێژم هەیە و بەسەر شانمدا شۆڕ بووەتەوە، بەڕادەیەك کچان ئێرەییان بە قژم دەبرد، سەروسیمایەکی جوان و دەنگێکی پیاوانەم هەبوو. هەرچی دراکۆلا بوو، قژێکی ڕەش و درێژ و لوولی هەبوو، سمێڵێکی گەورەشی بەردابووەوە، کە باز دەیتوانی بەسەریەوە بنیشێتەوە، محەمەدی فاتیح ڕیشێکی تەنکی هەبوو، لووتی درێژ و دووچاوی بریقەداری هەبوون، چون ئەوەی لەچاوانییەوە زیرەکیی سوارچاکییەکەی دەرکەوێت. دواتر ئەو هەواڵە گەیشت کە دراکۆلای باوك کۆچی دوایی کردووە، ئەوەش پیلانێکبوو (بوویار) دانابوو (ئەوە وشەیەکە لە واڵاکیا بە پیاوماقووڵان دەوترێت). ئەو هەواڵە هاوکاتبوو لێل سەختترین ڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمانی و سەرقاڵبوونیان بەجەنگەوە، کە ئامادەباشیی بۆ فەتحکردنی ئەو وڵاتانەی دەوروبەر وەك قوستەنتینییە کە شوێنیان سەخت بوو. من بە

وشەی (ئێمە) دەدوێم، چونکە من موسوڵمان بووبووم، وەک سوارچاکێکی موسوڵمانیش ئامادەی جەنگ بووم، وەڵێ دراکۆلا هەر لەسەر ئاینی خۆی مابووەوە. دراکۆلا لەلایەن محەمەدی فاتیح بەرەو والاکیا ڕەوانە کرا، تا لەبری باوکی ببێتە فەرمانڕەوا و هەروەک ئەو سەر بە دەوڵەتی ئیسلامی بێت. بۆ خۆیشم لێرە مامەوە و ویستم شەرەفی گەورەی فەتحی قوستەنتینییەم پێ ببڕێت.

داواتەکەی والاکیا ئەمسەر و ئەوسەری بۆ نەبوو. سەرپەرشتیاری داوەتەکە ( کۆنت دراکۆلا)بوو، میوانەکانیش پیاوماقوولانی (بوویار)بوون تاتوانییان لە خواردن و خواردنەوە دەستیان نەپاراست، تا مەست مەستبوون. ئەوجا دراکۆلا پرسیارێکی ئاڕاستە کردن و گوتی:

- ئەی پیاو ماقوولانی مەزن، پێمبڵێن لەمێژوودا چەند سەرۆک فەرمانڕەوایی والاکیایان کردووە؟

هەندێکیان گوتیان دە فەرمان ڕەوا، بڕێکی تر کردیان بە دوانزە، کۆمەڵێکی تر سێنزەیان درکاند. دراکۆلا بەتووڕەییەوە، ئەهریمەنانە هاواری بەسەریانا کرد و گوتی:

- ئەوە لەبەر ئەوەی ئێوە خیانەتکارن، گۆشتی فەرمانڕەوا دەخۆن، بەر لەوەی فەرمانڕەوایی بکەم. چەند ساڵم بۆ فەرمانڕەوایی پێ دەسپێرن؟

لەدیمەنەکەی دواتر، داروەستەکەی دراکۆلا شالاویان بۆ بوویارییەکان برد، لەهەموو لایەکەوە کەوتنە وێزەیان و کوشتنیان، دراکۆلا لەدوور ڕا وەک تەماشاکار نەوەستابوو، شمشێرەکەی هەڵکێشاو بەربووە ناویان، ئەوەندەی

لێکوشتن، خوێن بە دەمی شمشێرەکەیەوە دەچۆڕا، وەلێ هێشتا زۆریان بە زیندوویی لێ مایەوە، دراکۆلا بەتووڕەییەوە لێی ڕوانین و بەپاسەوانەکانی گوت:

- بیانبەن بۆ قەڵاکە با لەتەک جوتیارەکان خەریکی نۆژەنکردنەوە بن.

ئەوجا بەزمانێکی توندتر گوتی:

- با لەلای باکووری قەڵاکە دەستبەکار بن.

پشتی لای باکووری قەڵاکە خەرەندێکی هەزار بەهەزار بوو. هەموو ئەوانەی کە بۆ ئەوێی ناردبوون، یا لەبرسا یا لەژێر ئەشکەنجەی کارکردندا مردن، ئەوانەیش کە بەخۆ بوون، تووڕی دەدانە خواری خەرەندەکەوە. ئەوجا بەرامبەر هەموو ئەو ئاکنجییانەی مەملەکەتی والاکیا لەژن و منداڵ و پەککەوتەکانیشیان دەستی بەهەڵمەتی ڕەشبگیریی کرد، کە هەڵمەتێکی قڕ کردن بوو.

بەدیوێکی تر منیش سەرقاڵی فەتحی قوستەنتینییە بووم. بەڕاستی محەمەدی فاتیح فەرمانڕەوایەکی سەرکەوتوو بوو، مێژووش شایەتحاڵی سەرکەوتنەکانێتی. سەرکردەیەکی وریا و زیرەك و چاپووك، سوارچاکێکی بێ وێنە، پاڵەوانی زۆر لەداستانەکان، ناتوانم تەواوی وردەکارییەکانی باس بکەم، لەکۆتاییدا قوستەنتینییەمان فەتح کرد و کردمان بە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی.

میر محەمەد لە گۆڕەپانەکە وێستا و تەماشایەکی کردم، گوتی:

- ڕادۆ لە والاکیا خەنە لەقژی پیاوان دەدەن؟

بەسەرسوڕماوییەوە دەستم بۆ قژە سەری خۆم برد، دواتر کە لێی حاڵیبووم، بزەخەنەیەکم بۆ کرد، گوتم:

- گەورەم خەنەم لەشمشێرەکەم دەگرت، پریشکی خەنەکە قژی گرتمەوە!

سەروگوێلاکم لەپریشکی خوێنی دوژمنان سوور ببوو، وەلێ بەلامەوە گرنگ نەبوو، ئەوەی نیگەرانی کردم، ئەو هەواڵەی پەیکی دەوڵەت پێی ڕاگەیاندین.. والاکیا بڕیاری یاخیبوونی خۆی بەسەر دەوڵەتی سوڵتان داوە. ئەوەی لەمێشکیدا بوو، کردی. محەمەدی فاتیح گوێی بەهەواڵەکە نەدا، تا لێڵی نەخاتە ئەو سەرکەوتنەی بەدەستمان هێنابوو، بۆیە هیچی نەگوت. چاك دەمزانی محەمەدی فاتیح کە بێدەنگ دەبێت، ئەوە مانای شەڕێکی تازە لەبەردەممماندایە، شەڕێك لەگەڵ خزمان.

دراکۆلا لە والاکیا خەریکی شتێکیتربوو، بە خستنە ڕووی کەڵبەکانیمان زانی، ما بیر لە چڕنووك و شاخەکانی بکاتەوە. لێلما وەرە بۆ والاکیا تا بەچاوی خۆت ببینیت.

پێنج کەس بەدەور کەسێکەوەن هاوار و ناڵەی دنیایان گرتووەتەوە، پێنج کەسەکە خۆیان دەهێنا و دەبرد، دەیانویست شتێکی لێبکەن، کەمۆکەیەك لێی دوور کەوتوونەتەوە، دەتوانیت ببینیت، دەیانەوێ چبی لێبکەن. گوریسێکیان بەمەچەکی دەستی ڕاستییەوە شەتەکدا، یەکێکیتریان بەمەچەکی دەستی چەپییەوە، سێیەم گوریسیشیان بەلاقی ڕاست و

چوارەمیشیان بەلاقی چەپی شەتەکدا، دوو لەو پێنج کەسە خۆیان هاویشتبووە سەر سنگی، سێیەکەی تر هەر سەرە گوریسێکیان بە ئەسپێکەوە بەست، ئەویش تا دەهات ناڵە و هاواری بەرزتر دەبووەوە، ئەوجا خورپییانە ئەسپەکان و هەریەکەو بە ئاراستەیەکی جودا لەوانی تر تەکانیان دا. زەلامەکە بەوای شەتەکی گوریسەکانەوە لەزەوییەکە بەرزەوە بوو. ئەسپەکان تەکانیان دەداو زەلامەکە باوکەڕۆی بوو، ئێدی ئەسپەکان قامچی تاو دران، هەریەکەو پارچەیەکی لەجەستەی زەلامەکە کردەوە، تا لە لیس خۆیان بپارێزن.

ئەوەش زەلامێکی تر بەدەست دوو زەلامی کەتەوە هاوار و ڕۆڕۆیەتی ، زەلامە کەتەکان زۆری لێدەکەن چۆك دابدات، زەلامێکی زۆر کەتەو بەخۆ دارسینگێکی درێژی بەدەستەوەیە، لەکۆمی کابرای دەبڕێت، هەرچەند ئەملا و ئەولا دەکات، وەڵێ بێسوودە، دواتر هەردوو دەست و قاچی دەبەستنەوە، ئەوجا بەسێ قۆڵی دارسینگەکەی تێدەبڕن و دارسینگەکە بەرز دەکەنەوە و لە چاڵێك بۆ ئەو مەبەستە کردوویانە بەقیت کراوی دەیچەقێنن، زەلامەکە بە دارسینگەکەی لەکۆمی ڕایان کردبوو، دەتگوت بەسەر ئەو دارسینگەوە ڕۆنیشتووە، بەوشێوە دەیهێڵنەوە تا ڕوحی دەردەچێت. کێشەی گەورە لە دارسینگەکە نییە تێیانبڕیوە، کێشەکە لەوەدایە ئەو دارسینگەیان وا بۆ تاشیوە زوو بە زوو لە دوویەوە دەرنەچێت، هێدی هێدی بەهەناویدا بڕوات و ئازارو ئەشکەنجەکەی زوو بە زوو نەبڕێتەوە. ئێدی تیایانە تاقێك دەمێنێتەوە، تیاشیاندا ڕۆژێك تیایدا دەمێنێتەوە تا ڕۆحی دەردەچێت. بەو

داره دەگوترێت( خازووق[1] )، ئەوەش کە لەمێژوودا ناوی هاتووە لەداهێنانی دراکۆلایە.

پێدەچوو دراکۆلا ئەشکەنجەی خازووقەکەی بەدڵ بووبێت، بۆیە جاروبار هونەری تیا دادەهێنا، جارێك خازووقەکەی لەدەمیان ڕادەکرد و سەربەرەوخوار دەیچەقاند، جارێکی تر خازووقەکەی لە مەڕجی ژنان ڕۆ دەکرد، هەندێ جاریش لەناقرگەی منداڵانی دەچەقاند. ئەو برا شێتەی من بە تەواوی عەقڵی لەدەستدابوو، یانەخۆ شەیتانێکی ڕاستەقینەبوو، پێمان نەدەزانی. تا وایلیهات ئەو ئەشکەنجەدانەی بەفەرمی کرد. هەرکەسێك کارێکی نابەجێی کردبا، بەوشێوازە سزا دەدرا، ئەوەی دزی کردبا، یا ئەوەی درۆی کردبا یاخود شەڕانگێزیی کردبا خازووقیان تێدەبڕی. کار گەیشتە ئەوەی عەقڵ قبووڵی ناکات، با ئەو دیمەنەشت پێشان بدەم.

شوێنی ئەشکەنجەدان هەموو ئامرازێکی تێدا ئامادە کرابوو. لێرەوە کورتەی هەندێك لەو ئەشکەنجەدانانەت بۆ دەگێڕمەوە.. عەرشی دراکۆلا ئەهریمەنێکی بنیادەمی بەسەرەوە دانیشتووە، خواردن و خواردنەوە لەبەردەمیدایە، لەسیلەی خۆیشی یەك لەپیاوە ماقووڵەکانی پۆڵەندیی دانیشتووە، بەیەکەوە خواردن دەخۆن و دەخۆنەوە. لەبەرامبەریشیان کۆمەڵێك خازووق تێبڕاویان هەڵواسیوە، هاوار و ناڵەیان پیاوی کاس دەکرد. بۆ خۆی دراکۆلا بەو هات و هاوارە دڵخۆش بوو، وەلێ پۆڵەندییەکە دەستی بەلووتیەوە گرتبوو، لەتاو بۆنی بۆگەنی خەریکبوو بڕشێتەوە، ئەوانەی خازووقیان تیا بڕابوو، تیایاندا بوو تازە دارسینگەکەیان تێبڕیبوون، هەشبوو

---

[1] نەقیزە , داری تێبڕین.

چەند ڕۆژێکبوو، بۆگەنییان کردبوو، دراکۆلا بەو بۆنەوە دەیانیهێشتەوە. دراکۆلا ئاوڕی لە کابرای پۆڵەندی دایەوە و گوتی:

- ئەوە چیتە؟
- گەورەم لەبەر بۆنیان خۆم پێناگیرێت.
- کێشە نییە، هەر ئێستا چارەسەری دەکەم.

ئیشارەتی بۆ دارودەستەکەی کرد، لەیەکرا شالاویان بۆ پۆڵەندییەکە برد، فەرمانی وێدان خازووقێکی درێژی تێبڕن! پیاوە ماقووڵە پۆڵەندییەکە هاواری لێ هەستا، دەستی بەگریان کرد. دارەکەیان لەکۆمی بڕی و بەرزیان کردەوە، دراکۆلا تەماشای کرد و گوتی:

- هاوڕێی ئازیزم، ئەوەتا تۆ لەبەرزیدای، ئیتر بۆنی بۆگەنیت پێناگات.

دراکۆلا دەستی بردو پەرداخێکی سووری بەسەرەوە نا، واپێدەچوو شەراب بێت، وەلێ وانەبوو، بەڵکو خوێن بوو، خوێنێکی تازە. خوێنی ئەو قوربانیانەی تێکەڵ بەمەی دەکرد و لێڵ[1] هاوار و ناڵەناڵیان دەیخواردەوە. ئەوە باشترین خواردنەوەی بوو، خوێنەکە بەدەم و لێویەوە بۆ سەر چەناگەی چۆڕاوگەی دەبەست. دراکۆلا خەڵکی لەمەنجەڵی گەورە گەورە دەکرد و دەیکوڵاندن، ئەوجا فەرمانی بە دارودەستەکەی دەدا، بەشمشێر لەناو مەنجەڵە کوڵاتوەکە لەت و پەتیان بکەن. ئافرەتی تەمەڵ و تەوەزەڵ دەستەکانی دەبڕینەوە، بەنووکی خازووقەوە دەستەکانی هەڵدەواسین، تا

[1] لەگەڵ.

ببێتە عیبرەت بۆ ژنانی تر. جارێکیان هەموو سوالکەر و هەژاران و نەدارانی بانگهێشتی نانخواردن کردن، دوای ئەوەی لەنان خواردن بوونەوە، هەرهەموویانی کوشت، بە وتەی خۆی ئەوانە بێکەڵکن و لەبەردەم پێشکەوتنی دەوڵەت گرفتن. با ئەوەندە بەسبێت لە گێڕانەوە، خۆ ئەگەر هەر هەموویت بۆ بگێڕمەوە، ئەوا چەندین ڕۆژ و شەو دەبێ بخەینە سەر یەك بۆ گێڕانەوەی. بەکورتی جیهان کەسایەتییەکی وەك ئەمی بەخۆیەوە نەبینیوە، شێتێك بوو لەو گۆڕەی، کارەساتەکە لەوەیدابوو ئەوەی مێشکی لەدەستدابوو برام بوو.

زۆری نەبرد محەمەدی فاتیح بە سوپایەکی زۆرەوە بەرەو والآکیا کەوتە ڕێ، منیش لێلیاندابووم و گەیشتینە ڕووباری (دانووب)، سەربازەکانی دراکۆلامان لەوەبەری ڕووبارەکەوە لێ دیاربوون. محەمەدی فاتیح بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە بە بێ شەڕ یان دانی سەرانە یان شەڕ، دوو نوێنەری خۆی لە باشترین نوێنەرەکانی نارد لای بەرامبەرەکەی، هەردوو نوێنەرەکە موسوڵمان بوون، چوونە بەردەم دراکۆلا لە قەڵاکەی. پێشتر هەموو خازووقەکان لابرابوون، ئەویش بێ مەبەست نەبوو.

- سڵاوی خودات لێبێت فەرمانڕەوای والآکیا، نامەیەکمان لەسوڵتانەوە بۆ هێناویت، دەڵێت...

- ئەو داپۆشەرەی سەرتان داکەنن.

نوێنەرەکان سەیریان پێهات، بێدەنگبوون. دراکۆلا بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئەوەی سەرتان لادەن، ئەو مێزەرە ناشیرینە چیین بەسەرتانەوە.

- ئەوە دەستووری دەوڵەتی عوسمانییە.
- باشە با وابێت، هەرچۆنێکتان پێخۆشە با وابێت.

ئیشارەتی بۆ داروودەستەکەی کرد، چواردەوری نوێنەرەکانیان گرت و باڵبەستیان کردن، ئەوجا بزماری وردی هێناو مێزەرەکانی بە کەللەیانەوە بزمار ڕێژ کرد! خوێن بەسەر و ملیاندا هاتە خوارەوە, ئەوجا پێی گوتن:

- بەو شێوەیە مێزەرەکانتان بەسەرتانەوە هەتا هەتایە دەمێنن، بچنەوە بۆ لای سوڵتانەکەتان و پێی بڵێن، ئەوە دراکۆلا نییە ئەم دەستورەی لەبیر بچێتەوە، وام بۆ داکوتیون، نەبێتەوە.

بەسەر و گوێلاکی خوێناوییەوە گەڕانەوە، بەسەرهاتەکەیان بۆ سوڵتان گێڕایەوە، سوڵتان تووڕەبوونێک تووڕەبوو، لەتەمەنیدا نەمبینیوە وا تووڕەبێت. فەرمانی بە بیست هەزار سەربازدا هێرش بکەنە سەر واڵاکیا. ئەو سوپایەی تەرخانی کردبوو بۆ هێرشەکە سێ بەقەد سوپای دراکۆلا دەبوو، بە سەرکردایەتی پیاوێك بەناوی (هەمزە)ەوە، کە لەباشترین و سوارچاکترین سەرکردەکانی بوو.

سەیر لەوەدابوو، کەس مەزەندەی شکانی ئەو سوپایەی نەبوو، شکانێك شکا وێنەی نەبوو. محەمەدی فاتیح ئەسپەکەی لەسەر دووپێ وەستاندو وەك تیر لەکەوان دەربچێت، تاوی دا، ئێمەش نزیکەی بیست هەزار سەربازێك دەبووین و کەوتینە دووی. ڕووبارەکەمان بڕی و بۆ تۆڵە سەندنەوە هەموو بەگوڕ بووین.

بیرەوەری فـەتحی قوسـتـەنتینییەم كەوتـەوە یـاد، بـەنێو بیست هـەزار سەرباز غار بدەیت و دنیا بهاویتە پشتی خۆت، تەنها چاویشت لەشەهیدبوون بێت. ناتوانم بەتەواوی ئـەو سـاتە بخەمـە هزرتـەوە، ئـەوەتا لەدەرگاكانـەوە دەچینە نێو شار.

لەپێشـەوەی لەشـكرەكە هەسـتم بەجووڵەیـەكی نـامۆ كـرد، بـۆ خـۆم لەناوەندی لەشكرەكەدا بووم، هەرهەموو سەربازەكان جڵـەوی ئەسـپەكانیان توند كرد، گوێم لە پڕمە پڕمی گریان بوو، نەمزانی چییە، هۆكاری وەستانی سەربازەكان چیبوو؟ بەرەو پێشەوە غارمدا، لـەپڕ ئـەو دیمەنـەم بینـی، كە باس ناكرێت بۆ ئەو كارەساتەی بینیم، چاوم چووە پشت سەرم، سـەربازانی سوپاكە وەستابوون، چون ئەوەی عەقڵیان بڕی ئەو دیمەنە نەكات، تەنانەت سوڵتان بۆ خۆیشی نەیتوانی هەنگاوێكی تر بنێت.

بڕوانە بەردەمت، ئەوەی ئێمە دەیبینین، تۆش دەیبینیت؟ دارسـتانێكی گەورە، نەخێر دوو دارسـتانی بەرامبـەر بەیـەك، بـەملا و ئـەولای ڕێگاكـەوە، لقەكانی هەر دارێك كرابـوون بـە دارسـینگ و دەسـت و پـێ و كەللـە سـەری سـەربازەكانمانی پێـوە هەڵواسـرابوون، جەسـتەیان خازووقیـان تێبڕیبـوون، هێشتا هـاوار و ناڵـەیان دەهـات، لەهـەردوو دارسـتانەكە ناڵـە و گریـان بـەرز دەبووەوە، هەندێكیان تەماشایان دەكردین و دەیـانگوت (الله اكبر)! بیسـت هـەزار سـەربازمان لەدەسـتدا، لـەوەش ناخۆشـتر ئـەو هـەموو خازووقـەیان تێبڕیبوون. دەهەزار بەلای ڕاست و دەی تـریش بـەلای چـەپ ئـەتككرابوون، هاوار و ناڵە ئاسمانیان پڕ كردبوو، سەربازەكان برای موسـوڵمان و هـاوڕێ و كەس و كاری ئێمە بوون. محەمەدی فاتیح مێشكی ورووژابوو، یـا بـیری ئـەو

ماوەیەی منداڵی خۆی لەتەك دراكۆلا دەكردەوە، ئەو منداڵە نەگریسەی خۆشیی بە محەمەدی فاتیح نەدەهاتەوە، ئێستا ئەو منداڵ نییە، وەلێ ئەهریمەنێكە لە شەیتان هەرماستر. سولتان لای لێ كردمەوە، چۆن ئەو دایكە بەسكێك ئێوەی بووە، ئەو باوكە چۆنی پەروەردە كردن، چۆن یەكێكتان بوون بەسوارچاكی موسوڵمانان و ئەویتر بە ئەهریمەن. محەمەدی فاتیح چاوێكی بە سوپاكە گێڕا، تێگەیشت سوپاكەی ئەم سەركەوتنە نایاتەوە، ناخی سەربازەكان پڕە لە تۆڵە، وەلێ كاتی نییە، ئەمە یەكەمجارە محەمەدی فاتیح ببینم ڕەشمەی ئەسپەكەی بەرەو دوا وەرچەرخێنێت، گوتی:

- ئەمڕۆ ڕۆژی هێرش كردنمان نییە، وەلێ سوێند بەخوا ، سوێند بە گیانی پاكی شەهیدانمان، بەهەر دڵۆپە خوێنێك ڕژا، كەللەسەری ئەم ئەهریمەنە بە ڕمێكەوە دەكەم و لەناوەڕاستی قوستەنتینییە دەیچەقێنم، تا ئەوەی دەیبینێت، تف و منداڵانیش بەردبارانی بكەن،

سوپای موسوڵمانان گەڕایەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو. جەنگی ئەمجارەیان لەگەڵ كەسێكی ئاسایی نەبوو، لەگەڵ دراكۆلای شەیتان بوو.

ئەو سەردەمە مەحاڵبوو ئەوەی موسڵمانان زوڵمێكی بكردایە، لەدەستیان ڕزگاری ببێت. محەمەدی فاتیح سوپایەكی شەست هەزار كەسی ئامادە كرد، هەموو جۆرە چەكێكی تیا بەكار هێنا، لە تۆپ و تیر و شمشێر و ئەسپی ڕەسەن، بۆ ئەو جەنگە منی بە سوپاسالار دیاریكرد.

- ڕادۆ.. بڕۆ كەللەسەری براكەتم بۆ بێنە، عەرشی والاكیا بۆ ئەو نییە بیبات بەڕێوە، ئەو خاكە قابیلی تۆیە.

- گەورەم بەر لە وشکبوونەوەی خوێنی شەهیدەکانمان بۆتی دێنم.

بەسەرکردایەتی ڕادۆ شەست هەزار سەربازی پڕ چەك بۆ والاکیا بەڕێ کەوتن. دراکۆلا کە هەواڵی ئەو لەشکرە زەبەلاحەی بیستبوو، شتێکی تری ئەنجامدا، وازی لە والاکیا هێنا و بەرەو ( بۆنیار) ڕێگای گرتە بەر، سوپاکەشمان بەدووی کەوت. دراکۆلا دەگەیشتە هەر شار و ئاواییەك زەخیرەکانی دەسووتاندن، هەر کانیاوێکیشی هاتبێتە ڕێ کوێری کردووەتەوە. بۆ سوپاکەی ئێمەش ئاسان نەبوو خواردن و ئاو دابین نەکەین، ماوەیەکی زۆر ڕاومان نان، لەزۆر شوێن شەڕمان لەتەك لەشکرەکەی کرد، زۆرمان لێ کوشتن، دوو شەڕمان دۆڕاند، وەلێ هەر کۆڵمان نەدا، تا لەقەلای (بۆنیار) دەوریمان گرت، لەیەکڕا بە ئەسپەکانمانەوە ملمان لە دەرگاکان نا و چووینە ژوورەوە، من بەدووی ئەهریمەنەکە دەگەڕام، دراکۆلا لە گۆڕەپانی کۆشك وێستابوو، گوتی:

- ڕادۆ.. تۆ خیانەتت لەولاتەکەی خۆت کرد، مێژەریان لەسەرنای.

- نەخێر، دڵم ڕێگای ڕاستی دۆزیوەتەوە، کە چەند ساڵێکە ونم کردبوو، ڕێگایەکە لەکۆتایی کەللەتدایە,

شیرەکەم بەرز کردەوە، بەرامبەریم گرت، کەچی دراکۆلا شمشێرەکەی فرێدا، سەیرم پێهات، لەپڕ بازی دایە ناو بیرێکی نزیك، بلەز خۆم گەیاندە سەر بیرەکە، لەخوارەوە بە گاڵتەجارییەوە لێی ڕووانیم، لەنێو بیرەکە توونێلێکی لێبوو و خۆی پیاکرد، ویستم خۆم بهاومە خوارەوە، کەچی داروودەستەکەی لەناو بیرەکە ئاگرێکیان کردەوە، بڵێسەی تا دەمی بیرەکە بەرزەوە بوو، ئەوە توونێلێکی نهێنی بوو، لەو توونێلانەی دواتر پێمانزانی

کە لەهەموو قەلایەك دروستی کردبوون. بەو شێوەیە دراکۆلا هەڵهات و والاکیای بۆ بەجێهێشتین.

دراکۆلا بەرەو هەنگاریا هەڵهات، تا داوا لەپاشاکەی بکات جێگای بۆ بکاتەوە، وەلێ پاشای هەنگاریا دەستبەسەری کرد و لەتوونی زیندان قایمی کرد. سالانێکی زۆری تیا ما، منیش بووم بە فەرمانڕەوای والاکیا و دادپەروەرانە فەرمانڕەواییم کرد. وام لەو میللەتە کرد، ئەوەی دراکۆلا پێیانی کردبوو، بیریان بچێتەوە. نۆ ساڵ حوکمی والاکیام کرد، ژنێکی موسوڵمانیشم هێنا، کچێکم لێی بوو، ناومان نا ماریا. ئەوجا مەرگ تێمئالا.

ئەوەی دوای ئەو هات، پیاوێکی لەیاسا بەدەر و یاخی بوو، سالانێك لەزیندانی هەنگاریای بەسەر بردبوو، پیاوێك بوو بەناوی (دراکۆلا)ی ئەهریمەن.

دراکۆلای ئەهریمەن ویستی یەك مانگ فەرمانڕەوایی والاکیا بگرێتە دەست. دوای مانگەکە تلیاکخۆرەکان (حەشاشەکان)، ئەوانەی لە دەست هۆلاکۆ ڕزگاریان ببوو، سەری دراکۆلایان لەجەستەی جیا کردەوە و نایانە نووکی ڕم و بەرزیان کردەوە. ئەوەی سەری دراکۆلای بە ڕمەکەوە بوو، کەللەسەرەکەی لە هەنگوین هەلکێشاو ناردی بۆ قوستەنتینییە، بۆ محەمەدی فاتیح، تا بەتەڕیی وەریبگرێت. کەللە سەری دراکۆلاش لە قوستەنتینییە هەلواسرا، تا سوێندەکەی سوڵتان بێتە دی و خەلکی تف و بەردبارانی بکەن.

دراکۆلا عەقڵی بەتەواوی لەدەست دابوو. دەگێڕنەوە لە زیندانەکەی هەنگاریا شتگەلی سەیر سەیری دەکرد، مشك و مێرووی دەگرت و چیلکەی

وەك قازووق لێدەكرد و تێی دەبڕین، دڵی زۆر بەوە خۆش دەبوو. ئەوە چ ئەهریمەنێك بوو. زۆری لێ كوشتین، بۆیە دووبارە سوارچاكمان دروست كردەوە، تا ئەم جۆرە ئەهریمەنانە سەرهەڵنەدەنەوە و ئەگەر پەڕو باڵیشیان لێ ڕوا لێیان نەترسێن. لەبەر ئەوانە بوو كە بووین بە سوارچاكی جەنگەكان، هەر لەبەر ئەوانیش بوو كە بووین بە موسوڵمان.

*******

تەواو

لەمێژوودا كەسایەتییەكی وا دروست نەبووەتەوە، تەنها خودی دراكۆلای خوێنمژ ناوبانگی ڕاستەقینەی خۆی بوو، تا ببێت بە خوێن مژ، خوێنی قوربانیانی تێكەڵ بەمەی دەكردو دەیخواردەوە. ئەوەی ڕاستی بێت، ئەو دراكۆلایەی لە فیلمەكان دەیبینن، بەرامبەر بە دراكۆلای ڕاستەقینە لە منداڵێكی لاوێنراو بەولاوە هیچی تر نییە!

هۆكاری گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەی دراكۆلا پەیوەستبوو بە ڕێكخراوی ئەژدیها، كە یەكێكە لەو ڕێكخراوە نهێنییانەی دوای سوارچاكەكانی هەیكەل دامەزرا، ئەمیش هەر ڕێكخراوێكی ماسۆنی بوو، لەماوەی فەرمانڕەوایەتییدا هێرش و پەلاماری زۆری دەوڵەتی عوسمانییدا .

ئەندامانی ئەم ڕێكخراوە هەر وەك ئەو ڕێكخراوە ماسۆنییانەی تر بەڕووكەش ئاشتیخواز، بانگەشەی برایەتی و یەكسانییان دەدا، وەلێ لەڕاستیدا ئامانجی تریان هەبوو، ئامانجگەلێكی ڕەش و سیاه. باوكی

دراکۆلا، کە ئەویش هەر بە دراکۆلا بەناوبانگبوو، بەرامبەر سوپای عوسمانی میچی پێنەدەکرا، دەیزانی شکست دێنێت و وڵاتی لەدەست دەچێت، دواجار ملکەچی سوڵتان دەبێت و خۆی ڕادەستی دەوڵەتی عوسمانی دەکات و هەردوو کوڕەکەشی وەك متمانە بۆ ئەوەی بە گژ سوڵتاندا نەچێت، دەنێرێتە لای سوڵتان.

دوای ئەوەی دراکۆلای کوڕ بوو بەسەرۆکی ڕێکخراوەکە(ماسۆنی)ی چون ئەوەی خودی ئەهریمەن بوو بێت بەسەرۆکی ڕێکخراوەکە.. ئاوهابوو. ڕووبەڕووی عوسمانییەکان بووەوە، دەردێکی وای دانیێ لەمێژوودا وێنەی نەبوو، تەنانەت پاشاکانی ئەوروپا و پیاوانی ئاینیش بەوای ئەو هێرشانەی دژی موسوڵمانان دەیکرد چاویان لەخوێنمژییەکەی پۆشی، چونکە بەلایانەوە ئەوە گرنگ بوو کە دژی دوژمن دەجەنگێت، جا چۆنیشی دەوێت با وابێت.

لەدرامایەکی تورکی بەناوی (FATIH) چیرۆك و بەسەرهاتی محەمەدی فاتیح و ڕادۆ و دراکۆلا بەتەواوی لەمنداڵییانەوە تا فەتحی قوستەنتینییە و کۆچی دوایی (محەمەدی فاتیح)یان نمایش کردووە.

بەدەر لەو بابەتە، با هەواڵی زیاترت لەسەر ماسۆنییەت وێدەم، چۆنیش چوومە ئەو ڕێکخراوە و بووم بە ئەندام. ئەوەی من پێتی ڕادەگەیێنم، کەس بەڕاستی بۆتی ناگێڕێتەوە، من تا پلەی بیست و یەك هەڵکشام. من دەمێکیتر دەمرم، ئەمەت لا ڕوون بێت، وەڵێ ترسم لێ نییە، گرنگ بەتۆی ڕادەگەیێنم. من لەوانەی پێشی خۆم جوداترم، چونکە دوای خۆم کتێبێکت بۆ بەجێدەهێڵم، کتێبێکە بە وردەکارییەکانییەوە بیخوێنەرەوە و ئەزبەری

بکە، دواتـر بیسـووتێنە.. ئەوانـەی تـازە دەچـنە ئـەو ڕێکخـراوە ماسـۆنییە، هەست بەهیچ خەتەرناکییەك ناکەن، بەپێچەوانەوە، ئەوانە سوێند بەو کتێبە دەخـۆن کـە بۆیـان دانـراوە، موسـوڵمانەکان سـوێند بـە قورئـان دەخـۆن، مەسـیحی بـە ئینجیـل، جوولەکـە بەتـەورات. دوای گەیشـتن بـە پلـەی هەژدەهەمین، سوێند خواردن بە تەورات دەبێـت، هێمـا و سـونبولەکان وەك خۆیانن، پـاك و بێگـەرد، دواتـر بـۆ مامناوەنـدی، دواجـاریش دەبنـە خـودی سونبولەکانی جوولەکە.

بۆ چوونە ناو ماسۆنییەت ئەوان هـەموو کەسـێك هەڵنابـژێرن، بـەخۆیان کەسـانێك دەستنیشـان دەکـەن، خـەڵکانێك کاریگـەرییان لەسـەر کۆمـەڵگادا هـەبێت، کاریگـەریی سیاسـی، ئـاینی، ئـابووری. گرووپێکـی سۆسـەکەریان هەیـە، کاریـان سۆسـە کردنـی کەسـەکان و هـەواڵ و زانیارییـان لەسـەر کۆ دەکەنەوە. زیاتر ئەو خەڵکانە هەڵدەبژێرن کە پلە و پایە و پارەیان هەیە، تا لـەڕێی ئەوانـەوە بـە ئامانجـەکانیان بگـەن. دوای هەڵبژاردنیشـیان دەخرێنـە تاقیکردنەوە، ئەمە لە هەموو پلەکانیشدا هەروایە.

ماسۆنییەت پێشکەوتنی تێدا نییە، ناتوانیت داواکاری پێشـکەش یکـەی تاببیت بە ماسۆنی پێشبکەویت، پێویستە کەسێك کاندید بکـات، سـێ پلـەی یەکەم بەرچاوڕوونیە، کێ شایەستەی پلە بەرز کردنەوەیـە، ئەڵبەتـە ئـەوەی زۆر چالاکە، یان ئەوەی کەسایەتییەکی دیـارە، یانـەخۆ ئـەو کەسـەی کـاری نییـە و دەسـتبەتاڵە، تـەماحی ژن و پـارە و مـاڵی دنیـای هەیـە، ئـەوانیش تەواوی ئەو شتانەی بۆ دەستەبەر دەکـەن، ئـەوجا بـە پـەیژەی ماسـۆنییەت هەڵدەکشـێت، لـە هـەر پلەیـەکیش هـەم سـیمبولەکان دەگـۆڕێن، هـەم

بیروباوەڕی کەسەکە. ئەگەر بە پلەی سی و سیّ گەیشت، کە پلەیەکی بڵندە، ئەوا مامۆستایان و پێشەوایان لاپەڕەیەکی تایبەتیی بۆ دەکەنەوە و دەڵێن.. تۆ باو و باپیرانت بۆ قەومی ئیسرائیل جێگای شانازین، شەرەفی ئەوەت وێدەدەین لەنۆژەنکردنەوەی (هەیکەل)ی مەزن هەیکەلی سولێمان پشکی مەزنت بەرکەوێت.

سەرەتا دەڵێن ئەو خواوەندەی دەیپەرستیت، ئەندازیاری مەزنە، ئەوە وشەیەکی ئاڵۆزە، وامەزەندە دەکەیت باس لەخودا بکات. لە پلەکانی دوای پلەی بیست ئەو ئەندازیارە دەگۆڕدرێت بە لۆسیڤەر.. وامەزانە لەبەر ئەوە شەیتان دەپەرستن چونکە شەڕخوازە، وانییە، ئەو بنیادەمی فێری هەموو شتێك کرد، هەر ئەو بوو مرۆڤی فێری کشتوکاڵ کرد، فێری بازرگانی و پیشەسازیی کرد، فێری کرد چۆن دەریا و زەریاکان ببڕێت، کەواتە پەرستنی کارێکی ئاساییە، هیچ گوناهێکی تێدا نییە. کاتیّ قسەی لەتەك ئادەم و حەوادا کرد، دا سێوەکە بخۆن، ئەو مەبەستی لەخۆشەویستییەوە بوو، دەیویست چاکەمان لەتەکا بکات، ئەوە ئایینەکانە چەواشەیان کردووین، وا خەریکە لێم حاڵی دەبیت. خودا نەفرەتی لە لۆسیڤەر نەکرد، بەڵای خوداوە وەك دژایەتی کردن وابووە، لۆسیڤەر هەوڵی داوە مرۆڤ فێری زانست بکات، وەلیّ خودا دەیویست هەر بەنەزانی بمێننەوە.

بەردەوام پەیمانەکانی خودا راست نییە، بەدەم نزا و هاوارتەوە خوبەختانەیە، وەلیّ لۆسیڤەر دەستبەجیّ دەگاتە فریات، هەر لەدنیادا دەتخاتە بەهەشتەوە، لەوەش دەگەیت کە ڕۆژی هەستانەوە گومانە، بوونیشی هەر نییە، نەبەهەشت هەیە نەدۆزەخ. هەر کەچوومە ناویان وایان

حـاڵی کـردم، وەلێ زۆریـش بـاوەڕم پێیـان نـەبوو، بەتایبـەت کـە هۆکـاری نۆژەنکردنەوەی (هەیکەل)م زانی، ئەو هۆکارە جارێ باسی لێوە ناکـەم، تـا کاتی خۆی دێت.

ئەگەر لۆسـیڤەر بـەو شـێوەیەی باسـی لێـوە دەکـەن، ببینیـت، سـەرت سـووڕ دەمێنێـت. لـە تابلۆیەکـدا بـە بـاڵای خـۆی (ئیبلـیس) لەسـەر کوشـتارگەکەی وەك پیـاوێکی بیرمەنـد دەردەکـەوێت، کـە دیقـەتی چاوەکانیشی دەدەیت، هەست دەکەیت زانیارییەکی لەبن نـەهاتووی پێیـە، هەر کاتێك سەردانی ڕێکخراوەکانی شەیتانیە ڕستەکان یـان (ماسـۆنییەت)، یان هاوشێوەیان کرد ئەو کەڤاڵەش[1] دەتوانیت ببینیت.

ڕێکخراوی ماسۆنییەت تا ئـەم سـەربردەیە لەمێـژوودا هـەر لەسـەرەتادا بووە، ئەوەشی لەم زەمینەدا گێڕاوێتی هەنگاوی سـەرەتایی بـووە، ئـەوەش لەبەر ئەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمـانی یەکـە دەسـەڵاتی جیهـان بـووە، لـە خەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا نەوەستاوە و ناوەستێت، ئەگـەر سـەدەیەکی تـری بەدەمـەوە بێـت، ئـەوا هـەموو جیهـان دەگرێـت، ماسـۆنییەتیش ناتوانێـت هەیکەلی پیرۆز کە هەر هەموو ژیانیان بۆ بەخت کردووە بنیاتنێنەوە، چونکە بیناکە لە فەڵەستینە. ڕۆژێـك بـوو ئەگـەر مێشـێکیش دەسـتی بـۆ مزگـەوتی ئەقسا ببردایە، دەوڵەتی عوسمانی لەناوی دەبرد. لەوانە گەڕێ، ئێمە جارێ لەسـەرەتادای، لێـل مـن تـا بـە ئامانجەکـەت بگـەیت، هـەروەها منـیش بـە ئامانجی خۆم بگەم، فێری سەبر دەبیت.

---

[1] تابلۆ.

ئەو سەربردەیەی داهاتوو، کارتگەلی زۆری هەن، وەلێ من یەك کارتت بۆ دەخەمە ڕوو، ئەودواکەشی کە سەرگوزشتەکە تەواو دەبێت، کارتەکەش.. کارتی(ئیلۆ - میناتی)یە وێنەکەی سەریشی بەلاتەوە ئاساییە، (هەرەم)ێکە بانەکەی تەواو نەکراوە چاوێکی بەسەرەوەیە و ڕووناکییەکی لێوە دێتە دەرەوە.

ئەو حیکایەتە دوو کەس لۆتی دەگێڕنەوە، ژن و پیاوێکن، یەکێکیان ڕاستگۆیە، ئەوی تریان درۆزن. نهێنییەکی بچووکیشت پێدەڵێم.. تا ڕاستگۆکە لە درۆزنەکە جیا بکەیتەوە کاتێ کە گوێیان بۆ ڕادەدێریت، ڕاستگۆکەیان ئەوەیە کە بەر لەوی تریان دەمرێت، ئەمەت لەبیر نەچێت. نووکەش لێلیاندا جێتدەهێڵم.

*****************



## بەشی حەوتەم

# ویرۆ .. کۆمۆکۆ

## ١٦٠٠ پاش زایین

### یاداشتی.. جۆن سمیس

یاداشتنامە ئازیزەکەم.. ڕۆژێکی نوێ لەژیانی بەختەوەریم، سەرکێشییەکی تری سەرکێشییەکانمە، کە لاپەڕەکانتی پێ پردەکەمەوە، ئەوەی مایەی باسکردنە سەرکێشییەکەی ئەمڕۆم بەوای دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ مایەی خۆشبەختیمە. ئەمڕۆ لەتەک هاوەڵەکانم بە پاپۆڕ بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێکەوتین، بۆ کیشوەرێك وڵاتی تێدا نییە و بەو ئاوایە ململانێشی تێدا نابێت. بۆ کەسێك بیەوێت شتێکی تێدا دروست بکات خاکێکی پڕ بەپیتە. بیستبووم ئەوانەی لەو کیشوەرە نیشتەجێن هیندییە سوورە پەڕ بەسەرەکانن. ئەوەشم بیستبوو کە دڕندەن و ڕقیان لە غەواران دەبێتەوە، هەر غەوارەیەکیش ڕووی تێکردبن، ئەوا کۆتایی بەژیانی خۆی هێناوە، شێوازی سەیریشیان لەکوشتندا هەبوو، یەك لەو کوشتنانەیان، مرۆڤیان لەمەنجەڵی گەورەدا دەکوڵاند، تا پێدەگەیشت، سەمایان بەدەور مەنجەڵەکەوە دەکرد!

ئەوە گەیشتینە وشکایی، نەك هەر خۆمان بەڵكو پاپۆڕەكەش لەبڕینی دەریا شەكەت ببوو. چاومان بەدارخورما و سەوزایی و لمی ئاڵتوونی كەوت و هەوایەكی خۆش و دڵگیر. هیندییەكی سوورمان بینی ڕمێكی بەدەستەوە بوو، بەغاردان هات و وەك ڕم وەشێنێكی دەستڕاست ڕمەكەی تێگرتین و لەدڵی (كریس)ی چەقاند. كریس مێشكی پڕ بوو لەسەركێشیی دەریاوانی، زۆریش خەونی بەوەوە دەبینی، یەكێك بوایە لەو سەركێشە دەریاوانییانە، وەلێ ڕمەكە لەدڵی چەقی و هەموو هیواو دەریاوانییەكانی كوێر كردەوە. هیندییە سوورەكان لەدرەندییدا وێنەیان نەبوو، هەروەك پڵنگەكانی(ئاموور) كە لەڕووسیادا چاوم پێكەوت وابوون، كریسی داماو یەكەم قوربانیمان بوو.

هیندییە سوورەكە هەرزوو هەڵهات. بەتەواوی نەمانزانی هەڵهات یا چوو گاڵی هیندییە سوورەكانی ترمان لێبدات. پێدەچوو گەشتەكەمان ئاسایی نەبێت. پاپۆڕەكەمان نزیك كەناری دەریاكە ڕاگرت و بەوریاییەوە دابەزینە سەر وشكاییەكە و بنە و بارخانەمان لێخست، ترسێكی زۆریشمان هەبوو، هەر ئەملاو ئەولامان دەكرد، دەنگی هەر شتێك بهاتایە دەتۆقین. شەومان بەسەرداهات، تووشی هیچ شتێك نەهاتین.

### یاداشتی بۆكامۆنتاس

بۆهاتان.. بەو هەموو لادێیانەی دەوروبەری لەخۆی گرتووە، خاك و مەملەكەتی منە. وێرۆ - كۆمۆكۆ ئاوایییەكەی منە، كەتیا لەدایكبووم، (وان - سیناكا)ش باوكمە و ئازیزترین كەسمە. منیش (ماتواكا)م كچی بچووكی تەمەن دەساڵان و خۆشەویسترین كەسی باوكمم، ناوەكەشم بەمانای گوڵی

نێوان دوو ڕووبار دێت. چونکە دێیەکەمان دەکەوێتە نێوان دوو ڕووبارەوە. ناوەکەی تریشم (ئامانۆتی)یە. باوکم سەرۆکی (بۆهاتان)ە. تاقانەی ئەو باوکەش نیم، باوکم نزیکەی سی کچی تری هەس، ئەویش بەهۆی هاوسەرگیریکردنی لەتەک سی ئافرەتدا، وەلێ لەنێو هەموو ئەواندا من خۆشەویست و کەسی نزیکی ئەوم، بەو ئاوایە من ( بۆکاهۆنتاس) م و هیچی تر.

بۆکاهۆنتاس.. ناوبانگترین ناومە، ناوێکە وەك هەموو ناوەکان مانای تایبەتیی خۆی هەیە، بەمانای کچە هاروهاجەکە دێت. هاروهاج بەو مانایەی کە ڕۆح سووکی و جوانکیلەیی دەگرێتەوە. بۆچی من خۆشەویستی باوکمم؟ لە کولتووری ئێمەدا، ئەو پیاوەی دەبێتە سەرۆکی ناوچەکە، دەبێت لەهەر ئاواییەك ژنێك لەخۆی مارە بکات و هاوسەرگیریی بکەن و منداڵیان لێ بخاتەوە. بەوشێوەیە خوێنمان تێکەڵ بە یەك دەبێت، ئەمەش بۆ سەرۆك مینا گفتدانێکە. بەو ئاوایە سەرۆکی مەملەکەتی (بۆهاتان) دەبێت. باوکم کە دایکمی خواست، بۆ مەرامێکی سیاسی نەبوو. ئەو یەکەم عیشقی بوو، یەکەم ئافرەتیش بوو خۆشەویستی لەتەکا کرد، ناویشی ( لۆکا هۆنتاس)بوو. باوکم بەر لەوەی ببێت بەسەرۆکی بۆهاتان هاوسەرگیریی لەتەك دایکمدا کرد و منیش نۆبەرەی ئەو دایبابەم، دایکیشم بەسەر منەوە چوو، ئەمە خەفەتێکی گەورەی لەدڵی باوکم دروست کرد، تا بەڕۆحی من بەو شاد بێتەوە هەر بەناوی دایکمەوە ناویان لێنام.

کویکرۆزەکان.. هەواڵێکیان پێڕاگەیاندین، گوایە خەڵکانێکی سپیپێست هاتوونەتە لێوار دەریاکە و نزیك بە ئێمەن، ئامۆژگارییان کردین کە ڕوو

خۆش بین و میوان دۆست بین، هەر لەبەر بۆهاتان جوان دەرکەوین. کوێکرۆز پیاوانی ئایینین لەبۆهاتان، باوکم لەهەموو شتێك پرسی پێدەکردن. دوای گەیشتنیان بە لێواری دەریاکە، کۆمەڵێك لە ژن و پیاوانی بۆهاتان بە خواردن و خواردنەوە پێشوازییان لێکردن، ئەوانیش بەو پێشوازییە دڵخۆش بوون، زۆرێك لەپارچەی مسی گران بەهایان وێداین. لەلای ئێمە (مس)یش وەك زێڕ وابوو و دڵمان پێیان کرایەوە.

## یاداشتی جۆن سمیس

هەر لەو شوێنەی تیا دابەزین، چوار مانگمان بەسەر برد، جاروباریش لە دەرچوون تووشی هێرشی هیندییە سوورەکان دەبووین، بەربەرچی هێرشەکانمان دەدانەوەو هەر زوو هەڵدەهاتن. هێشتا هەر لەدڕندەیی خۆیان نەکەوتبوون، ئەگەر ڕاستیت دەوێت، وەك چۆن بیستوومانبوومان ئەوان لەدڕندەش دڕندەتر بوون و گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد، وەلێ ئێمە نەرمیمان لەتەکیاندا دەنوواند، ئەوانەی بەئاشتییانە دەهاتنە پێش مامەڵەی بازرگانیمان لەتەکیاندا دەکرد و شتگەلی (مسی)مان پێیاندەدا و ئەوانیش خواردن و خواردنەوەیان پێدەدایین. ئەو خوراکەی لە ئینگلتەرا هێنابوومان تەواو ببوو، تەنانەت سەربەسەریی مس و خواردنیشمان لێبڕا. هیچ شتێکیان بەخۆڕایی پێنەدەداین، بۆیە بڕیارماندا بچینە نێو ئاواییەکەیان تا شتێکمان دەست بکەوێت.

بەناو ئەو ئاواییە جوان و دلگیرە کەوتبووینە سۆسەکردن. بڕوام نەکرد ئەو خەڵکە ئەوەندە دڕندەبن، چاومان بەکۆمەڵێك لەوان کەوت، لە

ڕووبارەکە بە بەلەمێك دەهاتن، بۆ خۆ پارێزی تفەنگەکەم لێیان ڕاست کردەوە، بەو ئاوایەی لەسەر ڕێگاکەمان دوور کەونەوە، وەلێ یەکێکیان هاوارێکی بۆ کرد، لەپڕ لەنێو دارەکانەوە هەرایەك بەرزەوە بوو، دەیان هندییە سوورمان لێ پەیدابوون، ئێمە بەرەو دوا داکشاین، ترسی ڕوو بە ڕووبوونەوەمان لێ نیشت، وەك پڵنگ هێرشیان بۆ هێناین. هاوەڵەکانم زووتر هەڵاتبوون، وەلێ من بواری هەڵاتنم بۆ نەمابووەوە، قەد باوەڕم نەدەکرد کۆتاییم بەدەست ئەمانەوە دەبێت. هەرچەندم کرد دەرەفەتیان نەدام، چوار دەوریان گرتم، چەکەکەم تووڕدا و هەردوو دەستم بەرزەوە کرد. ویستم قسەیان لەتەکا بکەم، تیرێك ناوشانمی پێکا، ئەوجا دنیا لەبەر چاوم تاریکبوو، بەسەر زەویەکەدا کەوتم.

## یاداشتی بۆکامۆنتاس

چوار مانگ میوانداریی ئەو سپیپێستانەمان لەخۆ گرت، یەکێکیان پیاوێکی چوارشانەی پرچ خەنەیی، چون ئەوەی بەلامانەوە خوداوەندێك بێت، بەدەستێکی شمشێر و بەدەستەکەی تریشی برووسکەدارێك، ئەودارەی دەستی بەلامەوە زۆر نامۆ بوو، ڕووی لەهەر کەسێك بکردایە لێل برووسکەکەی دەیکوشت، ئەو پیاوە بەسام بوو، هەر بەو بروسکە دارەی بڕێك لەپیاوانی (بۆهاتان)ی کوشتبوو. کێشەی ئەو پیاوە ئەوە بوو کە دەچووە هەر ئاواییەك بەو بروسکەدارەی هەڕەشەی لە سەرۆك خێڵەکەی دەکرد، تا بۆ خۆی و پیاوەکانی خواردنیان پێبدەن. ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕووی ئێدی بڕیاریان دا نانیان وێنەدەن، ئاخر دابیکردنی نانی سەد زەلام ئاسان

نەبوو، چوار مانگبوو بەسەر ئاواییەکەمانەوە ببوونە مشەخۆر. ئەم پیاوە خوداوەندە لە ئاواییەکەماندا بەدووی خواردن دەگەڕا. کوێکرۆزەکان ئەمەیان بەدڵ نەبوو، بۆیە بڕیاریاندا ببیەن لە ( وێرۆ - کۆمۆکۆ) میوانداری بکەن، تا باوکم لەزۆر ڕووەوە قسەی لەتەکا بکات. ڕۆژێک مامم (ئۆبی - شانکا)ی برا بچووکی باوکم کە پیاوێکی زۆر ئازا و چاونەترس بوو، بەڕێکەوت لای ڕووبارەکە پێیان دەتەقێنەوە، هاوەڵەکانی خوداوەندەکە لەترسی مامم تێیدەتەقێنن، ئەویش کە زانی لەهەق (ئۆبی - شانکا) نایەت، ناچار خۆی ڕادەستی دەکات. کوێکرۆزەکان دەیانگوت ئەم پیاوە خوداوەند نییە، بەڵکو بنیادەمێکی ئاساییە، ئەو داربروسکەیەش چەکێك بوو، بنیادەم بەزیرەکی خۆیان دایانهێناوە. ئۆبی - شانکا.. پیاوەکەی بە باڵبەستکراوی بەسەر هەموو ئاواییەکاندا گێڕا، ئەوەشی بۆ ئەوە کرد تا بەو خەڵکە بڵێت ئەم پیاوە خوداوەند نییە و باشترین بەڵگەش باڵبەستکردنییەکەیەتی. بردیان بۆ لای پاشا (وان - سیناکا) تا بیبینێت. کاتێ باڵبەست کرابوو هیچ کەسێك لە بۆهاتانەکان دەستدرێژیان نەکردە سەری، لە ئاواییەکانیش ئازاریان پێ نەگەیاند، چونکە ئەوە ئاکاری جوانی بۆهاتانەکانە.

### یاداشتی جۆن سمیس

لەناکاو ڕاپەڕیم، چوار هیندییەسوورەکە دەورەیان لێدابووم، پەلیان گرتم و بەکێشیان کردم[1]. نەمدەزانی کێوەم دەبەن. ویستم خۆمیان لێبدزمەوە، وەلێ لە ئاواییەکەیاندا بووم، هیندییە سوورەکانیش زۆر بوون و

---

[1] ڕایانکێشام.

دەربازبوونم بۆ نەبوو و دڕندانە لێیان دەڕوانیم. بردیانم تا چووینە بینایەکی درێژ، کە شێوەیەکی نامۆی هەبوو. پێدەچوو شوێنێکی زۆر گرنگ بێت، بۆن و بەرامەیەکی سەیری لێ بەرز دەبووەوە، جلەکانیان زۆر سەرەتایی بوو، تەنانەت بینا و ڕەوتاریشیان[1] سەرەتایی دیار بوو، لەپڕ بەرامبەر پیاوێك وێستاندیانم، بە جلوبەرگەکانی دیاربوو لەوان جوداتر بوو، پەڕەی لەوان زۆرتری بەسەرەوە بوو، دەموچاوی ڕەنگ کردبوو، بەمەزەندەی خۆم ئەو پیاوە دەبێت سەرۆکیان بێت.

بەزمانێکی توند و تیژ، کە لێی حاڵی نەبووم چی دەڵێت، تێی خوڕیم. بۆ خۆیان لەزمانی یەك تێدەگەیشتن، ناچار لە حاڵینەبوونم شانێکم بۆی هەڵتەکاند. سەرم لەو هەموو هەرزەکارانەی دەوروبەری سوڕمابوو، دەبێت چی بن؟ لەپڕ لەو چوار پیاوەی هێنابوویانم، بە تووڕەییەوە تێی خوڕین، ئەوانیش بلەز لەسەر گازەرەی پشتا پاڵیان خستم، ئەوجا یەکێکیان شمشێرەکەی هەڵکێشا و بە ڕقەوە تەماشای کردم، هاوڕێکانیشی توند توند گرتبوویانم، بێشکبووم چەند چرکەیەکی تر بە شیرەکەی دەستی سەرم دەپەڕێنێت. دڵم خەریکبوو لەژێر کراسەکەمەوە دەرپەڕێت، بێئومێدبووم، بە هەشت دەست منیان گرتبوو، کەللەمیان بەرز کردەوە، تا بەیەك شیر سەرم لەجەستەم جیا بکاتەوە، هاوارێکم کرد، گوێم لە قسەکانیان بوو، پێدەچوو ئەوە دوا قسەبێت ببیستم، پیاوی شیر بەدەستەکە، شیرەکەی بەرز کردەوە و چاوەڕێی فەرمان بوو، چاوم نوقاند و بەهەموو هێزمەوە هاوارم کرد.

---

[1] ڕەفتار ، هەڵسوکەوت.

دەنگێکی جودا لەدەنگیان بەر گوێم کەوت، دەنگی مێینەیەك بوو، لەدوور ڕا دەنگی لێوە هات، دواتر نزیکەوە بوو، دوو دەستی نەرمۆکەی پڕ بەزەیی باوەشی پیا کردم، هەناسە مێینەکەی ڕۆحی وەبەر کردمەوە. لەسەرخۆ چاوم کردەوە، سەیرم پێهات، چون ئەوەی لەهۆش خۆم چووبێتم و بێداربووبێتمەوە، خۆی دابووە سەرم و هاواری لەشێر بەدەستەکە دەکرد، پرچێکی درێژی ڕەشماری بەسەرما بەردابووەوە، چاو و ئەبرۆ هەر مەپرسە لە جوانیدا، دەتگوت پەرییە.. تۆ بلێی لەبەهەشتدا بم؟ باوەڕ ناکەم، جارێ هەر لەئاواییەکەم. بەچاوێکی دڵپەشۆکاوەوە لێی دەڕوانیم، بەتووڕەییشەوە لەوانی دەڕوانی.

بۆکاهۆنتاس.. ئەمە ناوی کچێك بوو لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا، جوانێکی ئەسمەر، کچی ئەو پاشا هیندییە سوورەی کە بەهانامەوە هات، تا لەدەست دڵڕەقیی قەومەکەی ڕزگارم بکات. هەرهەموویان بە پاشاکشەوە سەیریان لەو ڕەوتارەی هاتەوە. بەزمانی خۆیان لێلیدا دووان، ئەویش بە زمانێکی شیرین لەدڵما کە حەزم دەکرد لەقسان نەکەوێت، گوێم بۆ ڕادێرابوو، وەلێ لەزمانی نەدەگەیشتم. ئەوانەی پەلیان گرتبووم، خاو بوونەوە. هەموان بێدەنگ بوون، ئەوجا بۆکاهۆنتاس کەوتە قسەکردن.

## یاداشتی بۆکاهۆنتاس

لەسیلەی باوکمدا دانیشتبووم، ئۆبی - شانکا و پیاوە خواوەندەکە خۆیان بەژوورا کرد، تەمەنم ئەوسا دەساڵان بوو، یەکەمجاریشم بوو، کەسێك لە ڕەگ و ڕیشەیەکی تر ببینم، بەسەرسوڕمانەوە لێم دەڕوانی، باوکم بە

سلاْوێکی (بۆهاتان)ەوە لەبەری هەستاو پێشوازی لێکرد. ئەو لەزمانی باوکم تێنەدەگەیشت، وەلێ پیاویک لە (کۆیکرۆز) بەخێرهاتنەکەی باوکمی وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی، ئەویش سەرێکی بۆ لەقان و دەستیشی بۆ تەوقەکردن بردە پێشەوە.

باوکم پیاوێکی دنیادیتە و سیاسی بوو، سەرەتا سەرزەنشتی لێکرد، کە نەدەبوو بەو شێوەیە نان بەزۆرەملێ لە ئاواییەکان وەربگرێت. ئەویش داوای لەباوکم کرد، لە بۆهاتان خاکێکی باشتری وێبدرێت، تا بنە و بارخانەی لێ بخات، دەڤەری (کابا هۆسیك) شوێنێکی باشەو ئاوی شیرین و سازگاری هەیە، شوێنی بەلەم ڕاگرتنیشی هەس، بۆهاتانەکانیش خواردنیان بۆ دابین بکەن، لەبیناکردنیشدا هاوکارییان بکەن و جوانترین کچی بۆهاتانیشیان لێ مارەبکەن.

پیاوە پۆشتە و پەرداخەکە کە دواتر زانیم ناوی (جۆن سمیس)ە، چوار ڕۆژ لامان مایەوە و خزمەتێکی باشمان کرد، بەدەستی خۆم نانم بۆ ئامادە دەکرد، زۆر حەزم لەقژە ئاڵتوونییەکەی بوو، جاروبار دەستم بەقژەکەی دەهێنا، فێری هەندێ وشەی ئینگلیزی کردم، منیش هەندێ وشەی خۆمانم کە زمانی (مۆنۆکۆ)یە فێرکرد. سمیس لەسەر داواکارییەکانی باوکم ڕازی بوو و هیچ مەرجێکیشی نەبوو، باوکیشم داوای لێکرد دژ بە ئیسپانەکان یارمەتیمان بدات، کە بەین نا بەینێك هێرشیان دەکرد سەرمان، سمیس ڕازیبوو و پەیمانی بەباوکم دا خۆی و حکومەتی ئینگلیز لەژێر فەرمانی باوکمدا بن.

## یاداشتی جۆن سمیس

دوای ئەوەی بۆکاهۆنتاس بەو شێوەیە ڕێگری لەشمشێر بەدەستەکە کرد، ڕەوتاری خێڵەکە بەرامبەرم گۆڕا، پێدەچوو لەنێو ئەو خێڵە زۆر بەڕێز و خۆشەویست بێت، هەموویان مامەڵەیەکی باشیان لەتەکما کرد، خواردن و خواردنەوەیان پێشکەش کردم، هەر بەڕاست، خواردنەکەیان چەشەیەکی زۆر بەتامی هەبوو. یەك مانگی ڕەبەق لەنێو هیندییە سوورەکانی ئەو ئاواییە مامەوە. بۆشم بکرایە بۆکاهۆنتاسم دەڕفاند و دەچووینە شوێنێك کەسی تیا نەبێت، هەر خۆم و خۆی بین.

سەرۆکەکەیان لەتەکما ڕێکەوت، بۆخۆم ناوم نابوو( بالاتین) بەوەش ڕێککەوتین کە هەردوو لامان لایەنگریی یەکتر بین، دژ بەهەر پەلامارێك بۆ سەر هیندییە سوورەکان بوەستین. خواردن و خواردنەوەش کەوتە ئەستۆی ئەوان. ئەوان لە نیازی ئینگلیزەکان بێخەبەربوون، کە نیازی داگیرکردنی تەواوی خاکی هیندییە سوورەکانمان هەیە، خاکەکە زۆر بە پیت بوو، دەبوو ئەو خاکە بەدست خەڵکانێکەوە بێت بۆ پێشکەوتن شارستانییەتیان هەبێت، بەم گێژ و وێژانە شارستانییەت دروست نابێت، ئەگەر بەوە قایل دەبن بە ئاشتییانە لەتەکماندا بن، ئێمەش لاریمان نابێت.

بەو شێوەیە گەڕامەوە سەربازگەکەی خۆمان. هاوەڵەکانم سەیریان بەگەڕانەوەم هات، لەبری کوشتن بە بڕێ هیندی سوورەوە گەڕاومەتەوە، هەر ئەوەش نا خواردن و خواردنەوەیەکی زۆریشم لەتەك خۆما هێناوەتەوە. دوای ئەوە جاروبار بۆکاهۆنتاس لە ڕەشماڵەکەی خۆم سەری لێدەدام، پێکەوە دەچووینە سەر ڕووباری (یۆرك). من بۆکاهۆنتاسم چووبووە دڵەوە،

عیشقم لەتەكیدا دەكرد، ئەویش هەروەسا. كێشەی هەرە گەورەمان باوكی بوو، نەدەهاتە ژێر سایەی ئینگلتەرا، بەڵكو دەیویست ئینگلتەرا لەژێر فەرمانی ئەواندا بێت، ئەمەش مانای ئەوەیە ململانێیەكی نزیك بەڕێوەیە. زۆرمان لەخەڵكی بۆهاتان كوشت، ئەمەش بەلای منەوە زۆر گرانبوو، وەڵێ بەرژەوەندیی ولاتەكەم لەسەرووی هەموو هەوەسبازیمەوەیە، من وا پەروەردە كراوم، وەڵێ قەدەر نەیهێشت ئەو شەڕە لەتەك سەربازەكانمان بكەم، لەكاتی رێكخستن و ئامادەكردنی چەك و تەقەمەنی بەهەڵە تەقەمەنییەكی زۆر بەرەو ڕووم تەقییەوە.

## یاداشتی بۆكاهۆنتاس

جۆن سمیس مرد، ئەمە ئەو هەواڵەبوو پێمانگەیشت، لاشەكەشی بەرەو ئینگلتەرا برایەوە. باوكم چاوەڕێی ئەو سەركردە تازەیە بوو، كە جێی (سمیس)ی دەگرتەوە، تا دانوستانێكی تریان لەتەكا بكات، وەك چۆن لەتەك (سمیس)دا كردبووی، وەڵێ دوای مردنی جۆن سمیس ئینگلیز كەوتنە هێرش و پەلاماردانمان، تووشی شەڕێكی قورس بووین، زۆرمان لێكوژرا. ئەو چەكانەی ئینگلیزەكان بەكاریان دەهێنا، زۆر پێشكەوتوو بوو، چەكەكانی ئێمەش بەرامبەر بەچەكی ئەوان وەك بووكەڵەی منداڵان وابوو. بۆهاتانییەكان پێویستیان بەماوەیەكی زۆر بوو، بەرامبەر بەو چەكە پێشكەوتووانەی ئەوان بیر لەچەك و پلانی تازەتر بكەنەوە، هەموو جۆرە چەكێكیان لەسەر ئێمە تاقیكردەوە، پەیمانبەستنەكەشیان نەبردە سەر و هەڵیان وەشاندەوە.

هەردوولا لەشەڕدا بوون، تا ئەو ڕۆژە هات بەفەرمانی باوکم بەرەو خێڵی (باتاومێکسی) ڕۆیشتم، ئەو ئاواییە لایەنگریی پاشا نەبوون. ئەوەی من بۆی چووبووم، بۆنەیەکی کۆمەڵایەتیی بوو، کە گەیشتمە ئەوێ، نەمزانی تەڵەیان بۆ نابوومەوە، کەوتمە تەڵەی (باتاومێکس)ییەکان، ئەوجا درکم کرد ئەوانە بوونەتە لایەنگریی ئینگلیزەکان و دژ بە باوکمن، دەیانویست لەژێر فشاری دەستبەسەریمدا، فشار بخەنە سەر باوکم. نەیخۆن تاڵە، ئەوە کچی بۆهاتان نییە ببێتە هۆکاری شکستهێنانی خێڵەکەم.

لەژووری بچووکی پاپۆڕێک بە بارمتە گیرام. بەوای لەرینەوەی پاپۆڕەکەوە دڵم تێکهەڵدەچوو، سەرم بەگێژدا دەهات، چەندجارێ ئەوەی ناوسکمم هەڵهێنایەوە. ئەوان وایاندەزانی لەترسابوو، وەلێ کچانی بۆهاتان نین بترسێن، تەنها لەدەریادا سەرم بەگێژا دەهات.

شەوێکی تاریک، لەنێوان لەرینەوەی پاپۆڕەکە، دەرگاکەم لەسەر کرایەوە، بوونەوەرێك لەبەردەم دەرگاکە وێستا، لەبەر تاریکی ڕووخساریم نەدەبینی، وەلێ بەمەزەنە هەستم کرد زەلامێکی کەتەیە، وەك بت لەناو دەرگاکە وێستابوو، جگەرەی دەکێشا، بە ئینگلیزی قسەی لەتەکما کرد، هیچی لێ حاڵی نەبووم، زیاتر لێم نزیکەوە بوو، دەستی بۆ بردم، دەستم بەسترابووەوە، وەلێ تا توانیم لەققەیەکم لەناو سکی دا، بە پشتا ڕمانم. هەستایەو و قسەیەکی زۆری پێکردم، دەمزانی جنێوم پێدەدات، وەلێ نەمدەزانی چی دەڵێت، وەك سەگی هار کەوتە وێزەم، ئەوەی نەشێت پێیکردم، لەکچێنیی خستم، ئەوجا هەندێ قسەی تری کرد، وەلێ گوێم بۆی ڕانەدێرا، ئەو ڕۆیشت و منیش خوێن و فرمێسکم تێکەڵ بوو.. لەم ئووده

نەعلەتییە من بۆكاهۆنتاس كچی سەرۆك بۆهاتان شەرەفیان لەوتاندم، جوانترین خەونم دزرا، ئاژەڵێك كچێنیمی كوێر كردەوە، ئیدی ڕووی هیچ شوێنێكم نەما، خۆزگە بەر لەو كارەساتە مردبام، ئەگەر دەستبەستراو نەدەبووم، خۆم دەهاویشتە دەریاكەوە تا بمرم.

## یاداشتی جۆن سمیس

بەهەڵە تەقینەوەكە بە دەموچاوما تەقییەوە، سووتانێكی زۆر سووتام، وەلێ نەمردم، بۆ چارەسەر كردن بۆ ئینگلتەرا گەڕامەوە. ئینگلیزەكان بە هیندییە سوورەكانیان گوت، بەوای پیلانێك گوایە كە ئێوە دەستتان لەكوشتنیدا هەبووە جۆن سمیس مرد، بێگومان ئەوەش بۆ ئەوەی پەیمانەكە هەڵوەشێننەوە. یەك دوو مانگ بەسەرچوو، دەستیان بەهێرشكردنە سەر هیندییە سوورەكان كرد. ئێمە بەوای چەكە پێشكەوتووەكانمان، ژمارەشمان زۆر لەوان زۆرتربوو بەردەوام سەردەكەوتین، ئەو جەنگە چەند ساڵێكی خایاند، تا ئینگلیزەكان دەستیان بەسەر بۆكاهۆنتاسدا گرد، دەیانزانی باوكی بۆكاهۆنتاس لەپێناو كچەكەی مل بۆ هەموو شتێك كەچ دەكات و كاتێ كچەكەی لامان بارمتە بێت ناتوانێت هێرشمان بكاتە سەر. ڕزگارانەیەكی[1] زۆر زۆرمان داواكرد، كە پێی هەڵنەدەسووڕا، بۆیە كچەكەیمان لای خۆمان هێشتەوە.

---

[1] فیدیە.

ئەو ماوەیەی بۆکاهۆنتاس لەلامان دەستبەسەربوو، زۆر سەیری بە شارستانییەتەمان هاتەوە. ئەو ماوەیەش کە دڵمان بەیەکەوە بوو، لەڕێی وتووێژەکانمەوە مەزەندەی ئەو شارستانییەتەی ئێمەی بەلاوە دلگیربوو، کە بۆم باسکردبوو، نووکە بەچاوی خۆی بینی، وایلێهات بەوای ئەو ژیانە و سادەیەی قەومەکەی ڕقی لەخۆیان دەبوووەوە، کاتێ لەلامان دەستبەسەربوو ئەم بیرۆکەیە لەتەکیدا گەورەبوو. چاوی بە ڕەفتارە جوانەکانمان کەوت، باوەڕی پێمان هێنا ، بۆ بەڵگەی ئەوەش هاتە سەر ئایینی مەسیح. لەکلێسا کەشێکی شایەستەی بۆ سازدرا و هەر لەوێ ناوەکەشیان بە (ڕێبیکا) گۆڕی، ئەویش بۆ ناوی دایکی یاقووب و عیسێۆ دەگەڕێتەوە کە لەتەوراتدا هاتووە. بەو ئاوایە ڕێبیکا بوو بەدایکی دوو میللەت. بۆکاهۆنتاس نموونەی یەکگرتنەوەی ئینگلیز و هیندییە سوورەکان بوو.

خۆشەویستییەکەی بۆ شارستانییەتەکەمان وایلێکرد ڕقی لەو ژیانە خێڵەکییەی خۆیان ببێتەوە. ڕێماندا چاوی بەبرێك لەکەسو کاری بکەوێت، لەنێویشیاندا باوکی. ئەودەم قیژاندییە سەر باوکی، بۆی دەرکەوت بەلای باوکییەوە زۆر لەشمشێرێکی کۆن و تەورێکی ژەنگاوی کەمترە. هەر لە ڕزگارانەکە بۆی دەرکەوت کە بریتیبوو لەڕادەستکردنی چەکەکانیان.

یەکێك لە گەورەترین بازرگانەکانی ئینگلتەرا بەناوی (جۆن ڕۆڵف) داوای هاوسەرگیریی لەتەکا کرد، ئەویش ڕەزامەندی نواند. ئەم هاوسەرگیرییە پڕوپاگەندەیەك بوو بۆ ئاشتەوایی نێوان دوو میللەت، کە چەندین ساڵ لەشەڕ و شۆڕدابوون. ڕێبیکا(بۆکاهۆنتاس) لێل (ڕۆڵف)ی مێردی بەرەو

ئینگلتەرا گەشتیان کرد، کێشەکە ئەوەبوو، منیش لە ئینگلتەرا بووم. ڕێکەوت وابوو یەکترمان بینییەوە.

## یاداشتی بۆکاهۆنتاس

ڕقم لەخۆم بووەوە، من بووم بەهۆکاری شکستی نەتەوەکەم، من بێشەرفم، ئابروم تکا، ڕێزم کوێرەوە بوو، نازانم کێبوو کچێنیمی لەوتاند. بۆ ڕۆژی دوایی پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندی بازرگان بەناوی ڕۆڵف هات و داوای هاوسەرگیریی لێکردم، مەرجی ئەوەم پێگوت کە شەڕ لەنێوانماندا بوەستێت، ئەو هەلەم بۆ قەومەکەم قۆزتەوە. هەستمکرد ئەو هاوسەرگیرییە لە دەردەسەریی کەسوکارم کەم دەکاتەوە و ژیان بەبەریانەوە دەکات. بۆیە خۆم کرد بەقوربانی بۆ ژیانەوەی قەومەکەم.

بۆ ئەوەی ئەو هاوسەرگیرییە ببێت، پێیانڕاگەیاندم، دەبێت بچمە سەر ئایینی ئەوان و ناوێکی تر لەخۆم بنێم، بێ سێ و دوو ڕەزامەندیم نواند. هاوسەرگیریم لەتەک ئەو بازرگانە دەوڵەمەندە کرد. شەڕی ئەو هەموو ساڵە کۆتایی پێهات و میللەتەکەم ڕزگار کرد. لەتەک ڕۆڵف سەفەری ئینگلتەرام کرد. لەوێ تێگەیشتم هاوسەرگیرییەکەم بۆ ئاشتەوایی نەبوو، کە وایان پێگوتبووم، ئەوە پڕوپاگەندەیەك بوو، بۆ داگیرکردنی خاك و نیشتمانەکەم، کە دواتر ناوی (ڤیرجینا)یان لە نیشتمانی باو باپیرانم نا. دەستیان بەسەر

ئەو کیشوەرەمان گرت، جیهانیان بەو خاکە نوێیەی خۆیان ناساند، خەڵکی ئەو کیشوەرەش پڕبەدڵ خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیوە، نمونەش شاژن بۆکاهۆنتاس کچی سەرۆك هندییە سوورەکان بەو بۆنەوە هاوسەرگیریی خۆی لەتەك (ڕۆڵف )ی ئینگلیزی ڕاگەیاندووە.

ئەودەمەی لە ئینگلتەرا بووم، زانیم جۆن سمیس پیاوێکی درۆزنە و نەمردووە، بابەتی مردنەکەشی بۆ ئەوەبوو ئەو دانوستانەی لەتەك باوکمدا کردبووی، هەڵیوەشێنێتەوە، چونکە نەیاندەویست پابەندی ئەو پەیمانە بن. خوا کردی و بەڕێکەوت تووشم بوو بەتووشی سمیسەوە ، ئەوەی نەشێت پێمکرد.. تۆ پیاوێکی فێڵباز و ساختەچی بووی، وامزانی خۆشت دەوێم. ئێوە بۆ داگیرکردنی ئێمە هاتبوون، خیانەتتان لێ کردین. لەگەڵ ڕۆڵف کەوتمە ململانێیەکی زۆر بۆ کۆبوونەوەکان نەدەچووم، لە بۆنەکانیش خۆم دەدزییەوە، بە زۆر دەیانبردم، هیچ ڕێگایەکم بۆ ڕۆڵف نەهێشتەوە.

ڕۆژێك لەگۆزەکە ئاوم خواردەوە، زۆری پێنەچوو، سەرم بەگێژا هات، زەوی بەبەرچاومەوە دەخوولایەوە، بەر لەوەی لەهۆش خۆم بچم، زانیم ڕۆڵف ژەهری کردووەتە ئاوەکەمەوە. درکم بەوە کردبوو، دەیانەوێ لێم ڕزگار بن، ئەوان گرەوی خۆیان بردەوە، ئاشتەواییە درۆزنانەکەیان بەجیهاندا بڵاوکردەوە، بەناوی ئێمەوە قسەی زۆریان بۆ هەڵبەستین، تا شارستانییەت لە خاکەکەیان بخەینە سەر پێچکەی پێشکەوتن، جیهان باوەڕیان پێکردن یان نا ! گرنگ دەستی خۆیان وەشاند. تا دنیا دنیایە هەر بەو شێوەیە جیهان باوەڕ بەو مێژووە دەکەن، هەرچی (بۆماتان)ییەکانبوون بەو هەموو خوێنەی لێیان ڕژا، بەو خاکەی بەجەنگ لێیان سەندرا، کەس

باوەڕیان پێناکات، چونکە مێژوویان بۆ خۆیان نەنووسیوەتەوە، دواتر خوێنی ئەو خێڵەکییانە بەرامبەر بەخوێنی پاشایەتیی ئینگلتەرا دەبێت چی بێت.

*********

تەواو

بەو شێوەیە ئینگلتەرا هێرشی کردە سەر کیشوەری ئەمریکا، هێرشێکی دڕندانەی خوێناویی دوور لە مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، کوشتارێکی زۆریان کرد، ئەو ڕاستییەی مێژووی ئەمریکا بە چەواشەکاری و دوور لەڕاستییەوە نووسیبیانەوە. پەیکەری (ئازادی) لەڕاستیدا لەسەر ڕۆحی ملیۆنان خەڵکی سڤیلی هیندییە سوورەکان دامێنرا. کێشەی سەرەکیی داگیرکەرانی ئینگلیز، دوای داگیرکردنی کیشوەری ئەمریکا، گرفتی کریکاریان هەبوو، تا کاریان پێبکەن، باشە کیشوەرێك بەچی و چۆن پڕبکەنەوە؟ ناچار هیندییە سوورەکانیان بەکۆیلە گرت.

چاوت بە سەدان بارهەلگر دەکەوت، منداڵ و ژنانی هیندییە سوورەکانیان بار کردبوو، ژنانیان بەلاوە گرنگتر بوو، بەدەر لەوەی کاریان پێدەکردن، بۆ سێکس کردنیش بەکاریان دەهێنان.

هەر هیندییە سوورێك کۆیلایەتیی قبووڵ نەکردایە، دەکوژرا. مێژوو دەگێڕێتەوە، هەزاران هەزار دێهات سووتێنران، دانیشتوانەکانیشیان کوشت،

کانیاوەکانیان کوێر کردەوە، لەسەدا هەشتای هیندییە سوورەکان کە زیاتر لە پەنجا ملیۆن کەس مەزەندە دەکرا، قڕ کران.

زەوی و زارەکە لەڕادەبەدەر بوو، ئەو هیندییە سوورانەی بەکۆیلە ڕاگیرابوون، بۆیان هەڵنەدەسووڕا سەرپەرشتی ئەو هەموو خاکە بکەن. لێرەوە بیریان لەوە کردەوە کۆیلەی تری بۆ پەیدا بکەن، ئەوەبوو ڕوویان لە ئەفریقا کرد، دەیان ملیۆن ڕەشپێستیان دەستبەسەر کرد، لەپاپۆریان نان و بەرەو ئەمریکا بەڕێکران. لەناو پاپۆڕەکان ئەوەی لەبرسا مرد، ئەوەشی لەتوێنێتیبیا، ئەوەشی بەوای پاڵەپەستۆی زۆری ڕەشپێستەکانەوە خنکا. تا بۆیان کرابوو لەژووریلی پاپۆڕەکان سیخناخیان کردبوون، یا ئەوانەی بەفیشەك کوژران. ئەو هێرشە لەمێژوودا گەورەترین داستانی نامرۆڤایەتی بوو، جەنگی قڕکردنی هیندییەسوورەکان و ڕەشپێستەکان. بەو شێوەیە ئەمریکا وڵاتی ئازادی و دیموکراسی دروست بوو، تەنانەت باوکی (داهێنەری ئازادی( جۆرج واشنتۆن) خودی خۆی سێسەد کۆیلەی بۆ کارکردن هەبوو، تا مردیش یەك کۆیلە چییە ئازادی نەکرد!

بۆکاهۆنتاس ڕاستگۆ بوو، جۆن سمیس درۆزن. (سمیس)ی درۆزن لەهەندێ لەسەرکێشییەکانیدا باسی لەبەسەرهاتی وا کردووە هەر بەخەیاڵی خۆی دایڕشتووە، کە باسی لەخیانەتی ئەو کچانەی خۆشیانویستوە، تا لەچەوساندنەوە و ژیانی سەختی هیندییە سوورەکان ڕزگاریان بکات، وەلێ سەربردەی بۆکاهۆنتاس دوای بەفیلمکردنی ژیانیان ناوبانگی دڵسۆزییەکەی دەرکەوت. وەلێ بەلای بۆکاهۆنتاسەوە مەحاڵە تا ئەم کتێبە نەخوێنێتەوە ڕاستییەکەی بزانێت.

(بۆهاتان)ییەکان درۆ ناکەن، گرفتیان ئەوەیە مێژووی خۆیان لەهیچ کتێبێك نەنووسیوەتەوە، تەنها دەماو دەم لەلای کویکرۆزەکان پاراستوویانە. پیاوێلێکی بیرمەند بوون، هەموو شتێکیان دەزانی. دوو لەو هیندییە سوورانەی سەردەمی نوێ، کە ناسنامەی ئەمریکییان هەلگرتووە، بڕیاریاندا بەسەرهاتی بۆکاهۆنتاس بنووسنەوە، تا هەق بگەڕێننەوە لای خاوەن هەق. ئەو کتێبە سانسۆریان خستە سەر تا بلاو نەکرێتەوە. هەر بۆ ئەوەی کە خۆیان دایانڕشتبوو، نەشێوێت، بەتایبەت ئەوەی لە فیلمی (دیزنی) بەهەردوو بەشەکەی کە بلاو کرابووەوە. وا نەزانیت ئەو بەسەرهاتە تەنها بەفیلم پەخش کراوەتەوە، بەلکو لەهەموو دامودەزگاکان و کتێبە مێژووییەکان بە بۆچوونی جۆن سمیس بلاوکراوەتەوە، بە بۆچوونی هیندییە سوورەکانیش کەس نەبوو گوێیان لێبگرێت.

ڕەنگە پرسیاری نهێنیی ئەو کارتەی لەسەرەتای گێڕانەوەکە پیشانم دای، بکەیت. کارتی (ئیلۆميناتی) و وێنەی هەرەم و ئەو چاوەی بەسەریەوە بوو، دەبێت چی بێت؟ ئەو وێنەیە، هەر ئەو وێنەیەیە کە بەسەر دۆلاری ئەمریکییەوەیە. بەر لەوەی شتێکت پیشان بدەم، هەموو ئەوەی خوێندووتە یا بیستووتەبنێرە لاوە، چاك گوێم لێبگرە.

جۆن سمیس بەر لەوەی پێ بخاتە سەر خاکی هیندییە سوورەکان، زانیاریی تەواوی هەبوو، هەموو ئەو زانیارییانەشی لەپیاوێك، بەناوی (سێر والتەر ڕالێیج) کۆ کردبوونەوە، ئەو پیاوەش مامۆستای مەزنی ڕێکخراوێکی نهێنی، بەناوی (خاکی پەمەیی) یا (ڕۆزکرۆشن)بوو. ئەو پیاوە لێکۆلەربوو. بە بۆنەی ئەم ڕێکخراوەوە کارتێکی ئەو گەمەیەت پیشان دەدەم، کارتی

(ڕۆزکرۆشن) کە وێنەی خاچێکی بەڕەنگی پەمەیی بەسەرەوەیە، ئەویش لقێکە لەڕێکخراوی ماسۆنی، وەلێ زۆر لەماسۆنییەت نهێنیترە.

والتەر درکی بەوە کردبوو، هیچ بەربەستێك لەداگیر کردنی ئەو خاکەدا نییە، خاکێکی بێ شارستانییەت و بێ یەکێتی لەناو خۆیان و نەبوونی مێژوویەك ، گشت ئەمانە توێژینەوەیان بۆ کرابوو، دەرئەنجام باشترین هەلە دوور لە ئەوروپا ئەو کیشوەرە بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، تا بەناوی ئەمریکاوە وەرچەرخانێك ڕووبدات.

دوای سەربردەی جۆن سمیس و بۆکاهۆنتاس و داگیرکاریی ئینگلیزەکان و خوێنڕشتن، سەردەمی تازەی ئەمریکا دەستی بە یەکەم هەنگاویی خۆی کرد. ئینگلیزەکان سێزدە( کۆلۆنی)یان دامەزراند، ڕووباری خوێن بەژێریاندا ڕەتبوو، لێرەوە ماسۆنییەت پیاوێکی بەناوی (لاڤایت)ی بۆ ناردن پیاوێك لەپلەی سی و سێ، ئەم پیاوە هەموو موستەعمەرەکانی یەکخست، ئەوجا ماسۆنییەت پیاوێکی گرنگی بەناوی (فریدریك شتۆبین)ی نارد، کە ژەنەراڵێکی سەربازی بوو، هەرچی میلیشیا بوو، لەژێر سایەی سەربازیی یەککرتوودا کۆکردەوە، ئەوجا شۆڕشی ئەمریکا دەستی پێکرد.

بەهۆی سەرکەوتنیان لەژێر ناونیشانی( چای بۆستن) ئاهەنگێکیان گێڕا، حکومەتی ئینگلیز باجی لەسەر چای هەڵگرت. پیاوانی ماسۆنییەت بەجلوبەرگی هیندییە سوورەکانەوە دزەیان بۆ ناو پاپۆڕەکان کرد، (چای)ەیە بارکراوەکانیان فڕێدایە ناو دەریاکە. حکومەتی بریتانی بەوە تووڕەبوو، ئەوە وایکرد کاردانەوەیەکی سەختی هەبێت، بۆیە شۆڕشێکی بەناوی شۆڕشی ئەمریکاوە هەڵگیرساند.

شۆڕشەکەیان سەری گرت و سەربەخۆییان ڕاگەیاند و دەوڵەتێکی گەورەی سەربەخۆیان پێکهێنا. ئەوەتا کارتی ئەمریکات دەخەمە بەردەست، وێنەی ئاڵای ئەمریکا و پەیکەری ئازادی بەسەرەوەیە.

گشت ئەوانە جوانن، وەلێ لێگەڕێ چاو بە بەڵگەنامەکانی سەربەخۆیی ئەمریکا بگێڕین، کە چل ناو دەنگیان لەسەر داوە، نۆزدەی یەکەمیان ماسۆنین، ئەمە هەر قسە نییە و بەس، ئەوە بەبەڵگەنامە واژۆی لەسەر کراوە. یاسای بنەڕەتیی دەستووری ئەمریکی پەنجاو شەش کەس واژۆیان لەسەری کرد، بیست و شەشی یەکەمیان ماسۆنی بوون، یەکەم سەرۆکیش (جۆرج واشنتۆن)بوو کە بۆ ئەمریکا هەڵبژێردرا، ئەویش هەر ماسۆنی بوو.

ئەمریکا ساڵی ١٧٧٦ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. هەر لەو ساڵەشدا بزووتنەوەیەکی نهێنی لە (پاڤاریا)ی ئەڵمانیا بەناوی ڕێکخراوی(ئیلۆميناتی) دامەزرا، هێمای هەرەمێکی بان کراوەی بەسەرەوە بوو، لای سەرەوەی هەرەمەکە چاوێك و لەپشتی چاوەکەشەوە چەپکێ تیشك، پیاوێك بەناوی (ئادەم وایهاوبت)ەوە ئەم ڕێکخراوەی دامەزراند، دواتر لەتەك ماسۆنییەت تا ببێتە ڕێکخراوێکی جیهانی ڕێکخرا. ئێستا با لەوەش گەڕێین، چاو بەکارتی دۆلارە ئەمریکییەکە بگێڕین. وەك دەزانیت دراوی هەر دەوڵەتێك، بریتییە لە بڕ و بەهای (یەك)ی دراوەکە. ئەوجا با تەماشای پشتی دراوی دۆلارەکە بکەین.. لای چەپی وشەی(one ) هەرەم و چاوەکە دەبینیت؟ ئەم هێمایە[1] نە لەدوور نە لەنزیك پەیوەندیی بە ئەمریکاوە نییە، ئەوە تەنها سیمبولی (ئیلۆميناتی)یە. لەسەرووی چاوەکەشەوە وشەی( annuit coeptis)

---

[1] نیشانە , دروشم.

دەبینیت، کە وشەیەکی لاتینییە و مانای تەواوی (ئەو.. کە ڕەزامەندی لەسەر پاراستنماندا). لەژێر هەڕەمەکەشەوە وشەی (novus ordo seclorum)ئەویش هەر وشەیەکی لاتینییەو مانای ( سیستەمی جیهانی نوێ)یە.

ئەگەر ئەندام بوویتایە لەماسۆنییەت یا ئیلۆميناتی ئەوا بۆ هەر هێمایەك لە هێماکان بەپێی پلەی بەرزکردنەوە مانایەکی تازەترت دەزانی. چاوەکە هەر لەسەرەتاوە چاوی خودایە و دەڕوانێتە هەموو شتێك، دواتر دەبێتە چاوی (ئۆزیریس) و دوای ئەویش دەگۆڕدرێت دەبێت بە چاوی لۆسیڤەر، کە سەرپەرشتیاری هەر هەموو شتێکە. لۆسیڤەر وەکو خوێن لەناو جەستەی مرۆڤ هاتوچۆ دەکا ئاگاداری هەموو کردەوەکانی ئادەمیزادە, لە دواتریش لە پلە هەرە بالاکاندا، درك بەوە دەکەیت ئەو چاوە چاوێکی ترە، جودا لەو نیشانانەی پێشووتر، چاوی (ئەنتیخریستۆس)ە.

ئەو چەپکە تیشکەی دەوری چاوەکەش مانای تایبەتی خۆی هەیە، سەرەتا دەبێتە ڕووناهی خودا، دواتر دەگۆڕدرێت بە ڕووناکی (یەهوا)، یەهواش لای جوولەکە کۆنەکان بەمانای خودا دێت، بۆ کەسیش نییە ئەو ناوە لەخۆی بنێت، چونکە ناوی خودای مەزنە، دواجاریش دەبێت بە ڕووناکی لۆسیڤەر. بەو ئاوایە لۆسیڤەر هەلگری ئەو ڕووناکییەیە. هەڕەمەکەش سیمبولە بۆ خەونی ئیسرائیلییەکان، لەنیلەوە بۆ فورات، چونکە لەکۆندا نیل بە هەڕەم تێدەپەڕی، بۆیە هەڕەم لەلای چەپی دۆلارەکەوە دانراوە. دواتریش تێدەگەیت سیمبولە بۆ ئامادەگیی خوداوەند لۆسیڤەر.

بەڵام ئەو هێمایەی لەلای ڕاستی وشەی (one) دا هاتووە، هێمایە بۆ باڵندەیەك پێدەچێت باز بێت یا هەڵۆ. بەبان سەریەوە سێزدە ئەستێرەی بچووك هەن بەگشتیانەوە شێوەی شەشلایان وەرگرتووە، کە ئەستێرەی داوودە. بەبان سەری باڵندەکەوە وەك هێمایێك بۆ درووشمی ئەمریکا دانراوە.

هەر بەڕاست ئەوەی بە دیزاینکردنی ئەو دروشمە هەستا، لیژنەیەکبوو، لە ئەندامە ناودارەکانی ڕێکخراوی ئیلۆميناتی و بەناوبانگترینیشیان (بنجامین فرانکلین) و ( جۆن ئادامز) و ( تۆماس جیفەرسۆن)بوون.

لەبارەی دەستەواژەی (سیستەمی جیهانی نوێ)وە، کە بانگەشەیان بۆ دەکرد و دەیانگوتەوە، دەیانویست بیروباوەڕی جیهان یەکبخەن، پۆشاکیان یەکبخەن، چون ئەوەی هەموو جیهان چاو لە ئەمریکا بکات. تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بوون، ئەویش لە ڕووی جلوبەرگ و خواردنی چێشتخانە وتەنانەت گوێگرتن لە گۆرانی، نالێم باش نییە، چونکە بۆ خۆم ئەمریکیم دەبێت پێمباش بێت، وەلێ من دەڵێم هیچ نەتەوەیەك نییە بێ لەزمانەکەی خۆی پێشبکەوێت، ژاپۆن بەنموونە وەرگرە، ئەوان زمانی خۆیان دەسەپێنن، هەروەها فرەنسا و ئەڵمانیاش, ئێستا لێم حاڵی بوویت؟

هێشتا باوەڕ ناکەیت ئەمریکا وڵاتێکی ماسۆنییە، منیش لەگەڵ موسوڵمانەکانم کە بە (تیۆری پیلانگێڕی) ناوی دەبەن، کە هەموو کێشەکانی جیهان لەژێر سەری ئەواندایە.

باشە ئەو ئاهەنگەی بەردی بناغەی بۆ بینای (کابیتاڵ)ی ئەمریکی دانرا، بەڕێوڕەسمی ماسۆنییەتەوە نەبوو؟ جلوبەرگی ماسۆنییەتەوە نەبوو؟

ئەوانەیش کە بەڕێوەیان دەبرد هەر ماسۆنییەکان نەبوون؟ بۆ خۆیان دانی پیادەنێن و شانازیشی پێوە دەکەن

سەرۆکەکانی ئەمریکا لەگەورەیانەوە تا بچووکیان ماسۆنین، لەهەوەڵینیانەوە تا ئۆباما کە ئەمیان فەرمییە لەخۆمەوە نییە، گشتیان تەنها یەکێکیان نەبێت، ئەویش (جۆن کینێدی)یە، کە دەسەلاتی گرتە دەست، زانی ولاتەکەی ڕێکخراوێکی نهێنی بەڕێوەی دەبات، بەوتارێك هاتە ناو خەڵکی و هێرشی کردە سەر ئەو ڕێکخراوە نهێنییە و گوتی.. ئەمە ڕەوا نییە، پێویستە دەوڵەت دژ بەو ڕێکخراوە بوەستێتەوە، تەنانەت ویستی پشکنین بۆ (کوورەی ئەتۆمی دیموونە)ی ئیسرائیلی بکات. دوای ئەوەی وتارەکەی پێشکەش کرد، جۆن کینێدی کوژرا! نامەوێ کاتێکی زۆر بۆ چۆنێتیی کوشتنەکەی بەفیڕۆبدەم.

وەڵێ ئەوانەی جۆن کینێدییان کوشت ، هەر ئەوانەن کە (فەیسەڵی کوڕی عەبدولعەزیز)یان کوشت، کاتێك نەوتی لە ئەمریکا بڕی، هەر ئەوانیش بوون (سادات)یان کوشت. وشەی ئەوان مەبەستم کەسێکی دیاریکراوی ڕێکخراوەکە نییە، بەڵکو مەبەستم خودی ڕێکخراوەکەیە، یا ڕێکخراوێکی سەر بەو ڕێکخراوەیە. هەر هەموو ئەوانە پیاوێلێك بوون کە دەبوو وابن، بەلام لای (ئیلومیناتی) ئەو جۆرە کەسانە دەبێ یەکسەر بکوژرێن.

هەر کە بۆن و بەرامەی بۆگەنیی ماسۆنییەت بلاوبووەوە بوو، پارەیەکی زۆر و زەوەندیان بۆ کاری خێرخوازی و ڕێکخراوە خێرخوازەکان خستە بەردەست، کە دەلێم پارەیەکی زۆر، مەبەستم لە (بلیۆنەها)یە، تا باوەڕ بەخەڵکی بێنن، کە ڕێکخراوێکن هەولی ئاشتی و برایەتی دەدەن.

لەوڵاتەکەدا زۆرێك لـەو دەزگا ماسۆنییانە هـەن، کە بانگەشـەی کـاری خێرخوازی دەکەن، پێیان هەڵنەخەڵەتێیت، دیارترینیان یانەکانی(ڕۆتاری) و یانەکانی(لیۆنز)ە، وەلێ هەرکەسێکیشت لەم یانانە بینی، مەرج نییە ماسۆنی بێت، ئەو یانانە یانەی گشتین. لـەکاتی کـاری خێرخـوازی جاروبـار پـەنا بـۆ کەسـایەتییە بەناوبانگـەکان دەبـەن، وەك بانگەشـەیەك بـۆ کاروچـالاکییەکانیان، دوور نییـە ئـەو کەسـایەتییانەش لەوڵاتـدا پـاکترین کەسایەتی بن، هـیچ یـەکێکیش لـەو کەسایەتییانە ئـەو ڕاستییە ترسناکە نازانێت، کـە لەپشـتی ئـەو یانانـە و ڕێکخراوانەوەیـە، یـا پێـی دەزانـی وەلێ نەیاندەهێشت بێجگە لەکارە خێرخوازییەکەی بەولاوە نـان و پیـازی بەشـتی ترەوە بخواردایە.

مەرجیش نییە هەر هەموو ئەوانەی چوونەتە ئەو ڕێکخراوە ماسۆنییەوە خراپ بن، دیسان بەوەش هەڵمەخەڵەتێ، پێشتر باسم لـەوە کـرد کـە پلـەی زۆر لەماسۆنییەتدا هـەن، سێ پلـەی یەکـەم وەك دیاریکردنێکە بـۆ شـیاو و نەشیاوی، هـیچ ئەنـدامێکیش خـراپ نابێـت تـا نەگاتـە پلـە هـەرە باڵاکـان، ئـەودەم لەڕاسـتیی ڕێکخراوەکـە حـاڵی دەبێـت، کـە سـەر بەجوولەکەیـە و مەبەستی خزمەتکردنی جوولەکەیە، هـەر بـە بۆنـەی پلـە باڵاکانـەوە دەبێـت سوێند بەتەورات بخوات.

هەرکەسێکیش ماسۆنییەت دەستنیشانی بکات، بۆ بەئەندامبوون، دواتر لەسێ پلەی یەکەمدا وازی هێنا، بەدوایدا ناگـەڕێن و ئازاریشـی نـادەن، وەلێ گرفتەکە لەهیی وەك (من)دایە، دوای ئەوەی پلـەی پێشـکەوتووی بەدەسـت هێنا تـڕۆی دەکـەن. لە(ئەزهـەر) بـۆ هـەر کەسـێك بیـەوێ ببێتـە ئەنـدام لـە

ڕێکخراوی ماسۆنییەت و یانەکانی (ڕۆتاری و لیۆنز) فەتوای فەرمی بۆ بەحەرامکردنی دەرچووە. دواتر کۆڕی فیقهی سەر بەکۆمەڵەی جیهانی ئیسلام هاوشێوەی ئەو فەتوایەی دەرکرد، کە زۆر بە ڕوونی و وردی ئارمانجی ڕاستەقینەی ئەو ڕێکخراوەیان خستە ڕوو.

ئێستا کاتی ئەوەیە زانیارییەکی گرنگت وێدەم، کە لەسەرەتای قسەکردنمان پەیمانم پێدای پێتی ڕابگەیێنم، ناوی یاری ئەو کارتانەت بۆ ئاشکرا بکەم، کە گەمەی پێدەکەین، دەزانم بەناوەکە سەرت سوڕ دەمێنێت، ناوی(ئیلۆميناتی)یە، سیستەمی جیهانی نوێ، لەهەموو بازاڕەکانی جیهاندا بەردەستە، وەلێ نرخەکەی زۆرە و نزیکەی سێ سەد دۆلارە، کۆی کارتەکان پێنجسەد کارتە، هەر کارتێکیش نهێنییەکیان لەخۆ گرتووە، کارتێلێك نهێنییە سەردەمیانەیان هەڵگرتووە، هەندێ کارتیش نهێنی گۆڕانکاریی ڕێڕەوی سەردەمیان هەڵگرتووە، بڕێکی تری نهێنییەکانی ماسۆنییەت و ئیلۆميناتییان تیا نووسراوەتەوە، بڕێکی تریشی باس لە پیلانگەلێك دەکەن ئیلۆميناتی دەیەوێت بیهێنێتە دی. بەر لەوەی بەردەوام بین، دەمەوێ کورتە باسێکت لەمەڕ ماسۆنییەت و ئیلۆميناتییەوە بۆ بکەم. نموونەکان زۆرن وەلێ من گرنگەکانیانت پێدەڵێم.. ئەگەر سەرنجی فیلمی دیزنی (عەلادین)ت کردبێت، بیرتە جنۆکە شینەکە کە بۆ عەلادین هاتە دەرەوە، لەسەر کاغەزێکی درێژ دانوستانێکیان مۆر کرد، دواتر لەمەڕ پارەو ژنەوە هەرچی دەویست بۆی دەباری، سکێتچ.. سەماکارێکی کۆمیدی بوو، وەلێ تەواو گوزارشت لەو ڕاستییە دەکات.. خۆت بەشەیتان بفرۆشە، هەرچییەك دڵت بییەوێت بۆتی دەستەبەر دەکات، ئەو یانەیەشت وەبیر دێنمەوە کە ( سپۆنج بۆب) دایمەزراند و هێمای ئیلۆميناتیی بەسەرەوەیە.

داهێنەری ئەم گەمەیە[1] (ستیڤ جاکسۆن) ئەندامێکی ڕێکخراوی ئیلۆمیناتی بوو. ئەم ڕێکخراوە مەبەستیبوو شوێن پەنجەی لەهەموو جیهاندا هەبێت. لەفیلمە سینەماییەکاندا هێمایەکانی خۆی لەنێو دیکۆرەکاندا دادەنێت، هەرەم و چاوەکە ، چوارگۆشە سپی و ڕەشەکان، کە هێما بۆ یەکێتیی جیهانی جنۆکە و بنیادەم، ڕاستە و پەرگاڵ، ئەمانەش دەخرێنە نێو فیلم و کلیپە کارتۆنییەکان، سەدان کڵێسەی جیهانی ئەم هێمایانەیان لەخۆ گرتووە.بەکورتی ئەم گەمەیە کە لەنێو دەستماندایە، بوێرترین هەنگاوە بۆ دیاریکردنی شوێن پەنجەیان. بەدەر لەوەی گەمەکە ساڵی ۱۹۹۰ بڵاوکراوەتەوە، وەلێ شتگەلێکی تێدایە، دوای ئەو مێژووە ڕوویان داوە. دەتەوێت نموونەت بۆ بێنمەوە، باوابێت، ئەو کارتانەشت بۆ ئاشکرا دەکەم.

ئەم کارتە دەبینیت، ئەمەیان کارتی تیرۆرە، وێنەیەکی ئاشکرای بەسەرەوەیە، هەردوو تاوەری جیهانی لەکاتی تەقینەوەیاندا، بیرت نەچێت، ئێمە باس لەگەمەیەك دەکەین ساڵی ۱۹۹۰ داهێنراوە، یانی بەر لە یانزە ساڵ لەتەقینەوەی هەردوو تاوەرە جیهانییەکە، لەساڵی ۲۰۰۱ دوو فرۆکە خۆیان پیا کێشاو تەقاندیاننەوە.

ئەمەشیان کارتی دووەمە، کارتی پنتاگۆن، وێنەی بینای وزارەتی بەرگری ئەمریکای بەسەرەوەیە و دوای ئەوەی فرۆکەی سێیەم هەر لەهەمان ڕووداوەکەی یانزەی سێپتەمبەری ۲۰۰۱ی هەمان ڕۆژ کە خۆی پیاکێشا، دەسووتێت.

---

[1] یاریی.

ئەمەشیان کارتی سێیەمە، کارتی شۆڕشەکانە، وێنەی بیناگەلێکی بەسەرەوەیە، پێدەچێت شێواز عەرەبی بێت، وێنەیەکی گەورەی سەرۆکێکی دەوڵەتێکی عەرەبیشی بە جلوبەرگی سەربازییەوەی بەبانەوەیە، ئەو بینایەی لای سەرەوەشی گڕی گرتووەو دەسووتێت، پێدەچێت وڵات لەبارودۆخی شۆڕشدا بێت. ئەم کارتە بە بیست و یەك ساڵ بەر لەڕوودانیان گوزارشت لە شۆڕشە ناوخۆییەکانی وڵاتە عەرەبییەکان دەکات، ئەو ژەنەڕاڵەش کە وێنەکەی بەسەرەوەیە زۆر لەوە دەچێت (موعەمەر قەزافی) بێت!

کارتی چوارەم، کارتی دیکتاتۆرە، وێنەی هەمان وڵاتی عەرەبی و هەمان سەرۆك و هەر هەمان جلوبەرگی سەربازیی بەسەرەوەیە، وەلێ بینای تیا نییە بسووتێت، پێدەچێت وڵات ئارام بێت، ئەمەش دیسانەوە گوزارشت لە سەرۆکێکی عەرەبی دەکات، خودی میللەتەکەی بەسەریا ڕادەپەڕن. ئەمە بێنە و بەراوردی بکە لەتەك هەر شۆڕشێك لە شۆڕشە عەرەبییەکان، ئەوساکە دەزانیت کە پڕ بە پێستی یەکن.

کارتی پێنجەم و شەشەم ، کارتی شاژن(دیانا) و کارتی (سەدام حوسێن)، باس لەپیلانی کوشتنیان دەکات. ئەوەی یەکەمیان دوای حەوت ساڵ لەبڵاوکردنەوەی گەمەکە ساڵی ١٩٩٧ کوژرا، ئەوی دووەمیشیان ساڵی ٢٠٠٦ دوای شانزە ساڵ لەبڵاوکردنەوەی گەمەکە کوژرا.

کارتێلێکی زۆر ماون وەك کارەساتی کارەساتەکان جارێ ڕوویان نەداوە، وێنەی دارمانی تاوەری( جێنزا واکۆ)ی بەناوبانگ لە تۆکیۆ،

کاتژمێرە بەناوبانگەکەی سەر تاوەرەکە بەجوانی دیارە کە دەتەقێتەوە و خەڵکەکەش بەترسو دڵەڕاوکێوە هەڵدێن.

فێربووم مامەڵەیەکی جیاواز لەتەك ئەم کارتانەدا بکەم، مامەڵەی جادووگەرێك فەرمان بە جنۆکەکان بدات. کارتەکانم وەك نوشتەیەکی کاریگەر بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ڕیز کردوون کە بۆ خزمەتکردن بشێن، ئەویش بە ئاشکرا کردنی ڕاستییەکانە بۆ تۆ، ئەوجا بۆ جیهان.

ئێستا لەسەرمانە گەمەکە تەواو بکەین. دەزانم هەر هەموو ئەهریمەنەکان و ئیلۆميناتییەکان و جادووگەرەکان و ماسۆنییەکان و تەنانەت ئەوانەیش کە کاری خەراپ دەگێڕن، داوای کەڵلەی من دەکەن، واش هەست دەکەم لە کەڵلەم نزیکبوونەتەوە، با ئەم قسەو باسانە وەلا بنێین و گەمەکە تەواو بکەین.

تۆ ئێستا تێگەیشتیت لەجیهاندا جادووگەریی چۆن دەستی پێکرد، چۆن لۆسیڤەر هاتە خوارەوە و یەکەم جادووگەری درووستکرد، کە نەمرووود بوو، دواتریش بەوەت زانی جادووگەریی لەناو (بابل)دا چۆن سەریهەڵدا، بەتایبەت کە بۆ کاری خراپ بەکاریان دەهێنا، ئەوجا ئەوەش حاڵی بوویت، خودا بۆچی هارووت و ماڕووتی داگرد، تا خەڵکی فێری دژە جادووگەری بکەن، دواتریش ئەوەت زانی هۆکاری ناردنی سلێمان لەلایەن خوداوە بۆ قڕ کردنی هەموو جادووگەرەکان بوو، ئەوەشت زانی چۆن جنۆکەکان گزییان کرد و کتێبەکانیان لەژێر عەرشی سلێمان شاردەوە، دواتر دوای هەزار ساڵ (بافۆمیت)ی ئەهریمەن دابەزی تا شوێنی شاردنەوەی کتێبەکان بە نۆ سوارچاکانی هەیکەل ڕابگەیێنێت و دەریبهێنن، دوای دەرهێنانیشیان بەهۆی

ئەو کتێبانەوە دەوڵەمەندترین ڕێکخراویان لە ئەورووپا دامەزراند، هەر ئەو ڕێکخراوەی بەناوی سوارچاکانی هەیکەلەوە بوو، گۆڕدرا بە ڕێکخراوی ماسۆنی.، کە بوو بە گەورەترین ڕێکخراوی جیهانی و لقی زۆریشی لێ بووەوە، گەورەترین دەستکەوتیشی ، دامەزراندنی دەوڵەتی ئەمریکا بوو.

هاوتەریب لەگەڵ هەموو ئەمانە، سەرنجی مار (سێرپێنت)ی ئەهریمەنت دا، چۆن بیروباوەڕی جوولەکەی هەڵوەشاندەوە و دواتریش بیرو باوەڕی مەسیحیەت و ئەوجا بیروباوەڕی موسوڵمانەکان، توانی هەر یەکیانیش دابەش بکاتە سەر چەندین تایەفە و بیروباوەڕی جودا و تا ماون لەململانێدا بن. کاتی ئەوە هاتووە ماسۆنییەت لەتەك سێرپێنت یەکبگرێت، تا داهێنانگەلێکی تر بێننە ئاراوە، کە ئامانجیان مەزنتر بکەن، جا چ بۆ ڕێکخراوەکە بێت، یان بۆ خودی ئەهریمەن بێت، کە مەبەست لە هەیکەلی سلێمانە. نهێنی ئەو کارتەش نازانیت، بۆ چ مەبەستێك ئەوە دەکەن، وەلێ دواتر ئەوەشت بۆ ئاشکرا دەکەم.

لەسەر مێزەکە دوانزە کارتمان هەیە، پێدەچێت ژمارەکەی ئەمجارەمان زۆرتر بێت، بەو ئاوایە حیکایەتگەلێکی زۆر چاوەڕوانی گێڕانەوەن.

**کارتی یەکەم..** کارتی ئینگلتەرایە و وێنەی پیاوماقوولێکی ئینگلیزیی دڵخۆشی بەسەرەوەیە، لەپشتیشییەوە پێدەچێت کاتژمێرە بەناوبانگەکەی بیگ بن بێت.

**کارتی دووەم..** کارتی بەرتیل و خاوەیە، وێنەی دوو دەستی بەسەرەوەیە، تەوقە دەکەن و لەناو لەپیشیاندا دراوی سەوز.

**کارتی سێیەم**.. کارتی هێزی جەماوەرە، وێنەی کۆمەڵە دەستێکی بەرز کراوەی بەسەرەوەیە، چون ئەوەی لە شۆڕشدا بن.

**کارتی چوارەم**.. کارتی بانکی ئینگلیزییە، وێنەی ئامێرێکی سکەی دراوی زەبەلاحی بەسەرەوەیە، پڕە لەپارە.

**کارتی پێنجەم**.. کارتی دژە شۆڕشە و وێنەی سەربازگەلێکی بەسەرەوەیە، کەوتوونەتە وێزەی خەڵکی سڤیل.

**کارتی شەشەم**.. کارتی ئەڵمانیایە، وێنەی کۆمپانیاکانی ئەڵمانیای بەسەرەوەیە، ئۆتۆمبێلێکی (ڤۆڵکس والگن)یش.

**کارتی حەوتەم**.. کارتی فرانکفۆرتە ، وێنەیەکی شەوانی فرانکفۆرتی بەسەرەوەیە.

**کارتی هەشتەم**.. کارتی فرەنسایە، وێنەی تاوەری (ئیڤڵ)ی بەسەرەوەیە، لەگۆشەنیگاییەکی نزمەوە.

**کارتی نۆیەم**.. کارتێکە " لێگەڕێ کێکەکە بخۆن" وێنەی ژن و پیاوێکی ماقووڵی فرەنسی بەسەرەوەیە، قابلەمەیەکیشك کێکی بەسەرەوەیە کە لێی خوراوە.

**کارتی دەیەم**.. کارتی قەرزارە شەڕانگێزەکانە، وێنەی دووپیاوی بەسەرەوەیە، یەکێکیان زۆر تووڕەیە و ئەوی تریشیان ترساو دیارە، پێدەچێت قەرزاری پیاوە تووڕەکە بێت.

**کارتی یانزەهەم**.. کارتی پڕو پاگەندەیە.

**کارتی دوانزەهەم**.. کارتی ژەهرە.

بەسەرهاتی داهاتوو (سێرپێنت) بۆتی دەگێڕێتەوە، وەلێ ئەمجارە لە ئەوروپاوە هەڵدەکشێت، بە شێوازێکی داهێنەرانە دەیگێڕێتەوە.

***************

بەشی هەشتەم

# فیلمێك ئەهریمەن دەرهێنەرەکەیەتی

## ١٦٤٨ پاش زایین _ ١٨٠٠ پاش زایین

لەتاریکییـەکی ئەموستەچـاوی سـاردی ئەمشـەودا، هـەموو دەنگـەکان لەگوێتدا کپبوون، بەدەر لە فیشکاندن و لەرەی زمانـە دوولەتەکـەم بـەولاوە گوێت لـەهیچ دەنگێـك نییـە. پێدەچێبت بـەوەی لەمـەڕ منـەوە بیسـتووتە فیشکاندنەکەم سڕی کردبیت، وەلێ ئەمڕۆ مشتێك لەخەرواری نهێنییەکانم بـۆ ئامادە کـردووی، کـە مێشـکی مـرۆڤ هـەمووی بـۆ تـاوتوێ ناکرێـت، سـەرەتا باشـترین و خۆشـترین شـەرابێکت بـۆ ئامـادە دەکـەم، کـە حـەزت لێیـەتی، دواتـریش بەگەردنتـەوە دەئـالێم تـا فێنکـت بکەمـەوە، لەبـەر ئـەوەی ئادەمزادێکی تازەی بەلامەوە هەر ئەمشەو شتگەلێکت پیشـان دەدەم، هـەر بـەو شـێوازەی خـۆتیش مامەڵـەت لەتـەکا دەکـەم. فیلمێکـی بەڵگـەداری شەیتانیی خۆمت بۆ نمایش دەکەم، ئەو فیلمە لـە نووسـینگەی تایبـەتی مـن نـەبێت لـەهیچ شـوێنێك نابینیـت، نووسـینگەی مـار. هـاوڕێ لەسـەر ئـەم کورسییە دانیشـە و بڕوانـە ئـەو بینـدەرەی بەرامبـەرت، چاکیش گـوێم بـۆ ڕادێرە، سەرلەبەری بەسەرهاتەکەی خۆمـت هـەر بـەو ئـەدای سـەردەمیانەی خۆت، کە پێی ڕاهاتوویت بۆ دەگێڕمەوە.

بیندەرەکە[1] کەوتە گەڕ، دیمەنێکی سەیری خستە ڕوو، خەڵکانێکی زۆر ڕژابوونە سەر شەقام. لەتێڕوانینەکەتەوە بۆ جلوبەرگەکانیان مەزەندەی ئەوە دەکەیت لەسەردەمێکی کۆندان، لێمگەڕێ بەمەزەندەکانتەوە ماندووت نەکەم، ئەو خەڵکەی دەیبینیت، گەلی ئینگلتەرایە، دەبینیت چەند جوان ڕیزیان بەستووە و نقەیان لەخۆیان بڕیوە، تەنانەت چرپەشیان نایەت. ئەوان لەچاوەڕوانیی (پاشا)دان، بەدیوێکی تر چاوەڕوانی لەسێدارەدانی پاشا (چارڵز)ن. ئەوان پاشایان خۆش دەوێت. لەپڕ دەرگایەکی دارین کرایەوە، پیاوێک بەپۆشاکێکی پاشایانەوە دەرکەوت و بەسەر ڕێڕەوێکی داردا بە بەرچاوی خەڵکەکەوە بەڕێکرا. میللەتەکە بەداماوییەوە تەماشایان دەکرد، بەشێک لە ئامادەبووان خۆیان بۆ نەگیرا و دایانە پڕمەی گریان، بەشێکی تر گریان لەگەروویاندا قەتیس مابوو، ئەوانەش کە لە ڕێڕەوە دارییەکەوە نزیکبوون، وەک ڕێزێک بۆی دەستیان بۆ پێی پاشا دەبرد. پاشا گەیشتە کۆتایی ڕێڕەوە بەدار دروستکراوەکە و پیاوێکی زلی کەتەش بە تەورێکی تیژەوە وێستابوو، بێ سێ و دوو دەزانیت ئەو شوێنە بۆچییە، شوێنی ملپەڕاندنی پاشایە، کە تەور بەدەستەکە ملی دەپەڕێنێت.

پاشا لەهەیبەتی خۆی کەمنەکردەوە و ترسی لەخۆی بار نەکرد. بەڕاستی پاشاکان هەیبەتی پاشایەتییان ئەگەر بۆ ملپەڕاندنیش بێت تا دوا چرکە نادۆڕێنن، ئەوەتا ملی خۆی دەخاتە بەردەست گیۆتینەکە و بەزمانێکی فەرمانڕەوانە بە گیۆتینەکە دەڵێت:

---

[1] شاشە.

- چاوەڕێی ئیشارەتەکەم[1] بکە.

ئەو جۆرە پاشایانەم بەدڵە، کە تا دواچرکەش لەژیانی خۆیاندا بە پاشایەتییانە دەمێننەوە. ئەوەتا وەك فەرمانێك بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکەی ئاماژە بە گیۆتینەکە (جەللاد) دەدات، ئەویش تەورەکەی بەرز دەکاتەوە بۆ سەر پاشا چارلز، تا ملی بپەڕێنێت، حەشاماتەکە بەیەکا دێن و گریان فوغان و هات و هاواریان بەرز دەبێتەوە, پیاوێك بەجلوبەرگی سەرکردەوە دەستی لەخوێنی پاشا وەردەدات و دواتر ڕوو لەجەماوەرەکە دەکات و دەستە خوێناویەکەی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت:

- چاوتان لێیە؟ خوێنەکەی سوورە و شین نییە، کەواتە وەك باسیان لێوە دەکرد خودا نییە.

گرتەی ڤیدیۆیی کامێراکە لەسەر ڕووخساری ئەو پیاوە نیشتەوە. ئەو پیاوە (کرۆمۆیل)بوو. بە شێوازی فیلمەکانی (هۆلیوود) وێنەی کرۆمۆیل ڕوون نەبوو، ئەمە تا گرتەیەك لەڕابردووت بۆ دەرکەوێت، گرتەیەکی ئەو پیاوەی خەریکی نووسینی نامەیەکە وەلێ دیار نییە بۆ کوێی دەنێرێت. لەو نامەیەدا هاتووە.. لە ئینگلتەرا بەرامبەر برە پارەیەك پارێزگاریی لەجوولەکەکان دەکەم، وەلێ ئەوە تا پاشا چارلز لەژیاندا بێت مەحاڵە و ناشکرێت پێش دادگاکردنی لەسێدارە بدرێت. ئەوجا بیندەرەکە گرتەیەکی تری ئەو پیاوەت بۆ دەخاتە ڕوو کاتێ وەڵامی نامەکە وەردەگرێتەوە، نامەکە دەکاتەوە کە تێیدا هاتووە.. هەرکاتێك چارلز لابرا ئەو هاوکارییە ماددییە کە دەدەین و جوولەکەش لە ئینگلتەرا قبووڵیانە، پێویستە ڕێگای

[1] ئاماژەکەم.

هەلاتنی بۆ خۆش بکەن و دواتر دەستگیری بکەن، ئەوسا هۆکار بۆ دادگایی کردنی یەکلا دەبێتەوە.

نووکە بیندەرەکە گرتەیەکی تری لەڕابردوو خستە ڕوو.. خودی پاشا چارلز، کە لەسەر تەختەکەی دانیشتووە و هۆڵەکەش پڕە لەپیاوگەلێك بەجلوبەرگی فەرمییەوە، کە تایبەتە بە دادگایکردن. ڕۆژی دادگایی پاشا چارلزە. کرۆمۆیل ئەوەی نامەکەی پێی ڕاگەیاندبوو، بەمەرامی خۆی گەیاند و ڕێگای بۆ هەڵهاتنی چارلز خۆش کرد و دواتریش دەستبەسەری کرد، ئەوەتا دادگایی دەکرێت. دادوەر پێیگوت:

– دەربارەی ئەو تاوانەی ئاڕاستەت کراوە چ قسەیەکت هەیە، کە ئەو دەسەلاتەی لەڕێی یاساوە پێت دراوە خەراپت بەکار هێناوە.

پاشا قسەکەی پێ قاچی[1] و بە هەیبەتەوە پێی گوت:

– باس لەکام یاسا دەکەیت، دواتر تۆ کێیت تا لەیاسا بدوێیت، من پاشام، هەموو ئەو پیاوانەی نێو ئەم هۆڵە بەخۆشتەوە پیاوی منن.

کرۆمۆیل بەزمانێکی توند گوتی:

– تۆ لێرە دادگایی دەکرێیت، دەسەلاتەکەت بەخەراپی بەکار هێناوە، ئازادی میللەتەکەت بەرقەرار نەکردووە.

پاشا قسەکەی پێ بڕی:

---

[1] بڕی.

- من لەمەڕ ئازادیی میللەتەکەم لەهەر هەمووتان زیاتر دەزانم، حکومەتێك پەرلەمان بەڕێوەی ببات و سوپا دەستی بەسەریا گرتبێت، گەورەترین زوڵم وزۆرداریتان گێڕاوە، نەك من ئازادیم قۆرخ کردبێت؟

پێدەچێت بەکەسایەتیی ئەم پاشایە سەرسام بووبیت، بەداخەوە ئەو هەموو پیاوەی بەدەوریەوە بوون، ئەندام پەرلەمانی بریتانی بوون، لەهەمان کاتدا دژی بوون، کرۆمۆیل.. ئەو پیاوەش لەگەڵیاندا بوو، ئەو سەختترین دوژمنی پاشا بوو، ئەو نامەیەش کە بۆی هاتبوو، لەلایەن دەوڵەمەندەکانی جووەوە هاتبوو، کە زێڕ و پارەی زۆریان بۆ هەڵڕشتبوو. جوولەکەکان بەر لە چوارسەد ساڵ لە ئینگلتەرا دەرکران، بڕیاری گەڕانەوەیان بۆ ئینگلتەرا دابوو، بۆیە (کرۆمۆیل)یان بە پارەو ئاڵتوونێکی زۆر و زەوەند کڕی، تا کودەتا بەسەر پاشا بکات. ئەوەتا بیندەرەکە (کرۆمۆیل)ت بۆ دەخاتە ڕوو چۆن سیستەمی پاشایەتی ڕووخاند و سیستەمی کۆماری دامەزراند و بەخۆی بوو بەسەرۆکی بریتانیا.

چارڵز چۆنی مەزەندە کردبوو، هەر وا دەرچوو، قەڵەمڕەوی کۆمارییەکان زوڵم و زۆرداری و دیکتاتۆری بوو. ئەوەتا کرۆمۆیل پەیمانەکەی لەتەك جوولەکەکان هێنایە دی، کۆمەڵێك لە زانایان و ڕۆشنبیرانی کۆکردووەتەوە و بەگەرم و گوڕی بۆ گەڕاندنەوەی جوولەکەکان هەڤپەیڤینیان لەتەکا دەکات، بیندەرەکەمان ئەو وتو وێژەی بەردەستبوو، کە گوتی:

- دەبێت مژدەی مەسیحییەت بە جووەکان بدەین، وەلێ چۆن ئەو مژدەیەیان پێ ڕابگەیێنین، ئەگەر نەتوانین بۆ نێو خۆمانیان بیانگەڕێنینەوە.

یەك لە ئامادەبووان بەرسڤی دایەوە و گوتی:

– ئەو جوولەکانە کە هاتنەوە، دەست بەسەر هەموو کاری بازرگانی و سامانی ولاتدا دەگرن.

ئەگەرچی هیچ فەرمانێکی کۆماری بۆ گەڕانەوەی جوولەکەکان دەرنەچوو، وەلێ ڕێگای پێدان دزە بکەنە ناو ولاتەوە. بیندەرەکە بۆ دیمەنێکی سەیرتری گواستیەوە، دیمەنی جەستەی پیاوێکی شییەوەبوو، کامێراکە لە دەموچاوی نزیکەوە بوو، بەلێ لاشەی پیاوێکە، ئەگەر زۆر لێی وردبیتەوە، دەبینیت ئەوە (کرۆمۆیل)ە. ڕەنگە لێم بپرسیت بۆچی جەستەی شییەوە بووە. دوای ئەوەی لاشەکەیان لەگۆڕنا، چارلزی دووەم هاتە سەر تەخت، پاشایەتی دوای شکستی کۆماری دووبارە هاتەوە و حوکمی ولاتی بەدەستەوە گرت، چارلزی دووەم فەرمانی دا هەموو ئەوانەی دژی باوکی بوون و لەگۆڕدان دەربهێنرێن و هەلواسرێن. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان سەردانی لەندەنت کرد، چوویتە شەقامی (ئیدجوار) کە بەشەقامی عەرەب بەناوبانگە. لەسەرگەی شەقامەکە بازنەیەك هەیە ئیشارەتە بۆ ئەو شوێنەی تیا هەلواسران.. ئا لێرەدا خیانەتکاران هەلواسران. ئەوجا بیندەرەکە دیمەنی پیاوێلێکی پیشان دای، تاریکیی لەخۆی گرتبوون، پیاوێلێك ڕەزامەند نەبوون بەوەی بەسەریاندا هات، ئەوانیش جوولەکەکان بوون، کە خاوەنی زێڕ و پارەبوون، ئەگەرچی دوای وەدەرنانیان و گەڕانەوەیان بۆ ئینگلتەرا سەرکەوتوو بوون، وەلێ پیلانەکەیان زۆر لەوە گەورەتربوو، تەنها گەڕانەوە بێت. پیلانەکەیان دەستبەسەرا گرتنی تەواوی ئابووری ولات بوو.

کامێراکە زیاتر لەسەر پیاوانێك نزیك بووەوە و دواتر بیندەرەکە لەخوار ئەو پیاوانەوە پیاوێلێکی زۆری قەبارە بچووکی پیشان دایت. ئەوجا بەسەر بیندەرەکەوە نووسینێکی دەرخست.. میللەتی جوولەکە. دواتر نەخشەی ئەورووپای پیشان دایت، ئەوجا فیلمەکە کەوتە گەڕ.. ئەو جووانەی بەر لە چوارسەد ساڵ لە بریتانیا دەرکران، دواتر لە هۆڵەندا، ئەوجا لە پۆرتووگال، ئەوجا نەمسا و فرەنسا و سەکسۆنیا و چیك و هەنگاریا تا دەگاتە ئیسپانیا. بۆچی وەدەر نران؟ چونکە خراپەکارییان لەڕادە بەدەر بوو. بیندەرەکە لەپیاوە گەورەکانەوە نزیك بووەوە، کە لەسەرەوە بوون، ڕستەی .. هەرە دەوڵەمەندە خاوە خۆرەکانی[1] جوو. بەسەر بیندەرەکەوە ڕوخساری تووڕەییان دیار بوو. ئەوجا فیلمەکە کەوتە بەردەوامی.. ئەو دەوڵەمەندانە دەیانویست تۆڵەی میللەتەکەیان بکەنەوە و هەر هەموویان لە پلە باڵاکانی ماسۆنییەت بوون، چەند تیرێکی نیشانە بۆ هۆڵەندا و ئەڵمانیا لێوەیان دەرچوو بوو، هەر کە گەڕانەوە بۆ ئەو دوو وڵاتە دەستپێشخەرییان کرد، چونکە ئەو دوو وڵاتە کارئاسانییان بۆ کردن.

کامێراکە لەهۆڵەندا نزیکەوە بوو، پیاوانی جێی بەرزەکان بەرەو هۆڵەندا دەڕۆن، بیندەرەکە دەریخست هەر پیاوێ ژنێکی هۆڵەندیی لەسیلەدا بوو. بەڵێ جوولەکە سووخۆرەکان لەتەك ژنە هۆڵەندییەکان هاوسەرگیریان کردبوو، ماڵباتیان پێکەوەنابوو. گرتەی کامێراکە یەك لەو پیاوانەی دەرخست، کە ناوی (میناسیح کوڕی ئیسرائیل)ە، خانەوادەکەی لە گەورەترین خانەوادەی هۆڵەندایە. ئەوجا بیندەرەکە کەسێکی تری

[1] سووخۆر ، ڕیباخۆر.

دەرخست، بەناوی ویلیام.. ئەمیان کوڕی (میناسیح)ە، ئەوجا بیندەرەکە ویلیامی لە هۆڵەنداوە بەگەشت بۆ بریتانیا خستە ڕوو، هەر بیندەرەکە ئافرەتێکی بریتانیی لەسیلەی ویلیام دەرخست، بیندەرەکە لای سەرەوەی ئافرەتەکە پیاوێکی دەرخست ناوی نا( دۆق بۆرك) بەڵێ ویلیام کچی ئەو دۆقەی مارەکردبوو. دۆق کێیە؟ ئەوە ئەو کەسەیە دوای مردنی چارڵزی دووەم بوو بەپاشای وڵات. بینیت جوولەکە چۆن لەعەرشی بریتانیا نزیکەوە بوون؟ وەلێ جارێ هیچت نەبینیوە!

ئەوەتا بەسەر بیندەرەکەوە بڵاوکراوەیەکی زۆر وتارگەلێکی ڕۆژنامەوانیی زۆر دەبینیت، کە ناوبانگی پاشای وڵات دۆق یۆرك دەشێوێنن، تابەرەو فرەنسا هەڵهات. نووکە بیندەرەکە پاشای نوێی وڵاتی بریتانیای بۆ خستییە ڕوو، ئەویش (ولیام کوڕی میناسیح)ی جوولەکەیە. ئەوجا بیندەرەکە نەخشەی بریتانیای بە پیاو و ژنەوە خستە ڕوو، لەژێریشەوە نووسرابوو.. خانەوادەکانی پاشایەتیی بریتانیا، دواتر نیشانەیەکی هەڵەی وەك لێکدان بە ڕەنگی سووری پیا هێنان، ئەوجا کۆمەڵێك ژن وپیاوی هێنایە ڕوو، لەژێریشیەوە نووسراوێکی دەرخست.. خانەوادەکانی پاشایەتیی جوو، بەسەریشیانەوە وێنەی پیاوێکی دەرخست، کە ویلیام بوو. هەر هەموو بنەماڵەی پاشایەتی بریتانی بە بنەماڵەی جوولەکە ئاڵشت[1] کرانەوە، کە تا ئەمڕۆ پشتا و پشت دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە.

وەلێ هێشتا هەر هیچت نەبینیوە. بیندەرەکە دەرەوەی کڵێسایەکی بۆ خستیتە ڕوو، ئەوجا لە دەرگای کڵێسەکە نزیکەوە بوو، کە بەتەواوی کڵۆم

[1] گۆڕینەوە.

درابوو، بردیتییە ژوورەوە، تا ببینیت، ولیام لەگەڵ کۆمەڵێك زەلامی سوو خۆری جوو لەسەر خوانێك دانیشتووە. بڕوانە نووکە ولیام چییان لەتەکا دەکات. ئەوان کۆمەڵێك کاغەز دەنووسن، بیندەرەکە ئەو کاغەزانەشت بۆ ئاشکرا دەکات، کاغەزی یەکەم قەرزێك بە بڕی یەك ملیۆن و دووسەد و پەنجا هەزار جونەیهی ئیستەرلینی بە ولیامی دەدەن، ئەو ڕۆژەی ئەو قەرزەیان وێدا، مەرجێکی شەیتانییان بۆ نووسی، کە بیندەرەکە لە لاپەڕەی دووەمدا بۆی خستویتییەوە ڕوو. لە کاغەزی دووەمدا، پوختەکەی.. ناوی ئەوانەی قەرز یان داوە هەتا هەتایە بەنهێنی بمێنێتەوە، هەر ئەوانەش مۆڵەتیان بدرێت بانکێك لە ئینگلتەرا دامەزرێنن. هەر ئەمانە لەبەڕێوەبەرانی بانکی ئینگلتەرا مافی دەرهێنانی دراو و بڕەکەی و نرخی زێڕ دیاری بکەن. بۆ قەرز دانەوەی کە بە ویلیام دراوە و بۆ سوودی قەرزەکەش حکومەتی ئینگلتەرا باج بخاتە سەر گەلی بریتانیا. لەکۆتاییدا بیندەرکە بەرواری قەرزەکەی دەرخست، کە ساڵی ١٦٦٠ دراوە، دواتریش بەسەر بیندەرەکەوە و لەسیلەی ئەو بەروارەوە، بەروارێکی تری دەرخست ١٩٥٠، ئەوجا باری قەرزەکە ڕوونکرایەوە، کە لە ملیۆنێك و دووسەد و پەنجا هەزار جۆنەیهی ئیستەرلینییەوە بوو بە بیست و دوو ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، کە بریتانیا قەرزارە بە بانکی جوولەکە سوو خۆرەکان، بەو شێوەیە جوولەکە سواری کەری بریتانی بوون. ئەوجا نەخشەی ئەوڕوپا دەرکەوت، بەسەر نەخشەکەشەوە مارێك. ئەوە منم نامناسیتەوە؟ ئەوەتا بیندەرەکە مارەکە لە ئینگلتەراوە بەرەو فرەنسا دەجوولێنێت.

ئەوەتا کامێراکە دەتباتە خوارەوە، هەر وەك چۆن فڕۆکەکان بەرەو ئەوڕوپا شۆڕ دەبنەوە، دادەبەزێت و گرتەکەی نزیکتر دەکاتەوە، ئەوەندە

نزیك دەبێتەوە تا فرەنسا دەردەکەوێت، وەلێ کامێراکە لەفرەنسا دانابەزێت، بەڵکو کەمێك لەسەر ئەو ڕێگایەی فرانکفۆرتی ئەڵمانی بەرەو پاریس دەچێت وەلا بووەوە. کەشێکی باراناوی، هەورە برووسکەیە، شۆڕەسوارێك بەبان ئەسپێکی ڕەشی قەترانییەوە بە ژێر باران و هەورە تریشقەکە بەرەو پاریس غار دەدات، ئەوجا ئاسمان گرماندی، برووسکەیەك لەئاسمانەوە بەرەو زەوی بلاچەی[1] دا، بەچاوی خۆت سۆسەی[2] بکە، بزانە چی ڕوودەدات. بروسکەکە لە شۆڕەسوارەکەی دا، کە دەیویست لەو بارو دۆخە ناهەموارەی کەشە باراناوییەکە هەڵبێت و لەو غەزەبەی خودا دوور بکەوێتەوە. خۆت بەمەزەندەی چیی بەسەرهات مانوو مەکە، بروسکەکە لێیدا و خۆی و ئەسپەکەی کرد بەقەرەبرووت[3] و کەوتە سەر زەوی. ئەوجا بیندەرەکە دیمەنێکی تری خستییە بەرچاو.. دوو لەپیاوانی پۆلیس بەو ڕێگایەدا تێدەپەڕین، ئەمە دوای ئەوەی بارانەکە لێیکردەوە. ئەوەتان چاویان بە پیاوە مردووەکە کەوت، هەڵیدەگرن و ڕادەستی نزیکترین بارەگای پۆلیسخانەی دەکەن.

پێدەچێت شڵەژانێکی گەورە لە پۆلیسخانەکەدا هەبێت، دوای ئەوەی پشکنینی شت و مەکەکانی کرا، کۆمەڵێك بەڵگەنامەی ترسناکی هەڵگرتبوو، بەڵگەنامەی تۆقێنەر، دەزانم پەرۆشی زانینی ئەو بەڵگەنامانە لە کەللەی داویت، کامێراکە لەپۆلیسخانەکەدا لەجانتای مردووەکە کە لەسەر

---

[1]

[2] چاودێری.

[3] سووتا.

مێژەکەدابوو، نزیک بووەوە، ئەوجا یەك یەك بەڵگەنامەکانی ئاشکرا کردن. دەزانم حەزت بە خوێندنەوە نییە، بۆیە هەر خۆم پێتی ڕادەگەیێنم.

ئەو بەڵگەنامانە لە لایەن پیاوێکەوە بەناوی( ڕۆتچیلد)ەوە سەرۆکی جڤاتی فرانکفۆرتی ماسۆنییەتی سەر بە ئەڵمانیا بۆ مەزنی ماسۆنییەتی فرەنسی لە پاریس (دۆق دۆرلیبیان) ڕەوانە کرابوو، ئەو بەڵگەنامانە وێنەیەکی پرۆتۆکۆلاتی دەسەڵاتدارانی جوولەکە بوو، کورتەکەی کە تیا هاتووە.. بەشێوەیەکی گشتی قسەکردنە لەسەر پیلانگێڕی شۆڕشی جیهانی بۆ لەناوبردنی هەموو عەرشەکانی ئەورووپا. باس لە کەم و کوڕی شۆڕشی ئینگلیزی دەکات، باس لە پیلانێك دەکات بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێك لە فرەنسا.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو بەڵگەنامانە چون شتێکی گوماناوی باسیان لەدیموکراسییەت دەکرد. باشترین چارەسەر بۆ سەرکەوتنی ئەو دیموکراسییە گوماناوییە بەسەر پاشا زۆردار و زاڵمەکان میللەت ڕاپەڕێت، بۆیە بیرۆکەی دیموکراسییەت پێویستە بۆ هەموو وڵاتانی جیهان بگوێزرێتەوە، ئەوەش سەرناگرێت ئەگەر باری ئابووریی وڵاتان تووشی داڕووخان نەبێت، بۆ ئەوەش جوولەکەکان مامۆستای ئەو تێکدانی دۆخەن و زێڕ و پارە لای جوولەکەیە و هەر ئەوان ئابووری هەموو جیهانیان بەدەستەوەیە. خەڵکەکە وادەزانن پاشاکانیان هۆکاری هەژاری میللەتن، بۆیە بیر لە دیموکراسییەت دەکەنەوە بۆ چارەسەرکردنی دۆخەکەش کۆدەتا و شۆڕش دژ بە پاشاکانیان بەرپا دەکەن، گرنگ نییە لەو شۆڕشە کێ سەرکەوتوو دەبێت، بێ شك سەرکەوتووانیش پێویستیان بە بەهێزکردنی

ئابوورییـه، ئێمـەش وەك جوولەكـە دەسـتی قـەرزیان بـۆ درێـژ دەكـەین، یا بەشێوەیەكی تر بیلێم، لقێكی بۆ شۆڕ دەكەینەوە، ئەگەر دەستی بۆ برد تا نەخنكێت، ئەوا وەك چۆن لەبریتانیا گیرامان و بوون بەكۆیلـەمان، ئـەوانیش دەكەین بەكۆیلەی خۆمان، ئەگەر دەستیشیان بۆ نەبرد، چاوی دەربچێت با هەر بخنكێن. ئەمە كورتەی ئەو بەڵگەنامانـە بـوو، كـە دەسـەڵات لـەخورجی ئەو سوارەدا دۆزینییەوە.

ڕەنگە ناوی (ڕۆتچیلد) بەلاتەوە ئاسایی بێت، ئەوەی ئەو بەڵگەنامانـەی نـارد. ڕۆتچـیلد.. دەوڵەمەنـدترین بنەماڵـەن لەسـەر گـۆی زەوی، تەنانـەت لەهـەموو مێژووشـدا دەوڵەمەنـدترین بنەماڵەیـەكی (جـوو)ن. ئەگەرچـی لـەو خانەوادانە نەبوون كە پیلانی شۆڕشـی ئینگلیزییـان گێڕا، وەڵێ هـەر هـەموو شۆڕشەكانی دوای ئەو شۆڕشە دەستی ئەوانی تێدابوو.

نووكە فیلمەكـە دوكـانێكی بچـووكی پـارە گۆڕینـەوەت پیشـان دەدات، ئـەویش لـە فرانكفـۆرتی ئەڵمانیایـە. كامێراكـە لەدوكانەكـە نزیكـەوەبوو، دەتوانیـت سـەرنجی هێمایـەك بـەبان دوكانەكـەوە بـدەیت، كـە قـەڵغانێكی سووره، ئەوەتا كامێراكە دەتباتە ژوورەوە و پیاوێكت دەبینـی. بیندەرەكە نـاوی كـابرای بـۆ نووسـیت، نـاوی (ئیمشـێل موسـا بـاوەر)ە، پێشـتر ئـەو جوولەكەیـە ئاڵتوونچـی[1] بـوو، وەڵێ ئێسـتا دوكـانێكی پارەگۆڕینـەوەی كردووەتەوە. كامێراكە لەسەر ئەو لادەچێت تا وێنەی كوڕەكەیت پێ پیشان بدات، كە نـاوی (ئیمشـێل مـایرۆ بـاوەر)ە، لەسـیلەی بـاوكی وێسـتاوە و بە

---

[1] زێڕینگر.

پەرۆشییەوە دیقەتی[1] دەستی دەدات. لەسەر شێوازی گرافێکس کامێراکە لەسەر دەموچاوی منداڵەکە وێستا، دواتر گۆڕدرا بە دەموچاوی گەنجێکی پێگەیشتوو، ئەوجا کامێراکە دوور کەوتەوە، تا پێتی نیشان بدات دەچێتە بانکی (ئۆبنهایمەر)ەوە. منداڵەکە گەورەبووە و لەم بانکەدا کار دەکات، وەلێ زۆر چوست و چالاکە، تەنانەت بانکەکەش کردی بە شەریکە بەشێکی بچووکی خۆی.

کوڕە گەنجەکە لە گرتەی کامێراکەوە دەرکەوت، دوکانی قەڵغانی سووری کردەوە، کە لەفرانکفۆرتی ئەڵمانیایە، باوکی مرد و بڕیاری دا بەردەوامی بەکارەکەی باوکی بدات، دوای ئەوەی دەوڵەمەند بوو. تەماشای قەڵغانە سوورە هەڵواسراوەکەی سەر دوکانەکەی کرد و بڕیاری دا ناوی خانەوادەکەی بنێت (ڕوتچیلد)بە ئەڵمانی بەمانای قەڵغانی سوور دێت.

لەبەر زیرەکی و پڕ ئەزموونی ڕۆتچیلد لە کارەکانیدا بەردەوام بوو، تا دەهات دەوڵەمەندتر دەبوو، تا بوو بەدەوڵەمەندترین دەوڵەمەندەکانی ئەڵمانیا. ئەوەتا کامێراکە (ڕۆتچیلد)ت بۆ دەخاتە ڕوو، دوای ئەوەی بوو بە کەسایەتییەکی بەناوبانگ، لەتەك دوانزە پیاوی جوولەکە کۆبووەتەوە، هەر بەسەر زارەکی ئەوەی لە بەڵگەنامەکان دیتمان، بۆی ئاشکرا کردن، دەیویست شۆڕشی جیهانیی، لە ئەوروپا و ئەمریکا و ڕووسیا بەرپا بکات، وەلێ دەیویست لەوەش زیاتر بکات. جارێ کاتی ئەو بابەتەمان نییە. تۆ ئێستا زانیت ڕۆتچیلد کێیە، زانیشت ئەو بەڵگەنامانەی کە ناردنی ئاشکرا بوون، وەلێ دوای ئەوە چی ڕوویدا؟

---

[1] سەرنجی.

ئێمە ئێستا واین لە(بالی)ی ڕۆیاڵی فەرەنسا، لەمێژوودا مەزنترین کۆشکی پاشایەتییە. لەتەکما وەرە لێل کامێراکە لەدەرگا سەیروسەمەرەکەی بچینە ژوورەوە، وەلێ ئاگات لەچاوت بێت، ئەو گرتانەی ئەمجارە دەیبینیت سانسۆریان لەسەرە. دەی لەتەکما با بچینە ژوورەوە. ئاهەنگێکی کراوەیە، کراوە بەو مانایەی نەشەرم و نەحەیا بوونیان نییە. ئەوان بەو شێوازە خۆیان بەپێشکەوتوو دادەنێن. پیاوان و ژنان لەسەمایەکی تێکەڵ و پێکەڵدان، چون ئەوەی بۆ بەرەلایی بەرگی حەیایان فرێ دابێت، هەر پێکەو هەڵیدەدەن. ئەوانە بەخۆیان دەڵێن شۆڕشگێڕ، چونکە شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە بەلای ئەوانەوە ئەو کەسانەن لەهەموو ئاکارێك داماڵراون. لەوەش گەڕێ، بڕوانە دەموچاوی ئامادەبووانی ئاهەنگەکە. بەوردی گوێیان لێبگرە، ناتوانم قسەکەت بۆ دووبارە بکەمەوە.

بڕوانە ئەو پیاوەی لەو سووچە وێستاوە. کامێراکە لەسەر ئەو پیاوە وێستا، کە جلێکی بەهاداری لەبەرە، پیاوێکی سەر زل و لووت زل، دەموچاویشی چون ئەوەی ئاوڵەی دەرکردبێت. ئەوجا تەماشای ئەو شۆخ و شەنگە بکە کە ڕێك خۆی کراوەتر دەبینێت، بەتایبەتی کاتێ خۆی هاویشتە باوەشی پیاوە کەتەکە. ئەو پیاوە کۆنت (دی میرابۆ)یە، ژنە شۆخ و شەنگ و کراوەکەش، (مەدام هێرز)ی دەنکەکەیەتی.

ئەو پیاوە قژنەی دەیبینیت کە تەمەنی لە چل ساڵیدایە ئا ئەو پیاوەبوو شۆڕشی فەرەنسای هەڵگیرساند، وەلێ تا ناقرگەی قەرزاربوو، ئەو پیاوە عەشقی ژنە جوانەکانە، ئەوەندەی لەتەك ژنان ڕابواردووە، لەحەساو نایەت. دەزانێت چۆن ڕاویان دەکات، زمانێکی هەیە ژنم ئەوێ خۆی لەبەری ڕاگرێ،

ئەمە وایلێکردووە لە پیاو ماقوولان زیاتر نزیکببێتەوە، بیرت نەچێت گوتمان پیاوێکی شۆڕشگێڕ دژی دەسەلات بوو.

کامێراکە ڕووی بەرەو لای ئاهەنگێڕان کرد، هەولبدە ژنەکان بەو جەستە ڕووتەیانەوە فریوت نەدەن، دەزانم هەقی خۆتە ئەم هەموو هەوەسبازییە ببینیت و خۆت بۆ ڕانەگیرێت، وەلێ دان بەخۆتا بگرە تا عەقلّ لەدەست نەدەیت. ئەوەتا کامێراکە لەسەر پیاوێکی تر نیشتەوە، لاجانگەکانی سپی دەکەنەوە، تەپلی سەریشی بەرەو کەچەلی دەڕوات، جلوبەرگەکەشی لە پۆشاکی پاشایانە دەچێت، ئەو پیاوە (دۆق دۆرلێیان)ە، ئامۆزای (لویسی شانزەهەم )ی پاشای فەرەنسایە و ئەم کۆشکەش هەر هی خۆیەتی. ئەوەتا ئەوانەی قسەی بۆ دەکردن، جێیان دەهێلێت و بۆ لای کۆنت دی میرابۆ دەچێت، ئەوەی لەتەك شۆخ و شەنگەکە سەرقالی دەسبازییە.

نهێنییەکی ترت پێڕادەگەێنم، سوو خۆرانی جوولەکە لە کۆنت (دی میرابۆ) نزیکببوونەوە، دەیانزانی میرابۆ بێ ڕکابەری تەنها پیاوە دەتوانێت جەماوەر بشلەژێنێت[1]، بۆیە وەك سەرکردەیەك پێشڕەوی شۆڕشگێڕەکانی کرد. لەبەر ئەوەی میرابۆ قەرزار بوو، جوولەکە قەرزەکەیان بۆ دایەوە، بەو شێوەیە کەوتە بن باری قەرزێکی قورستر کە بۆی نەدرێتەوە. جوولەکە میرابۆیان بە خاتوو(هیرتز) ناساند، ئەو ئافرەتەی لەپیاوەکەی جیاببووەوە، بەو جۆرە میرابۆ تا ناقرگەی لەبن قەرزی جوولەکەدا بوو، میرابۆ یەکە هاوڕێی نزیکی دۆق (دۆرلییان)بوو، ئەویش گرفتی دارایی زۆری هەبوو، میرابۆ دۆقی بەجوولەکە ناساند، بەو ئاوایەی قەرزیان لێبکات، ئەوانیش

---

[1] هانبدات.

پارەییەکی زۆریان بە قەرز وێدا، بەو شێوەیە وەك هاوڕێکەی تا ناقرگەی قەرزاری جوولەکە بوو.

ئەوەی ڕاستی بێت، درۆ نییە گەر بڵێم جوولەکەکان بۆ بەدەستهێنانی عەرشی فرەنسا (دۆق دۆرلێیان)یان دەپەرست. ئێدی کۆشك و خانووەکانی ئەویان وەك سەنتەری کۆبوونەوەی شۆڕشگێڕان و ئاهەنگی ڕابواردن و چاپ و چاپەمەنی و بڵاوکراوەی شۆڕش بەکار دەهێنا. بەو شێوەیە جوولەکەکان دوو بنەمای سەرەکییان داکوتی. ڕاپەڕینی جەماوەری میرابۆ و پاشای بانەڕۆژ[1] دۆرلێیان.

لەسەر شێوازی فیلمە سینەماییەکان، گرتەی سەر بیندەرەکە خێرا خێرا دەڕۆیشت، ئێدی ئامادەبووانی ئاهەنگەکە بلەز دەجوولانەوە، لەکۆتاییدا کۆشکیان جێهێشت. کامێراکە لەم کۆشکە قەحپەخانەییە دەرچوو و خۆی گەیاندە کۆشکی (ڤێرسای) ڕێك لەباخچەی دەرەوەی کۆشکەکە، یەکسەر چاوت بە زەلامێکی تەنگ ئەستوور دەکەوێت، ئافرەتێك لەسیلەیدایە، لە خانمی خانمان دەچێت. گرتەکە لەپشتی ئافرەتەکەوە بوو، لای خوارەوەی بیندەرەکەیش ناوی ئافرەتەکە دەرکەوت..(ماری ئەنتوانێت) شاژنی فرەنسا و ژنی پاشا لویس. ئەوەتا کامێراکە بەدەور شاژنەوە دەسووڕێتەوە، تا دەموچاویمان بۆ ئاشکرا بکات. هەر کە ڕوخساری دەرکەوت، نیشانەیەکی ئێکسی سوور لەسەر ناوەکەی دەرکەوت، کە ئەوە ماری نییە. پیاوە تەنگ ئەستوورەکە باوەشی پیاکرد و کەوتە ڕامۆسینی. بیندەرەکە ناوی ئافرەتەکەی دەرخست، کە (ڕۆهان)ە. ئەوجا پیاوە تەنگ

---

[1] داهاتوو ، دواڕۆژ.

ئەستوورەکە پاکەتێکی گرانبەهای دەرهێنا. کامێراکە سەری بەبان پاکەتەکەوە کرد، هەر کە تەنگ ئەستوورەکە پاکەتەکەی هەڵدایەوە، چاوت بەو بریق و باقەی ناو پاکەتەکە کەوت، ئەبڵەق مەبە، لای خوارەوەی بیندەرەکە نووسرا.. ملوانکەی دوڕ. دواتر نرخەکەی لەسیلەی ئەو دوو وشەیە هاتە سەر بیندەرکە.. نرخەکەی دوو ملیۆن لیرەی فرەنسییە.

ئەوجا کامێراکە لە کۆشکی ڤێرسایەوە هەڵیدایتە کۆشکێکی تر، کۆشکی پاشای فرەنسا. لەناو کۆشکەکە دیمەنێکی سەیرت بینی. کامێراکە لەپەنجەرەوە خۆی بەژوورا کرد، ئافرەتێك دەرکەوت، جلوبەرگەکەی کوت و مت، لەو جلوبەرگەی ئەو خانمە دەچوو کە لەکۆشکی ڤێرسای بینیت. کامێراکە بەدەوریدا کەوتە خولانەوە. خانمەکە زۆر بە تووڕەییەوە قسەی لەتەك پیاوێك دەکرد. لای خوارەوەی بیندەرەکە نووسرا (ماری ئەنتوانێت)ی ڕاستەقینە. ئەوجا کامێراکە ئەوپەڕی دەنگی لێهەڵبڕی، تا گوێت لە وتو وێژەکەیان بێت. ماری ئەنتوانێت.. بەزمانێکی توند بەپیاوەکەی گوت:

- من ئەو ملوانکەیەم نەکڕیوە، ئاگاشم لێ نییە چەندی پێدراوە، تەنانەت کاغەزی دەستیشم بۆ ئەوە نەنووسیوە، ئەمە بووختانە، بڕۆ دەرەوە، تا گاڵ[1] پاسەوانەکانم لێ نەداویت، بەتۆپزی بتبەنە دەرەوە.

- خانمی شازادە، بەوپەڕی لێبووردنەوە، تۆ لەلایەن دادگاوە داواکراوی.

---

[1] بانگکردن.

ئەوجا کامێراکە بلەز بۆ کۆشکی ڤێرسای بردیتییەوە. دەبینیت کچە ساختەکە ملوانکەکە لە پیاوەکە وەردەگرێت و بەسوپاسێکی گەرمەوە ڕۆیشت.

کچە ساختەکە لەیەکێك لەخانووەکانی پاریس ملوانکەکە ڕادەستی ئافرەتێك دەکات، بەناوی( جین)ەوە. جین بەخەنینەوەیەکی گاڵتەجارانە لەملوانکەکە دەڕوانێت.

نووکە[1] فیلمەکە دەستی پێکرد، شرۆڤەی هەموو دیمەنەکانت بۆ دەخاتە ڕوو.. جوولەکەکان بۆ ناوزڕانی شاژن ماری ئەنتوانێت دەستیان بەهەڵمەتێکی بەرفراوان کرد. جوولەکەکان بیانویستایە هەر میللەتێك بەسەر پاشاکانیانەوە ڕاپەڕێنن، پڕوپاگەندەی ئابڕووزڕانیان بۆ بڵاودەکردنەوە. ئەوەبوو پڕوپاگەندەیان بۆ شاژن ماری بڵاو کردەوە، کە پەیوەندی عیشقی لەتەك پیاوێکی کڵێسا کردووە، ئەو پیاوە ملوانکەیەکی دوو ملیۆن لیرەی فڕەنسی وەك دیاری بۆ کڕیوە، لەکاتێکدا وڵات لە قەیرانێکی سەختی ئابووریدایە، ئەمەش بەرامبەر بەوەی حۆی ڕادەستی بکات و لەتەکیدا سێکس بکات. بەدیوێکی تر کچە ساختەکە کە کوت و مت لە ماری دەچوو، هەر دەستکردی جوولەکەکان بوو، پیاوی کڵێساکە لەتەك ڕۆهان جووت بوو، سەرەتا نامەیەکی ساختەی دڵداری یا عیشقبازییان بۆ درووستکرد، دواتر بەواژۆی شاژنەوە نامەکەیان بەساختە مۆر کرد، کە تێیدا هاتبوو..شاژن داوای لە ڕۆهان کردووە، بەناوی خۆیەوە ملوانکەیەکی دوڕی هەرە گرانبەهای بۆ بکڕێت، دواتر پارەکەی وێدەداتەوە و هەر جارێکیش هەوەسی

---

[1] ئێستا.

لێبوو لەتەکیا بخەوێت، چونکە ماری بۆ خۆی ناتوانێت ئەو ملوانکەیە بکڕێت، نەبادا میللەت ڕاپەڕێ. ڕۆهان کردی و چووە لای گەورەترین دوڕ فرۆش و وەسفی ملوانکەکەی وێدا، ئەویش ئەو ملوانکەیەی بۆ دروست کرد. ڕۆهان ملوانکەکەی ڕادەستی کچە ساختەکە کرد، گوایە (ماری)یە، کچە ساختەکەش خۆی ڕادەستی ڕۆهان کرد و حەسرەتەکەی دامرکاندەوە، دواتر ملوانکەکەی ڕادەستی (جین)ی خانمە گەورەی پیلانگێڕ کرد.

کاتی پارەدانەوەی ملوانکەکە هات، کچە ساختەکە دیار نەما، ڕۆهان وەختەبوو شێت بێت، نامەیەکی بۆ شاژن نارد کە پەیمانی وێدابوو پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە، شاژن ئاگا و خەبەری لەهیچ نەبوو، دوڕفرۆشەکە گرفتەکەی گەیاندە دادگا، دادگایی دەستی پێکرد، دادگا بەو نامەیەی زانی کە ساختە کراوە، جین کە پیلانگێڕەکە بوو دەستبەسەر کرا، لەسەر شانی پیتی(V)[1]ی یان نووسی، بەو ئاوایەی کە دزەکەیە. ئەگەرچی ماری لەم گرفتەی ڕزگاری بوو، وەلێ جوولەکەکان لە ماوەی دادگایی و دوای دادگاییش درۆیان بەدەمییەوە هەڵبەست، کە دارو دەستەکەی بۆ ئەو شێوازە دزییانە بەکار دەهێنێت. بوختانیان بۆ کرد لە تووڕەبوونی میللەتی پرسیبوو، پێیانگوتبوو، میللەت هەژارەو پارەی نییە نان بکڕن، ئەویش لەوەڵامدا گوتبووی، ئێ ئەوە چ کێشەیەك نییە، نانیان دەست ناکەوێت با کێك بخۆن. جوولەکە توانی میللەتی فەرەنسا بورووژێنێت، میللەتیش هەر ئەوەندەی گڕی گرت، مەحاڵە دابمرکێتەوە، خەڵکەکە دابەزینە سەر شەقامەکان،

---

[1] مۆرکرد ، داخ کرد ، چاپکرد.

لێلیاندا شۆڕشگێڕەکانیش هاتنە سەر شەقامەکان، تا کۆتایی بەو دەسەڵاتە بهێنن.

ئەمێستا هاتینە سەر ملپەڕاندنەکە. پێدەچێت زۆرێك لەسەرۆکەکان بەو ڕووداوەوە سەریان تیا چووبێت. کامێراکە پەخشی لەسێدارەدانی شاژن (ماری ئەنتوانێت)ی خستە ڕوو. شاژن بە عەرەبانەیەکەوە بەناو جەماوەر بەرەو گیۆتینەکە[1] بەڕێوەیە و جەماوەر شتگەلێکی پیس و بۆگەنی تێدەگرن. ئەوەتا دەگاتە لای گیۆتینەکە، هەوڵ دەستیان بە بڕینی پرچە درێژەکەی کرد، ئەوسا ئامادەی سەر گیۆتینەکەیان کرد، بیرمچوو، کاتێ لەتەك جەلادەکە سەرکەوتە سەر تەختی ملپەڕاندنەکە پێی کەوتە سەر پێی جەلادەکە، دواتر ئاوڕی لە جەلادەکە دایەوە و پێیگوت:

– بەداوای لێبووردەوە، لێم مەگرە.

داوای لێبووردنی لەجەلادەکە کرد، کە پێی وەبان پێیەوە ناوە. لەپڕ کاروانی پاشا دەرکەوت، خودی لویس پاشا بوو، عەرەبانەکەی بە زێڕ ڕازابووەوە، لەعەرەبانەکەی هاتە خوارەوە و سەری لای گیۆتینەکە سەرکەوت، بەدەستی خۆی ملی شاژنی لەژێر گیۆتینەکە نا، ئەوجا گیۆتینەکەی هێنایە خوارەوە و ملی شاژنی پەڕاند. هەراو هوریای خەڵکەکە بەرزەوە بوو، ئاژاوەگێڕەکان بەهەلیان زانی و بەرەو سەر تەختەکە سەرکەوتن و بەهۆی ڕق و تورەیان پێیان لەخوێنەکەی شاژن وەردا. ماسۆنییەت هەرکەسێکی خستبێتە نیشان، ڕێك دەیپێکێت.

---

[1] ئامرازی سەر پەلدان ، سەرپەڕێن ، (مقصلە).

ئەوجا کامێراکە بەرەو سەردەمێکی تری بردی.. دوای ئەوەی دۆق دۆرلێیان دەستی بەسەر عەرشی فرەنسادا گرت، ئەمەش بێگومان دوای سەرکەوتنی شۆڕشگێڕان بوو. چونکە پیلانەکە وابوو، بڕیار درا کاغەزەکەی بسووتێنرێت و دەورەکەشی لێ بستێننەوە. بێ دووبارە کردنەوەی بەسەرهاتەکان، کە نامەوێت درێژدادڕیی تیا بکەم، ئەوەتا عەرەبانەیەکی داخراو بەناو جەماوەرەکەدا تێدەپەڕێت، خەڵکەکە هەرچی نەشێت بە شاژنی دەستبەسەری ناو عەربانەکەیان کرد، ئەویش بە گریانەوە تەماشای دەکردن و توانای هیچ بەرسڤدانەوەیەکی نەبوو، تا بردیانە بەر گیۆتینەکە، لەگریانی خۆی نەکەوت، دواتر سەریان بەژێر گیۆتینەکەوە نا.

هەرچی (میرابۆ)بوو، درکی بەو سیناریۆیە کردبوو، کە لەتەک دۆق دۆرلێیان دووبارە بووەتەوە، ئەوە بۆ پاکتاوی سیاسیی پاشایەتی نەبووە، بەڵکو پیلانێکبوو بۆ لەناوبردنی پیاوماقووڵان. هەر لەگەڵ حاڵیبوونی میرابۆ جوولەکەیش بەوەی زانی میرابۆ لە پیلانەکان تێگەیشتووە، بۆیە بڕیاریاندا بەزووترین کات لەناوی بەرن، وەلێ بۆ زڕاندنی ناوی میرابۆ کاتیان بەدەستەوە نەبوو، ئامادەکاریشیان بۆ پیلانێك نەکردبوو، بۆیە ژەهر خواردیان کرد، دەنگۆی ئەوەشیان بڵاوکردەوە، کە مێرابۆ خۆکوژیی کردووە.

دووکەسی تر لەفیلمەکەدا هەن، تۆ نەتبینیون، وەلێ لە شۆڕشگێڕەکانن، ئەوانیش (ڕۆبیسپێر) و (دانتۆن)نن، ناوی ئەمانەیان زڕاندو بەرەو گیۆتینەکە بەڕێیان خستن. کامێراکە ئەو ڕۆژەی خستە ڕوو کە وتاریان لەناو خەڵکەکە دەدا:

– من ناوێرم ناویان ببەم، بەتایبەت لەم کاتەی شۆڕشدا، ناشتوانم ئەو دەمامکەیان لەسەر لابدەم، کە چەندین نەوەیان پێ فریو داوە.

بەدەم ڕێوە کە ڕۆبیسپێریان بەرەو گیۆتینەکە دەبرد، کەسێک فیشەگێکی بەدەمیەوە ناو کوشتی، بەو شێوەیە کارتێکی تری جوولەکان یاری پێکرا. لەکۆتایی شۆڕشەکەشدا فیلمەکە سەرتاپای خۆی خستە ڕوو، ئەوەتا جوولەکەکان بۆ دەرچوون لەو قەیرانە ئابوورییەی کە فڕەنسا تێیکەوتووە دەستی هاوکاری بۆ حکومەتی فڕەنسا درێژ دەکەن و بەو مەرجەی خۆی دانوستانی ئەو قەرزە بنووسێت(واتا حکومەتی فڕەنسا) قەرزێکی زۆریان وێدەدەن، مەرجێکی تریش بە دانانی بەڕێز (نیکەر)ە بە وەزیری دارایی فڕەنسا، چونکە پیاوێکی سەر ڕاست و بەئەزموون و زیرەکە، دەتوانێت فڕەنسا لەو قەیرانە ڕزگار بکات.

لەکۆتاییدا فیلمی سەر بیندەرەکە[1] ڕەش دەرکەوت، نووسینێک بەسەر بیندەرە ڕەشەکەوە دەرکەوت..

ئەمەو نیکەر بوو بەهۆکاری ئەوەی قەرزەکانی حکومەتی فڕنسا بۆ جوولەکەکان بگاتە نزیکەی ١٧٠ ملیۆن لیرەی فڕەنسی.

************

کۆتایی

[1] شاشە ، ڕووگەی نیشاندان لەتەلەفزیۆن و سینەما.

چەپڵە بۆ جوولەکە لێدەن، چەپڵە بۆ مار(سێرپنت)ی ئەهریمەن لێدەن، کە هەنووکە دیقەتم دەدات و شەش ئەهریمەنی تری لەتەکدایە، چەپڵە بۆ هەموویان لێدەن. شۆڕشی ئینگلیزی و سواربوونی کەری ئینگلیزی، دواتر شۆڕشی فەرەنسی و سواربوونی کەری فەرەنسی، ئەوجا شۆڕشی ئەمریکی و سواربوونی کەری ئەمریکی، دەی شۆڕشی ئیسپانی و سواربوونی کەری ئیسپانی، هەروەها شۆڕشی ڕووسی و سواربوونی کەری ڕووسی.. هیتر و هیتر. ئەگەر بمەوێت شکستی پاشاکانی هەموو ئەوروپات بۆ بگێڕمەوە، ئەوا دوو کتێبی تری وەك ئەمەی ژێر دەستتی دەوێ پڕی بکەمەوە. بەهەرحاڵ پەلەت نەبێت، هەر ئەوەندەت بەسە بزانیت ماسۆنییەت ئاگری هەر هەموو ئەو شۆڕشانەی ئەوروپای هەڵگیرساند. سێرپنت.. دوو نموونەی باشی بۆ گێڕانەوە.

تا هەنووکە ڕۆتچیلد و کوڕەکانی و نەوەکانی ڕۆتچیلد لە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهانن، ئەو بنەماڵەیە نیوەی سامانی جیهانیان بەدەستە، بانکە جیهانییەکان هی ئەوانە، ئەو بانکانەی دەوڵەت نییە بە ملیۆنەها پێیان قەرزار نەبن، هەر بەو بۆنەیەشەوە توانیویانە دەستیان بەسەر هەموو حکومەتەکان بە ئەمریکاشەوە بڕوات، واتە ئەوان لەسەرووی دەوڵەتەکانەوەن. بۆ درۆ و ڕاستی دەتوانیت ئەم بابەتە لە ئەنتەرنێت بەدوایدا بگەڕێیت. ئا، لە ئەمریکاش خانوادەیەکی تر هەیە، بەناوی (ڕۆکفیلەر)، هەر وەك بنەماڵەی ڕۆتشیلد دەوڵەمەندن. ئەم دوو بنەماڵەیە پەیوەندییەکی بەهێزیان هەیە، تەنانەت ژن و ژنخوازیشیان لەنێواندا هەیە و پەیوەندی کاریشیان بەیەکەوە هەس.

تا بۆتی ئاسان بکەمـەوە، هـەڕەمێك بێنـە بـەر خـەیاڵی خۆت، ئێمـەی میللەت لەژێری ژێرەوەی هەڕەمەکـەداین، بـەبان ئێمەشـەوە حکومەتـەکانن، کـە دەسـەلاتیان بەسـەر ئێمـەدا دەسـەپێنن، بـەبان ئەوانیشـەوە کۆمپانیـا زەبەلاحەکانن، هەر وەك مایکرۆسۆفت و سۆمی و هیتر، کە دەستیان بەسەر ئابووریی حکومەتەکانیانەوە گرتووە، بەبان کۆمپانیاکانیشەوە بـانکی هـەرە گـەورە هـەن، کـە دەسـتیان بەسـەر پاردارەکانـەوە گرتـووە، بـە بـان باکەکانیشەوە بانکی ناوەنـدی ، وەك بـانکی فیـدراڵی ئـەمریکی یـەدەك، بـە لووتکەی هەڕەمەکەشەوە بانکی پاکتـاوی نێـو دەوڵـەتی ، کـە هـەر لـەوێوە بانکەکانی جیهان ئاراستە دەکرێـت و چـاودێریی کارەکانیـان دەکرێـت، ئـەو بانکەی لووتکەی هەڕەمەکـە مـولکی بنەماڵـەی ڕۆتچیلد و شـەریکەکانێتی[1]، ئەمانە لەپشتی پەردەوە داینەمۆی بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکانن.

لەچاوەکانتەوە درك بەوەدەکەم بـاوەڕم پـێ نەکـەیت.. تـۆ بڵێـی ئـەوە ڕاست بێت و ماسۆنییەت ئەم هەمووەی گێڕابێت؟ بەڵێ دەچێتە مێشکەوە. دەتـەوێت بەڵگەیـەکی ڕوون و ئاشـکرا ببینیـت؟ کەواتـە لەتـەکما وەرە بـۆ دارستانی (بۆهیمی)، دارستانێکە لەباکووری کالیفۆڕنیا، هەموو ساڵی جارێك دەسـتەیەکی بـالا لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـەو دارسـتانە کـۆ دەبنەوە، کۆبوونەوەیەکی گەورەو بەرفراوان. ئەوانەی تێیدا بەشدار دەبن، سـەرۆکی ئـەمریکا و وەزیرەکـان و کەسـایەتی و پیاوماقووڵانی ئـەمریکا و بازرگان و سیاسەتمەدارانی ئەمریکا و پلە هەرە بالاکانی سوپای ئـەمریکان، تەنانەت مامۆستای زانکۆکانیش تێیدا بەشدار دەبن، گشت ئەوانەش لـە پلـە

---

[1] هاوبەشەکان.

هەرە باڵاکانی ماسۆنییەتن، چونکە ئەو جۆرە کۆبوونەوانە نهێنین، هەرگیز ڕێگە بە ڕۆژنامەنوسانیش نادرێت بچنە نێویانەوە، ئەوەش بڵاو دەکرێتەوە گوایە بۆ ماوەی دوو هەفتە پشوو بەخۆیان دەدەن، تا کەمێك لە خەمە قورسەکانی خۆیان بیر بچێتەوە، ئەو کۆبوونەوەیەش تەنها بۆ دوو هەفتەیە و بەس.

لەو کۆبوونەوە نهێنییە نمایش شانۆیی نهێنی دەکرێت. ڕۆژێك ڕۆژنامەنووسێکی بوێر و زیرەك دزە دەکاتە دارستانەکە، تا ئەوەی لەوێ ڕوو دەدات بە دەنگ و ڕەنگ تۆماری بکات، ئەو ڕۆژنامەنووسە ناوی( ئیلیکس جۆنز)بوو، ئەوەی تۆماری کردبوو جێی سەرسوڕمان بوو، ناوزڕاندن و ئابڕووچوونێکی لەڕادەبەدەربوو، کە هەموو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای هەژاند

ئەوەی بە کامێراکەی خۆی تۆماری کردبوو، کەشێکی سەرەکی بوو، کە لە شانۆگەرییەکەی نێو دارستانەکە نمایش دەکرا، ڕێوڕەسمی پەرستنی یەکێك لە بتەکان بوو. ئەوەی ڕاستی بێت لەسەردەمی نەمانی بتپەرستیی گەورە پیاوانی دەوڵەت لە بتپەرستنی خۆیان نەکەوتوون. ئەگەر درۆم نەکردبێت ئەوەی ڤیدیۆکە بڵاوی کردەوە هیچ جیاوازی نەبوو لەتەك ئەو سەردەمەی کە بابلییەکان بتیان تێدا دەپەرست، یا ئەو بتانەی قورەیش بۆ پەرستنیان درووستیان دەکردن.

ئەوەی بۆ یەکەمجار ڤیدیۆکە دەبینێت، وا دەزانێت تەماشای شانۆگەرییەکی گریك دەکات، کەسانێك دەبینێت بەجلو بەرگی ئاهەنگێڕانەوە دیمەنێکی شانۆگەرییەکە دەگێڕن، بەسەر شانۆیەکی بچووك

بەسەر گۆمێکی بچووکەوە، ئەوە دەسپێکی شانۆگەرییەکەیە، دواتر، حاڵی دەبیت پەیکەری گەورەی(کوندەبەبوو[1])ێکی ڕەشی تۆقێنەر دەردەکەوێت، ئەکتەرەکان لەنمایشی دواتر بە دەوری (کوندەبەبوو)ەکەوە مەشخەڵیان بەدەستەوەیە، وەك قەزەم لەچاو پەیکەری (کوندەبەبوو)ەکە دەردەکەوتن، ئەوجا گوێت لە دەنگێك دەبێت چون دەنگی جادووگەرێك کەشەکە بەڕێوە دەبات. هەموو بینەران لەڕێی بیندەرەکانەوە ئەو دیمەنەیان بە دەنگێکی ڕوون بینی، وەلێ هیچی لێ حاڵی نەبوون. هەر وەك دەزانیت، من کە لێرەم بۆ ئەوەی تێتبگەیێنم، منیش بەش بەش لەو کەشەت بۆ دەگوێزمەوە، چونکە زۆربەی لەدەمەوەریی بەولاوە چی تر نییە، بۆ شرۆڤە کردنیشی جاروبار ڤیدیۆکە ڕادەگرم، تا بۆتی ڕوون بکەمەوە.

سەرەتا قسەکەر بە دەنگێکی شانۆیی دەڵێت:

" بەڕێز (کوندەبەبوو) لە پەرستگای بەگەلأدار درووستکراوی خۆیدایە، هەر هەموو ئەوانەی لەدارستانەکەدان ڕێزیان بۆی هەیە. ئەی دارە گەورە و بەرزەکان سەرتان بەرز بکەنەوە، ئەی پوش و پەلأش خۆتان قیت بکەنەوە و وریابن ئەوە پەرستگای بۆهیمی پیرۆزە، هەموو ئەو کوڵەکانەش پیرۆزن کە لانەنەکەیان هەلگرتووە.

کەواتە (کوندەبەبوو)ە پیرۆزەکە پەرستگایەکی پیرۆزیشی هەیە، هەموو ئامادەبووانی ناو ئەم دارستانە لەپیاوانی دەوڵەت مەزنی دەکەن، لەوێش گلکۆیەکی پیرۆز هەیە، گلکۆ ئەو گۆڕەیە کە وەك مەزار وایە. ئەو ڕۆژنامەنووسەی ئەو گرتانەی گرت، گوتی.. ئەوە کەشی بتپەرستی بوو، ئەو

---

[1] بایەقووش.

بتەش کە لێرە دەپەرسترێت، خواوەندی بابلی کۆن(مۆلۆك)ە، وەلێ ئەمە ڕاست نییە، مۆلۆك سابرێنە[1] نەك کوندەبەبوو، لەهیچ شارستانییەێکیش نەگۆڕدراوە بە کومدەبەبوو. ئەوەی ڕاستییە، ئەوانە لەو کەشی پەرستنەدا (لیلێسی) شەیتانیان دەپەرست، کە هەموو شارستانییەکان سیمبولی کوندەبەبوویان بۆ دانابوو، بۆیە دەیانپەرست، چونکە سیمبولی یاخیبوونی هەبوو و بوو بە سیمبولی یاخیبوون، بەپێی قسەی (تەلموود)ی جوولەکە، بەر لەوەی خودا حەوا بئافرێنێت لیلێسی ئەهریمەت ژنی ئادەم بوو. هەرچی (لیلێس)ە بوونەوەرێکی سەربەخۆیە، هەرچی (حەوا)شە لە پەراسوویەکی ئادەمەوەیە، کاتێ ئادەم ویستی لیلێس بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی، لیلێس لێی یاخی بوو، کاتێکیش یاخیبوو، خودا نەفرەتی لێکرد و کردی بەو کوندەبەبووە. بەلای نوخبەی حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لەوێ کۆبوونەتەوە، مانای یاخیبوونییانە لەگشت ئاین و بیروباوەڕەکان، کە وایکردووە لیلێس بەلایانەوە پیرۆز بێت. خودا نەفرەتی لەو شەیتانە کردووە، چونکە خراپەکارە و ڕقی لە بنیادەمە و خێرییانی ناوێت. بیرەوەرییەکان ناوێلی[2] هاوڕێیانی خۆشەویست دووپات دەکەنەوە، ئەم دارستانەیان ناسی و خۆشیان ویست. ئازیزانم ئەی هاوڕێیانی ڕابردوو، بەلێ با ڕێگایان بدەین بێنەوە ناومان، تا مەودای نێوانمان چۆڵ نەبێت، وەرنەوە ناو بەسەرهاتەکانمان، دەی هاوڕێیانی دارستان کۆببنەوە، جادووی خۆتان بەسەر ئەم ئادەمیزادانە بخوێنن، لەم جیهانە بیانپارێزن و دەست بە چاوی

---

[1] تەگە ، نێرییی.

[2] ناوەکانی.

نابینایانــەوە بگــرن، چــاویان بەگومانەکانیانــەوە بکەنــەوە، ڕێ و شــوێنی بیرەوەرییەکانی دوێنێیان پێ بگرنە بەر.

لێرەوە شەیتانە ئازیزەکانیان بانگهێشت دەکەن، ئەو هاوڕێیانەی لە بەرەبەیانی مێژووەوە نزایان بۆ دەکەن، تا بێنەوە ناویان و لەتاریکی و ڕێگای گومڕاوی و نابینایی بیانبەنە ڕێگای ڕووناکی. لەپڕ بەلەمێك لە گۆمەکە دەردەکەوێت و بە بان شانۆکەوە لەنگەر دەگرێت، یەکێکی پێچراو بە کراسێکی ڕەشەوە دێتە دەرەوە ، ئەوجا قسەکەر دەڵێت:

" ئــەم قوربانییــە بــە گشــت کــارە خراپەکانییــەوە ، خەونــەکانمانی لێبڕیبووین، وەك چۆن بـابلی خـاپوور کرد، ئەڵبەتـە ئـەمیش دەبێت لـەناو بدرێت، وەك چۆن وایکرد قەوزە بەسەر بەردەکانی بابلەوە بڕوێت"

ئەم قوربانییە شەڕخوازە، هەر ئەو شتەیە کە شاری بـابلی وێـران کـرد، ئەو خاکەی یەکەمجار هاوپەیمانێتی بنیادەم و جنۆکـە و شـەیتانی تیا کـرا، ئەو شتەی ئەو هاوپەیمانییەتەی تێك دا و شـەڕی بەرامبـەر بـە سـیحر کـرد، بێشك خودایە.

ئەی بۆهیمینەکان و کەشیشەکان، کە بەدڵێکی سەنگینەوە نزاتان کرد، وەلامتـان درایـەوە، بـەهێزی هاوڕێیـانی سـەردەمی کـۆن، ئـەم قوربانییـە هەتاهەتایە لەناودەبرێت، ئەوەتا جەستەیمان بـۆ سـووتاندن ئامـادەکردووە، گۆرانی بەم بۆنەیەوە بڵێن، کوورەی سووتاندنمان بۆ گڕ داوە و چاوەڕوانی قوربانییەکە دەکات. . تۆ ئەی ئەو کەسەی هێناوتەتە ئێرە، ئـەم قوربانییـە دوژمنی جوانی بوو، لێخۆشبوونی بۆ نییە، تەنانەت لەگۆڕیشا ناحەسێتەوە، تەنها ئاگرە ئارەزووەکانی کپ دەکاتەوە.

پێدەچێت کوندەبەبووی پیرۆز (لیلیس) نزاکانی هێنابێتنە دی، ئەهریمەنەکانی هاوڕێیانی سەردەمی کۆنیی ناردبێت تا خودا بسووتێنن. دەی ئەوە ئاگرەکەیان جۆش دا.

" ئەی گەمژەیل[1].. ئەی گەمژەیل.. ئەی گەمژەیل، کەینێ فێردەبن ، ناتوانن لاقەم بکەن، ساڵ بەساڵ لەنێو ئەم دارستانە دەمسووتێنن، هاواری سەرکەوتنتان بە ئەستێرەکان دەگات، کاتێکیش لەم دارستانە دەچنە دەرەوە، منتان بیر دەچێتەوە، من نەگۆڕاوم، کە دەمبیننەوە ترس داتان دەگرێت."

"گەمژەن.. گەمژەن.. گەمژەن ئەگەر وابزانن منتان سووتاندووە"

ئەوە خودایە قسەیان لەتەکا دەکات، بەربەرەکانییان دەکات، دەڵێت.. ناتوانن بمکوژن. هەموو ساڵێك دەیسووتێنن و جارێکی تر دادێتەوە.

" بڵێ ئەی ڕۆحی گاڵتەجاڕ، گشت ئەمانە خەون نییە، ئێمە دەزانین تۆ چاوەڕوانمانیت، دوای تەواوبوونی ئەم مۆڵەتەی دارستانەکە، ڕووبەڕووت دەبینەوە، وەك خوویەکی کۆن لێلتا دەکەوینەوە شەڕکردن، هەندێکمان سەردەکەون، هەندێکی ترمان بە لەناوبردنت سەردەکەون. نووکە هاتووین بتسووتێنین، لەتەك ئەوەی ئاورەکە ڕۆحت دەسووتێنێت ، ئێمە ئەو دروشمە دەخوێنینەوە.. هاوین ئازادمان دەکات"

---

[1] گەمژەکان.

ئەوان ڕکەبەرایەتیی خودا دەکەن، درووشمی هاوین ئازادمان دەکات، سیمبولی کۆبوونەوەکانیانە، کە هاوینان لەم دارستانە دایدەبەستن، تا لەخودا ڕزگاریان بێت.

ئێوە جارێکی تر دەمسووتێننەوە، وەلێ بەم ئاورە نا، کە لێرە گڕتان داوە، لەو خاکانەی ڕەشم کردوون، ئەی گەمژەکان، هۆ کەشیشەکان تف لە ئاورەکەتان دەکەم.

خودا لەبەربەرەکانیتاندایە.. کێوە دەچن

ئەی کوندەبەبووی پەند و ژیریی بنیادەم، کوندەبەبووی بۆهیمی.. ئێمە لەتۆوە پەند و دانایی وەردەگرین.

ئاور نا.. ئاگر نا.. سووتمان نا.. گڕی ئەم دارستانە نا، بەڵکو با لەجیهاندا بێت، ئەم قوربانییە لەسەر ڕقی بنیادەم بسووتێنێت، لەم دارستانە دەری بکەنە دەرەوە، تەنها پزیسکێك ئەو ئاگرە پێکات، تەنها پزیسکێك، ببێتە مەشخەڵێکی پیرۆز، بۆ یەککرتنی مەزنی ڕووناکی، لە کووشتارگەی بۆهیمیدا.

داوا لەکوندەبەبووی پیرۆز لیلێیس دەکەن لەخودا ڕزگاریان بکات، لە بەربەرەکانییەکانی دووریان بخاتەوە.

ئەی کوندەبەبووی بۆهیمی مەزن، ئێمە سوپاسگوزارتین بۆ ئەو داواکارییە،هۆ قوربانی چلێس برۆ، جارێکی تریش دوور بکەوە، برۆ ئەی...

ئەی ئاوری هاوپەیمانێتی نەمر.. هاوین جارێکی تر ئازادمان دەکات

لێرە ئاگرەکە قوربانییەکەی سووتاند، کە خودایە. ئەوە بە بۆچوونی خۆیان بوو، بۆ دوو هەفتە لەکۆڵیان بووەوە، کە ماوەی پشووی نێو دارستانەکەیان بوو. مەزنی بۆ ئەفرێنەری ئاسمان و زەوی و ئاگر، ئەفرێنەری جنۆکەو بنیادەم، هیچ شتێك نییە جێی بگرێتەوە، هەزار جار تۆبە. لەوە گەڕێ، با بێینەوە سەر سەربردەکەمان، چونکە لەم ژیانەدا زۆرم بە بەرەوە نەماوە.. ئەگەر باوەڕیشم پێناکەیت، بڕۆ بە دووی وێنەی (جۆرج بۆش) و (ڕۆناڵد ریگن) و (ڕیچارد نیکسۆن) دا لە دارستانەکە بگەڕێ. هەندێکیشیان بەر لەوەی ببنە سەرۆکیش هاموشۆی دارستانەکەیان دەکرد، بڕۆ بەدووی ڕێکخراوی (کەللەسەر و ئێسکەکان)دا بگەڕێ، کە لقێکە لە ئیلومیناتی لە ئەمریکا، بڕۆ چاوپێکەوتنەکەی جۆرج بۆش لە تەلەفزیۆن ببینە، ئەو دەمەی خۆی کاندید کردبوو بۆ سەرۆککۆماری ئەمریکا، بێژەرەکە ئەم پرسیارەی لێکرد.. بەڕێز جۆرج بۆش تۆ لە ڕێکخراوی کەللەسەر و ئێسکەکان ئەندامی. لەوەڵامدا گوتی.. ئەو ڕێکخراوە نهێنییە و ناتوانم لەبارەیەوە قسەبکەم. هەر هەمان پرسیار لە ڕکابەرەکەی کە جۆن کێری کرا، ئەویش هەمان وەڵامی جۆرجی هەبوو.

بڕوانە ئەو دیمەنەی، کە لەناو دەستەی ڕێکخراوی کەللەسەر و ئێسکەکاندا بەنهێنی تۆمار کرا، ئافرەتێك لەقیژەو هاواری خۆی نەدەکەوت، هاوارێك چون ئەوەی (ئیمیلی ڕۆز) هاواری دەکرد، ئەو گرتەیە پیاوێك بەناوی( ڕۆم ڕۆزیلیام)ەوە تۆماری کرد.

ئاینێکی دانسقەیە، ئەوانەی لۆسیڤەری ئەهریمەن دەپەرستن، ئایینێکە هیچی بەسەرتا فەرز نەکردووە. ئەم بابەتە گۆڕەکانی پڕ کردووە

لەوانــەی باوەڕیـان پێیــەتی، ئــەم ئاینــە داواکارییــەکانت دەسـتبەجێ دەگــەیێنێت، هەرچـیت بوێـت لــە دوارۆژ و ژن و ناوبـانگی بـۆتی فەراهـەم دەکـات، ئـەمیش وەك ئایینـەکانی تـر دەبێـت گوێڕایـەڵی خوداکـەت بیت، ئـەوەی کـە دەیپەرستیت، کوێرانـە فەرمانـەکانی جێبـەجێ بکـەیت. ئەگـەر بەگوێت کرد، ئەوا دنیات بۆ دەکاتە بەهەشت، نەك ئـەو بەهەشـتەی گومـانی لێـدەکرێت، بـەڵکو ئـەو بەهەشـتەی تیـا لەدایکبوویتـە، ئەگـەریش بەگژیـدا چـوویتەوە ئـەوا دنیـات لێ دەکـات بـەدۆزەخ، دۆزەخێکـی کتـوپڕ، بۆیـە بـاوەڕداران بـەخودا دەڵـێن.. ئیمـە باوەڕمـان بەشـتێکە، نـەمانبینیوە، بەرجەستەشمان نەکردووە، وەلێ بەدڵ باوەڕمان پێیەتی.

با بزانین چیمان لەکارتەکاندا هەیە، کە سیانزە کارتن.

کارتی یەکەم.. کارتی سـەرکردەکانی (زایـۆن)ە، وێنـەی پیاوماقووڵانی زایۆنی بەسەرەوەیە، کە پێدەچێت لە وتووێژە نەبڕاوەکانیاندا بن.

کـارتی دووەم.. کـارتی کەناڵــەکانی تەلەفزیۆنــە، وێنــەی پیــاوێکی بەسـەرەوەیە، بەرامبـەر دەیـان بینـدەری گرتـووە، هـەر بینـدەرەو شـتێکی بەسەرەوەیە.

کـارتی سـێیەم.. کـارتی کاریگـەریی ڕاگەیاندنەکانـە، وێنـەی کۆمـەڵێك پیاوی بەسەرەوەیە، بەرامبەر بیندەری تەلەویزۆنێکی گەورە گردبوونەتەوە، بەدەست ئیشـارەت بـۆ سـەر بیندەرەکـە درێـژ دەکـەن، کەسێك پێدەچێت بێژەری هەواڵەکان بێت.

کارتی چوارەم.. کارتی کاریگەریی تەلەفزیۆنە بەسەر بینەرانەوە وێنەی ژن و پیاوێکی بەسەرەوەیە، بەسەرسامییەوە دەڕواننە بیندەرکە.

کارتی پێنجەم.. کارتی بەرتەسککردنەوەی ئازادیی ڕاگەیاندنە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە، پێدەچێت ڕاگەیاندنکار بێت، دەمی بە وشەی (censored)ی سووری گەورە بەسترابێتوتەوە.

کارتی شەشەم.. کارتی گرێبەستی بانکەکانە، وێنەی پێنج ماسیی قەبارە جیاوازی بەسەرەوەیە، گەورە بچووك دەخوات، هەر هەمووشیان ماسییەکی گەورەی دڕندە دەیانخوات.

کارتی حەوتەم.. کارتی دیموکراسییە، وێنەی پیاوێکی ڕەشپێست و کچێکی چینیی بەسەرەوەیە، یەك خودا دەپەرستن کە جوانەگایەکی ئاڵتوونییە.

کارتی هەشتەم.. کارتی ئابڕووچوونە، وێنەی دووپیاوی لەنێو نووسینگەیەك بەدەموچاوی پەشۆکاوییانەوە کە دیارە سەیریان لێهاتووە بەسەرەوەیە، وێنەکەش وا پێدەچێت لە ناو گرتەی کامێرایەکەوە بێت، ئەویش لەبەر بوونی وشەی REC لە گۆشەیەکی فیلمەکە ڤیدیۆییەکەوە.

کارتی نۆیەم و دەیەم.. هەردووکیان کارتی شتێکن، کە هەڵبژاردنێکی پاك و بێگەردە، بەسەر یەکێکیانەوە وێنەی کچێکی دڵخۆش دیارە ئاڵای ئەمریکای لەبەر کردووە، ئەوی تریشیان وێنەی هەر هەمان کچەو هەمان ئاڵای ئەمریکای لەبەرە، وەلێ بەشێوەیەکی تر.. ئیدی خۆت بزانە مەبەستم چییە.

کارتی پانزەهەم.. کارتی کاریگەری لەپشت دادگاوە، وێنەی دادوەرێکی بەسەرەوەیە، چەکووشەکەی بە مێزەکەدا دەکوتێت، لەپشتی پەردەیەکی سوورەوە سێبەری پیاوێك دیارە، شەپقەی بەسەرەوەیە.

کارتی دوانزەهەم.. کارتی ئابڕۆچوونێکی سێکسییە، وێنەی ژن و پیاوێکی بەسەرەوەیە، لەجێوبانەکە خەریکی...لەپڕ کەسێك وێنەکەیان دەگرێت، وێنەکە ڤیدۆییە، ئەوانیش لە ترسا دەستیان بەرز دەکەنەوە تا دەموچاویان دەرنەکەوێت.

دواین کارت.. کارتی سووتاندنی بەڵگەکانە، پێدەچێت کاغەزێلێکی زۆر گرنگ بن، دەسووتێنرێن.

سەربردەی داهاتوومان لەڕاستیدا سەربردە نییە، بەڵکو وانەبێژییە، سێ سەد کەسی دەوڵەمەندی زایۆن تێیدا ئامادەن و لە پلەی (٣٣)ی ماسۆنییەتن. ئەمانە لە بنەماڵەی جوولەکەی سیانزەهەمن. ئەمە دوای شۆڕشی فڕەنسی و بەر لەدەستپێکردنی شۆڕشی ڕووسیادا بوو.

وانەبێژەکە ناوی( تیۆدۆر هرتزل)ە، ئەو وانەیەی لەدووتوێی کتێبێك نووسرایەوە، زۆر خەتەرناکە. ئەو کتێبە لەژێر ناونیشانی(پڕۆتۆکۆلەکانی بیرمەندانی زایۆن)ە. لێدوانێکی دوور و درێژ بوو، سی ڕۆژی دوا بەدوای یەك وانەی تیا وترایەوە. منیش بۆم کورت کردوویتەتەوە، دەزانم حەز بەدرێژدادڕی ناکەیت، تەنها ئەو قسانەی گرنگن بۆم داناویت.

هەنووکە پێکەوە با بچین بۆ شاری (بال) لە سویسرا، بۆ کۆمەڵێك لە ماسۆنییەکان ئەم لێدوانە کرا. با لەنێو ئەو پیاوە گەورانە دانیشین و گوێ لە

هیرتـزل بگـرین. وەلێ دەمـەوێ ئامۆژگارییـەکت بکـەم، ڕەنگـە لێدوانەکـە بەلاتـەوە ئـالۆز بێـت، پێوویسـتە لەهـەر بڕگەیـەك زۆر وردبیتـەوە، تـا وەریبگریت. ئەوجا دەبینی ئەو قسانە زۆر نزیکە لەو ڕووداوانەی لەولاتەکەی خۆت ڕوودەدات، تەنانەت ئەگەر لەوپەڕی دنیاشدا بیت!

*************



# بەشی نۆیەم

# هۆ بیرمەندانی زایۆن

## ١٩٠٠ پاش زایین

### ڕۆژی یەکەم

ئەی بیرمەندانی زایۆن.. پاکترین گەلی سەر زەوی, هەق وابوو خودا ئێوەی بەگەلی هەڵبژێردراوی خۆی دابنایەو لەو هەموو گاوگۆلکانەی دنیا (گۆییم)[١] بە پێشتری زانیبان، تا مەملەکەتە مەزنەکەی لەسەر گۆی زەوی بنیات بنێن. ئەمڕۆ و سبەی و دووەیش بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە و کۆ دەبینەوە کە لەخۆمان حاڵی بین. ڕەنگە کۆبوونەوەی دیشی بەدوای ئەم کۆبوونەوانەدا بێت. ئێمە بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە تا قسە لەسەر پیلانە ستراتیژییە مەزنەکەمان بکەین، ئەوەی باو و باپیرانمان دایانمەزراند، دواتر ڕادەستی نەوەی دوای خۆیانیان کرد، ئەوانیش ڕادەستی دوای خۆیانیان کرد، بەو ئومێدەی تا سەر بەردەوام بێت. ئەوا ئەمڕۆ ئەو پیلانە بەدەستمان گەیشت و ئێمەش دەیپارێزین و ڕادەستی نەوەکانی دوای خۆمانی دەکەین.

---

[١] میللەتانی غەیری جولەکە.

ئەگەر نەمانپاراست و لێمان لادا، ئەوا ئێمە دەبینە هۆکاری کوێرکردنەوەی ئەو هەموو سەدەیەی پێکیانەوە نابوو.

ئەی گەلی ئیسرائیل.. ئێوە چاك دەزانن پیلانەکان چۆن بوون، ئەوەش دەزانن (بافۆمیت) هەموو ئەو کارە جوانانەی کە بەسەر نەخشەی جیهاندا هێنابووی پێشکەش گەلەکەمانی کرد، ئێدی پێویست ناکات وردەکارییەکانی لەمەڕ مێژووەوە کەهەموومان ئەزبەرمانە بدرکێنین، بیرمەندانی زایۆن.. نۆرەی ئێمەیە لەم سەربردە مەزنەوە بکەوینە گەڕ، با ئەو دڵەڕاوکێیە لەخۆمان داتەکێنین کە باوەڕمان لەق دەکات، با جیهان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە بەرین کە خۆمان مەبەستمانە.

باشترین و مەزنترین ڕێگایەك بتوانێت بیروباوەڕی هەر نەوەیەك ببەزێنێت، چ بیروباوەڕی ئایینی یان کۆمەڵایەتی ئەوا بەهەڵوەشاندنەوە یا گۆڕین نابێت، بەڵکو لەجێی خۆیدا بەگومڕاپێکردنێتی، شرۆڤەی وای بۆ دابنرێت کە ڕاستەوخۆ مەبەست نەبوبێت. باشترین نموونەش بیروباوەڕی مەسیحییەتە کە مار سێرپنت گۆڕانکاری تێدا کرد، هەروەها ئیسلامی شیعەش کە توانیمان گومڕایان بکەین و وابن دژ بە ئیسلامێتی محەمەد بجووڵێنەوە، تەنانەت دژایەتیشی بکەن، ئەم زانین و داناییەش هەر لەجوولەکە دێ.

ڕەنگە لەم پیلانانەش هەندێ بابەتی بەد ئاکاری بخەینە ڕوو کە ئێمە بە ئەنجامدانی ڕاسپێردراوین، وەلێ بەردەوام لەبیرتان بێت، گشت ئەم بابەتانە بۆ ئێمە دەبنە ئاکاری جوانی، سەرەڕای چەوساندنەوەو و زوڵم لێکردنمان،

لەهەموو لایەکیشەوە پەلامار دراوین، بۆیە تۆڵەی خۆمان بە پیلانگێڕی دەبێت، چونکە شەڕ باشترین ڕێگا چارەیە بۆ گەیشتن بەخێر!

هێزی ئێمە لەنێو هەموو هێزەکانی جیهان مەزنترین هێزە. ئێمە هێزێکی نادیارمان هەیە، هێزی نادیاریش هیچ هێزێك نییە تەنگی پێ هەڵچنێت.. کێ دەتوانێت هێزێك لەعەرشەکەی هەڵتەکێنێت کە نادیارە. ئەی زایۆنیستەکان ئەگەرچی ئێمە میللەتێکی پەرتەوازەین، وەلێ ئەم پەرتەوازییە بووەتە نهێنی ئەو هێزە مەزنەمان، بواری داوین بچینە نێو هەموو گەلانی جیهانەوە، دەست بە شوێن و پۆستە بالأکانیانەوە بگرین، بەو شێوەیە بەهێزترین گەلانی جیهان لەنێوان دووپەنجەمانن و چۆنمان بوێت وایان ئاڕاستە دەکەین. ئەی میللەتی ئیسرائیل لەمڕۆ بەدواوە کاتی ئاڕاستەکردنی گەلانە بکەونە خۆتان.

ئێمە بووین.. توانیمان ئاگری شۆڕشی فەرەنسیی هەڵگیرسێنین. ئێمە بووین یەکەمینجار بانگەشەمان بۆ ئازادی.. برایەتی.. یەکسانی کرد، وشەگەلێك تا خەڵکیش دەیانگوتەوە، بەری ئازادییان بەسەردا تەسکتر دەکردنەوە، جا وشەیەکی قێزەون هەیە بەردەوام دەگوترێتەوە، ئەویش دیموکراسییە. ئەرێ ئێوە دەزانن کە هیچ شتێك بەناوی دیموکراسییەوە نییە، بۆیە ئەو وشانە گومانن، وەلێ هەر ئێمەین دەزانین کە وەهمن، هەر ئێمەشین دەزانین بەو گومانانە گەمە بە خەڵك بکەین تا پێوەیان ئالوودە بن و بێنە پاڵمان، دواتر ڕاستی ئەو گومانانە زۆر بە وردی ڕوون دەکەینەوە، وەلێ نووکە بزانن کە خەڵکی هەر هەموو ئاژاوەگێڕن، جۆرێکن لەدڕندەکان لەڕووی هزر و لێکدانەوەدا کوێراییان داهاتووە، بۆیە پێویستییان بە هێزێکە

ڕێنماییان بکات، ئەو هێزەش لە دیکتاتۆری و زوڵم و زۆرداریدا یا لەو دیموکراسییەی بە یاسا ڕووپۆش کراوە تا هەمووان بەخۆیانەوە پابەند بکات. دیموکراسی یانی ئاژاوەگێڕی. پرسیارەکە ئەوەیە.. چۆن دەتوانین باوەڕ بە خەڵکانێکی ئاژاوەگێڕ بێنین. لەکاتێکدا لەهاتوهاوار بەو لاوە هیچی تر نازانن، دەکرێت ئەم هاتوهاوارەیان گەڕ بخاتە ناو شەقام و خەڵکی ڕاپەڕێنن. لێرەدا هەوڵ و تەقەلای ئاراستە کراو لە وتووێژی خەڵکییەوە دەگۆڕدرێت بە هاتوهاوار کردن. جەماوەری گەمژە بەوە تێدەکەون پشت لە وتووێژ بکەن. بەدیوێکی تر حکومەتیش لەو بەیەکدا چوونەی لەتەك خەڵکیدا دەبێتە ئەو مەبەستەی ئێمە هەولی بۆ دەدەین، ئێمەش ئەو دیموکراسییەمان پێشکەش بەو حکومەتە گۆیمانە کردووە ئەمە بەرزترین بیری مرۆڤایەتییە..

ئەگەر دیموکراسیخواز و کۆمارییەکان بیریان بێتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ گەلان بەرگەی هەموو قسەو ڕەفتارێکی سەرۆك و وەزیرەکان دەگرن، لەڕابردوودا بوایە، دەیان پاشایان لەسەر دەکوشت، وەلێ گیانیان بەوەیە مێژوو ناخوێننەوە مێژوویان خۆش ناوێ!

تەنها زوڵم و زۆردارییە شارستانییەت دادەمەزرێنێت، ئاخۆ پیلانەکان بەبەش بەشکراوی بەپێی ژمارەی عەقڵەکان دەتوانن شارستانییەت دامەزرێنن؟ بێ سێ و دوو مەحاڵە، بەڵکو شارستانییەتێکی پەرتەوازەی گومڕاو و بێ بەها دەبێت، جەماوەرێکی بەربەری دەبێت شارستانییەتەکەیان چۆن بێت؟ بەهێز فەرمانڕەوابێت، بێ هێز ژێردەستەبێت، بۆیە باوك لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیدا، بەسەر بچووکەکاندا سەرکەوتوو دەبێت،

بەسەر گەورەکانیشدا شکستخواردوو، بۆیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر باخیبوونێك لەحکومەتەکانماندا دەبێت ئەوپەڕی توند و تیژبین.

پێمبلێ خودی حکومەت دەتوانێت کۆمەڵگایەکی بەرتیلخۆر و گەندەڵ بەڕێوە ببات و تا سەر بەپێوەش بمێنێتەوە؟ ڕەنگە بڵێی سەردەمی حکومەتی زوڵم و زۆرداری بەسەر چوو و بۆ ئەم سەردەمە ناشێت، وەلێ من پێچەوانەکەیت بۆ دەسەلمێنم. کاتێ خەڵکی بەچاوی خوداوەندییەوە دەیانڕوانییە پاشاکانیان لەزوڵم و زۆرداریەکانیان بێدەنگ دەبوون، وەلێ کە بیرۆکەی ماف و یەکسانیمان وێدان، بەچاوی هاوڵاتییەوە دەیانڕوانییە پاشاکانیان، بەوەش پیرۆزیی هەرەسی هێنا، بۆیە نە زوڵم و زۆردارییان لێ قبووڵ دەکردن، نە لەوە کەمتریش.

ئاکار لەتەك سیاسەتدا لەهیچ شتێك یەکناگرێتەوە، فەرمانڕەوای بەئاکار سیاسەتمەدارێکی زیرەك نییە، بۆیە لەسەر عەرشەکەی نامێنێتەوە. داواکاری حوکم پەنا دەباتە بەر فێڵ و درۆ و دووزمانی. دڵسۆزی و جوامێری و دەسپاکی لەسیاسەتدا دەبنە سووکی و ڕیسوایی، ئەوانەش دەبنە هۆکار بۆ تێکدانی عەرشەکەی، زیاتر لە نەیارەکانی هەوڵ بۆ لەناوبردنی دەدەن.

دەمەوێت بابەتێکی گرنگتان بۆ باس بکەم.. چۆن دەتوانین دەوڵەتێکی زلهێز بکەین بە کۆیلەی خۆمان؟ سەرەتا دەبێت بۆ بۆشایی نێوان حکومەتی گەمژە و میللەتی ئاژاوەگێر فراوانتر بکەین، وابێت هەر لایەکیان ڕقی لەلایەکەی تر ببێتەوە، تا ئەو ڕقە لەدەست دەردەچێت، ئیدی حکومەتەکەش دەکەوێتە خۆی و مەسەلەی دیموکراسی ترۆ دەکات و دەکەوێتە وێزەی میللەت، تا ڕقی حکومەتیش بەرامبەر میللەت گەورەتر

دەبێـت، ئـەوا میللـەت لەیاسـا و ڕێسـای خـۆی یـاخی دەبێـت و حکومـەت دەبەزێنێت.

هەر دەوڵەتێکیش یاسای کاریگەر نەبوو، هەیبەتی خـۆی لەدەست دا و وەك فەرمانڕەوایەکی نەزۆکی لێ دێت، لێرەوە دەتوانین پیلانێکی شالآوبردن ڕێکبخەین، شۆڕشێك یا کۆدەتایەك هەڵگیرسێنین، هەرچی یاسا و ڕێسایەك هەیـە بنێتـە تەنەکـەی خۆڵـەوە، ئـەوجا ڕێکخسـتنەوەیەکی نـوێ دەست پێبکەین، بەو شێوەیە بەسەر حکومەتەکەوە دەبینە دیکتاتۆر.

پاش ئەوەی دەوڵـەت دەکەوێتـە ژێـر دەسـتمان، لەبـەر ئـەوەی ئێمـەی جوولەکە خاوەن ئاڵتوونی[1] جیهانین، دەستی هاوکاری بۆ ئەو دەوڵەتـە درێـژ دەکەین، ئەو هاوکارییەش (دراو)ە، ئەگـەر دەسـتی هێنـا و وەریگـرت، ئـەوا دەبێتە کۆیلەی ژێر دەسـتمان، ئەگـەریش وەری نـەگرت، ئـەوا ناگەتـە سـەر عەرش و لەناو دەچێت. ئاڵتوون سەرچاوەی یەکەمی گەشـەی دەوڵەتەکانـە، لای ئێمەیە، بۆیە گەر بمانـەوێت دەتـوانین گەشـەی هـەر دەوڵـەتێك بەگەمـە کردن بە بڕی ئەو ئاڵتوونە ڕاگرین.

ئێمەی جوولەکە ئـابووریی جیهانمـان بەدەسـتەوەیە، زانسـتی ئـابووری مەملەکـەتی ئێمەیـە، بەلەشـکرێکی تـەواوی ئابووریناسـان خۆمـان تۆکمـە کردووە، زۆربەشیان ئەمڕۆ لە کۆبوونەوەکەمان ئامـادەن.. ئێـوە بـەهێزترین چـەکی ئێمـەن، جـا ئەگـەر سـەرۆکی بانکـەکان، یـا کۆمپانیاکـان، یـا لەملیاردێرەکان بن، هەر بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە.

---

[1] زێڕ.

ئەگەر ئێمە چنگمان لە یەك لەو دەوڵەتانە گیر کرد، پەیمان بەو چین و توێژە داماوە دەدەین، کە بەشە هەقییان لە پۆستە باڵاکانی حکومەتدا بەوەزارەتەکانیشەوە هەبێت، مەبەستم ئەو توێژە داماوەی مێژوویەکی ڕەشیان هەبووە. ئەگەریش لێمان یاخی بن، بیریان دەخەینەوە دادگایی و زیندانیش هەیە و بەو شێوەیە پارێزگاری لەبەرژەوەندییەکانمان دەکەن. هەندێ جاریش حکومەت بەشێوەی بەرهەڵستکار خۆی دەنوێنێت، وەلێ ئەوەی ڕاستیبێت بەکارەکانیدا دیارە کە لایەنگری بەرژەوەندییەکانمان دەبن.

ئەوەی جێی مەترسییە بۆ ئێمە هاوپەیمانێتیی هێزی فەرمانڕەوایەتی و هێزی سڤیلی خەڵکە. وەلێ ئێمەش بۆ ئەو دۆخە ڕێگاچارەمان هەیە، بەربەستێکی ترسمان لەنێوانیاندا دروست کردووە، تا ئەم بەربەستە هەبێت، ئەو دۆخەی هاوپەیمانێتییە نارسکێت. پێویستە پەیوەندی بە هەموو چین و توێژەکانەوە بکەین، مەرج نییە ڕاستەوخۆ بێت، دەتوانین لەڕێی بەکرێگیراوە دڵسۆزەکانمانەوە بۆ ئەو شوێنەی مەبەستمانە ئاڕاستەیان بکەین. بۆ ئاسانکردنی پیلانەکانمان، پێویستیمان بە بریکاری نێودەوڵەتی هەیە، کە ملیۆنەها چاویان هەن، ئەوان حکومەتەکان ئاڕاستە دەکەن. هەرچی گەلە ئاڕاستە کردنیان لەخۆی ئاسانتر نییە و تەنها بە یەك وشە دەکرێت، ئەویش دوایی بۆتی ڕوون دەکەمەوە. ڕاگەیاندن (ڕۆژنامەگەری). ئەو چەکەی حکومەتە گوێرەکەکان ناتوانن بەباشی بەکاری بهێنن، ئێمەین لەپشت پەردەوە گەمەیان پێدەکەین، بەو شێوازە خەڵکی بەو ئاڕاستەیەدا دەبەین، کە بۆ خۆمان مەبەستمانە.

پێویستە لەهەموو کۆمەڵگاکان دەستەی دامەزرێنەر بە بۆچوونی ئازادی گۆش بکەین، وتاری سیحراوی بۆ خەڵکەکە بچڕین، کە تەنها هەر قسەیەو کرداری لەتەکا نییە، وەلێ بۆ باشکردنی گوزەرانیان باوەڕیان پێیان بێت، لەهەمان کاتدا موچەکانیان بەرز دەکەینەوە، لێل ئەوەش نرخ و بەهای شتەکانیش بەرز دەکەینەوە، وادەکەین خاوەن کارەکان ماندووبن موچە زیاد بکەن، کرێکارەکانیش لەهەق گوزەران نەیەن، بەو شێوەیە هیچ لایەکیان سوودمەند نابن و تەنها لەماندووبوون بەولاوە هیچیان بۆ نامێنێتەوە.

لەمەڕ حکومەتەکانیشەوە بۆ سەرۆکی و بەڕێوەبەرایەتی و وەزارەتەکان ئەوانەی مەیلی کۆیلایەتییان هەیە هەر بە خۆمان هەڵیاندەبژێرین و دایاندەمەزرێنین، لەژێر دەستی ڕاوێژکارەکانمانیش ئەوانەی هەر لەمنداڵییەوە خەریکی سیاسەتن دایاندەنێین.

لەتەك هەڵکشانی سێرپێنت بەرەو ئەورووپا ، بۆ دەستو پێ پەیوەند کردنیان، لەڕووسیاوە دەست پێدەکەین، ئەوجا دۆخەکە لەخەتەرناکی نزیکمان دەکاتەوە، ئیمپڕیاتۆریەتی عوسمانی، سێربنت بۆی دادەبەزێت و ئێمەیش لەتەکیا دەبین، تا وێرانی دەکەین، ئەوجا سێرپێنت گەشتەکەی لەوێ کۆتا پێدێنێت، بەرەو ئۆرشەلیم، ئێمەش لەتەکیا دادەبەزینە ئۆرشەلیم، دەوڵەتەکەمان لەوێ دەبێت و هەر لەوێ پەرتەوازەییمان کۆ دەکەینەوە.

کاتێ لە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆمان جێگیر دەبین، دەبینە هێزێکی نێودەوڵەتیی مەزن، ئەگەر هەر حکومەتێکیش هێرشمان بکاتە سەر دەوڵەتە

قەرزارەکانمان دەبنە هاوکارمان و دێنە دەست. ئەودەم دەتوانین جیهان یەکبخەین بۆ پێشوازی کردن لە پاشا(هاماشیاح) کە بۆ فەرمانڕەوایی هەموو جیهان ئامادەی دەکەین.

## ڕۆژی دووەم

ئەی زایۆنیستە مەزنەکان.. ئەمڕۆ هێزی ئێمە گەیشتووەتە ئاستێك، هەر هاوپەیمانێتییەك لەجیهاندا دروست بێت، دەستی نادیاری ئێمەی تێدایە. هێزمان گەیشتووەتە ڕادەیەك ئێمەین بڕیاری سزادان دەدەین، کێمان بوێت لەسێدارەی دەدەین، کێشمان بوێت لێی خۆش دەبین. لەخۆڕا بەم ئاستەش نەگەیشتووین، خودا ئەو بیرمەندییەی وێداوین، کە بەهیچ گەلێکی تری سەر زەوی نەداوە.

ئەمڕۆ.. ڕۆژی دووەممانە، سبەی دواڕۆژی کۆبوونەوەکەمان دەبێت، کۆبوونەوەیەکی مێژووییە، پێویستە هەرهەمووتان ئەوە چاك بزانن، ئەوەی لەم کۆبوونەوەیەدا هاتووە و باسمان لێوە کردووە، وەك نهێنییەك بیپارێزن. ئەگەرچی گۆییمەکەکان هیچ شرۆڤە و تێبینییەکیان لادروست نابێت، وەلێ وریایی شەرتە. ئەمە جیاوازیی هزرمانە لەتەك گوێرەکەکان، خودا ئەوەمان پیشان دەدات، بۆچی ئێمەی هەڵبژاردووە و لەسەرووی هەموانەوە دایناوین، خودا دەزانێت گەر ئەم بیرمەندییەی لای غەیرە جوولەکە دابنایە ، لێی یاخی دەبوون.

ئەمڕۆ شرۆڤەی سیستەمی کۆماریتان بۆ دەکەم، کە لەگەڵ سیستەمی پاشایەتی ئاڵوگۆڕی پێدەکەین، ئەمەش لەهەموو ئەو دەوڵەتانەی مار سێرپنت بۆی دەکشێت ئەنجام دەدرێت.

پاشا.. سیستەمێکی پاشایەتییە، دەبێت بگۆڕدرێت بە زاراوەیەکی گاڵتەجاڕانە و ناوی دەنێین سەرۆك، بۆ ئەم پۆستەش کەسێك هەڵدەبژێرین ناو زڕا و بووبێت، ڕیسوا بووبێت هەموو سیفەتێکی خەراپی هەبووبێت. کەسێك بێت لەڕووی ئاکارەوە باش نەبێت، لەڕووی سێکسەوە خۆ ڕاگر نەبێت، پیاوێکی تا بڵێی بەرتیلخۆر، بەو شێوەیە ماوەی فەرمانڕەواییەکەی بە ئارەزووی ئێمە دەبێت. شتێکی گاڵتەجاڕانەش هەر وەك خۆی دەخەینە بەردەستی، ناوی لێدەنێین ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل، کۆمەڵە خەڵکێکن میللەت هەڵیان دەبژێرێت، تا ببنە نوێنەری، هەر ئەو ئەنجوومەنەش سەرۆك هەڵدەبژێرێت، وەلێ دەستوورەکە خۆمان بە داڕێژراوی دەیخەینە بەر دەستیان. سەرۆك تەواوی دەسەلاتی دەبێت، لە سیستەمی ئێمەدا هەر سەرۆکە سەرکردایەتیی سوپاش دەکات و مافی سەپاندنی دەسەلاتی دەبێت لەپێناو پاراستنی دەستووری کۆماری تازە. ئەنجوومەن کاری زۆری وێنادەین، چونکە نوێنەری گەل زۆرینەن. بەکورتی ئەوان ئەنجوومەنێکی کارتۆنین.

سەرۆك لەهەچ ئان و ساتێکدا بێت مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی هەیە، تا ئەنجوومەنێکی تازە پێکبهێنێت. سەرۆك مافی گۆڕینی یاسای کاتی هەیە، بەو شێوەیەی خزمەتی وڵات بکات، هەر بەو ئاوایە حکومەتەکان

دەبنە دیکتاتۆر، نوێنەرانی ئەو حکومەتانە لەپەردەپۆشی و ئامرازی جێبەجێکردن بەولاوە هیچی تر نین.

لەبەر ئەوەی ئێمە بۆ بەرژەوەندی خۆمان دووبەرەکی و ئاژاوەگێڕی دەخەینە نێوان حکومەت و میللەتەوە، ئابوورییان لەسەر تەسك دەکەینەوە، بەو شێوەیە میللەت دەکەوێتە ڕاپەڕین، بۆ ئەوەی بارودۆخی وڵات سەقامگیر ببێت، داوای فەرمانڕەوایەکی بیانی دەکەن و وڵات بباتە ڕێوە، ئەوجا کاری ئێمە دەست پێدەکات!

تەنها ئێمەین لەجیهاندا نهێنیی ماسۆنییەتمان لایەو دەیبەینە ڕێوە، ئێدی گۆییمەکەکان[1] کە مێشکی بەرازیان هەیە لەمەبەست و ئامانجی ماسۆنییەت حاڵی نین، پێویستە شانە و ناوەندەکانمان زیاتر بکەین و بەجیهاندا بڵاویان بکەینەوە و فەرمان لەسەرکردایەتییەوە وەربگرن، ئەو شانانەش دەبێت لەژێر چاودێریی پۆلیسی نهێنیی ڕێکخراوەکەدا بن، ئەوان دەتوانن کارەکان پەردەپۆش بکەن و سزای ئەو کەسانەش بدەن کە بۆمان دەبنە سەرئێشە. ئەوانەی دێنە ڕیزی ئەم کارانەوە، دەبێت کەسانێك بن جێی متمانە، حەزیان بەسەرکێشی بێت و مەیلی دەوڵەمەندییان هەبێت، گشت ئەو حەزانەش لای ئێمە بەردەستن، بۆ بەگەڕخستنی پێچکەی ئەو شانانە بەهەچ ئاراستەیەك بمانەوێت بەکاریشیان دەهێنین.

دەربارەی ڕاگەیاندنیش.. بەتوندی وەڵامی هەموو ئەو ڕۆژنامانە بدەینەوە، کە دەیانەوێ بمانزڕێنن، لێ جاروبایش خۆمان دابەزینە سەر خۆمان، کە لەڕاستیدا دادەبەزینە سەر ئەو خاڵانەی دەمانەوێت لەسیاسەتی

---

[1] میللەتانی ناجولەکە.

خۆماندا بییانگۆڕین. بەو جۆرە بلیمەتیمان دەردەکەوێت، هەموو ئەو بەرهەڵستکارییانەی خۆمان بەرامبەر خۆمان دایدەهێنین، بەرهەڵستییەکی ڕووکەشیین و لەبابەتە گرنگەکانەوە دوورن. چۆن دەستبگرین بەسەر هەواڵەکان؟ وەك ئاشکرایە هەواڵەکان لەڕێی ئاژانسەکانەوە بەسەر ڕۆژنامەکان دابەش دەکرێت، کاتێ دەگەینە دەسەلآت، گشت ئەو ئاژانسانە کۆنترۆڵ دەکەین و دەبنە موڵکی خۆمان، ئەوەی خۆشمان مەبەستمان نەبێت بلآو ناکرێتەوە !

دەبێت ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەکان بەهەر سێ جۆرەکەیەوە بکڕین، ڕۆژنامە حکومییەکان، کە دەبێت بەرژەوەندییەکانمان بپارێزن، ئەو ڕۆژنامە نیمچە فەرمییانەش کە دەردەچن، هەرچی جۆری سێیەمە، ڕۆژنامە بەرهەڵستکارەکانە و وەك تووڕەییەك لە ئێمە دەردەکەون، واش دەکەین سەرنجی هەموو بەرهەڵستکارەکانمان ڕابکێشێت، تا خۆیانی تیا خاڵی بکەنەوە، وایان لێدەکەین بەخۆیان کاغەزەکانی خۆیانمان بۆ ئاشکرا بکەن.

هەرچی سەرنووسەری ڕۆژنامەکانە، پێویستە لەو کەسانە هەڵبژێردرێن کە ناویان زڕاوە، ئەمەش وادەکات لەقسەمان دەرنەچن، هەر کاتێکیش ویستیان لێمان هەڵگەڕێنەوە، ڕیسوایان دەکەین.

ڕۆژنامەکانمان پێویستە باس لەهەموو توێژەکان بکەن، خۆمان بکەین بە پشت و پەنایان، یەو شێوەیە وەك خوداوەندی هیندییەکانمان لێدێت (فیشنۆی) خوداوەند، سەدان دەستمان دەبێت، هەر دەستێکیش وەك سیخوڕیان لێدەکەین، کە تایەفەکان بەنیازی چین.

لەبارەی بڵاوکراوەشەوە، پێویستە دەستەیەک هەبێت لە وڵاتەکاندا بۆرپێپێدان و ڕێپێنەدانی، هەرچییەک بڵاودەبێتەوە لە کتێب و فیلم و هەر بابەتێکی تر، دەبێت لەژێر دەستی ئێمەدا بن، تا بتوانین کۆنترۆڵیان بکەین. ئەدەب و ڕۆشنبیریی باشترین چەکی پێشکەوتنە، تا ئەو دووەش لەژێر فەرمانی ئێمەدا بن، دڵنیا بن بەکەس بارمان لار نابێتەوە.

تا خەڵکی لە وتو وێژی گرنگ دوور بخەینەوە، ئەوا کێشەی تازەیان بۆ دروست دەکەین، وەک کێشەی ئابووری یان سیاسی لەوڵاتەکەیان دەبێت مێشکیشیان سەرقاڵ بکەین، نەئاڵکێنە بابەتگەلێک کە نابێت بیریان لێبکەنەوە، ئەوکاتانەی دەستیشیان بەتاڵە سەرقاڵیان دەکەین بە بابەتگەلێک وەک پێشبڕکێی وەرزشی یا هونەری بەهەموو جۆرەکانیەوە. جەماوەری ئاژاوەگێڕ وەک منداڵ وایە، کاتێ ورک بەشتێکەوە دەگرێت، پێی دەڵێیت بڕوانە ئەو پاسارییە[1]، یەکسەر ئەوەی ورکی پێوە گرتبووە بیری دەچێتەوە.

بۆ ئەو هەموو کێشە و گرفتە سیاسیەی لەوڵاتەکەیاندا ئێمە دەستمان تێیدا هەن، وابکەین کەسیان گومانمان لێ نەکەن. چەندین سەدەیە بەو شێوەیە بردوومانەتە سەر، تەنانەت ئەگەر پێشیان گوترا ئەو کێشەیە ئێمە ناومانەتەوە، گاڵتەیان پێدێت، پێیان وا نییە ئەو هەموو کێشانەی جیهان لەگەڵێکی پەرتەوازی وەک ئێمەوە بێت. نازانن ئەوەی ئاڵتوون[2] و پارەی بەردەست بێت، هەموو شتێکی بۆ دەکرێت.

---

[1] چۆلەکە.

[2] زێڕ.

چاکەی مار سێرپنتی ئەهریمەنمان لەبیر نەچێت، کە هەموو بیرو باوەڕی بنیادەمی وێران کرد و کردنی بەلادەر. خەڵکی تەلموودیان سازاند، دواتر عیساشیان کرد بە کوڕی خودا، ئەگەرچی لەهەق ئاینی ئیسلام نەهاتین، وەلێ توانیمان لقێکی لێ جیابکەینەوە، کە ئەویش شیعەیە و تا ئەمڕۆش ئاین و محەممەد بەڕەوا نازانن.

ئەوەی ویستمان پێی گەیشتین، توانیمان سیخوڕ لە هەموو وڵاتەکان دروست بکەین، تێکەڵی کۆمەڵگاکانیان بکەین. ڕاپۆرتی تەواو و وردەکاریمان لەلایەن سیخوڕەکانەوە پێدەگەیشت، ڕاپۆرتەکان هەمەچەشنە بوون، چ لەڕووری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی هەمەچەشنە بوون و تەنانەت ڕاپۆرتی سەرشەقامەکانیشمان پێدەگەیشتن.

لەکۆتایی ئەمڕۆدا دەڵێم.. میللەتی گۆییم و گەمژە شێوازی مامەڵەکردن لەتەك شۆڕشدا نازانن، شۆڕش لە حەپە حەپی سەیەل[1] بەرامبەر بە فیل هیچی تر نییە، تەنها وەڕینە بە فیل، تا فیلەکەش لمۆزیان بۆ دەردەخات و هاوارێکیان بەسەرا دەکات، ئێدی سەیەلەکە وا هەڵدێن بۆ خۆشیان نازانن کێوە دەچن!

---

[1] سەگ.

## ڕۆژی سێیەم

ئەمڕۆ درێژەی پێ نادەم، تەنها بیرتان دەخەمەوە، هیواداریشم هەر هەمووتان پێداچوونەوەتان بۆ کتێبەکە کردبێت، تا لەبیرتان نەچێت. فەرمانڕەوایانی گۆییم بەوەیان نەزانیووە، کە پەنایان بۆ بانکەکانی ئێمە بردووە، سەدە دوای سەدە قەرزاری ئێمەن و بۆیان نادرێتەوە. ئێمە کاری زۆرمان کرد، تا بەم ئاستە گەیشتین، توانیمان بیانکەین بە کۆیلەی خۆمان، لەگێژاونانیان سەرکەوتوو بووین. گشت ئەمانەش ڕێنمایی پاشای مەزنمانە، کە دواتر بەسەر عەرشی داوودەوە فەرمانڕەوایی هەموو جیهان دەکات.

بەڵێ ئێمە خاوەن زێڕین، لەهەر ئان و ساتێکدا بێت دەتوانین لە گەنجینەی نهێنییماندا لەو ئاڵتوونەی چەندین سەدەیە کۆمانکردۆتەوە چەندمان بوێت ڕایدەکێشین. لەکۆتاییدا ئەم بەڵگەنامانەتان بەسەردا دابەش دەکەم. ڕێگایەکی زۆرمان بڕی، ئەوەی ماوە درێژتر و سەختترە، پێویستە زۆر زۆر وریا بین.

بەڵگەنامەکە لە لایەن نوێنەرانی زایۆنیزمی ماسۆنییەتەوە تەنها ئەوانەی لە پلەی سی و سێدا بوون واژۆ کرا.

***********

تەواو

ئەم وانەیە چۆن بڵاوبووەوە؟ ئەمەش بۆ خۆی بەسەرهاتێکە.

یەك لەوانەی لەناو کۆبوونەوەکەدا بوو، پیاوێکی مەی خۆربوو، لەگەڕانەوەیدا لای ئافرەتێکی سۆزانی لای دابوو، هەڵوەدای ڕابواردن بوو، ئافرەتەکە وایزانی جانتاکەی پڕە لەپارە، چونکە لە هەرە دەوڵەمەندەکان بوو. دوای ئەوەی جانتاکەی ڕفاند، بۆی دەرکەوت هەر هەمووی کاغەز بوو. وەلێ بەزمانی عیبری نووسرابوون، هیچیان لێ حاڵی نەبوو، کاغەزەکان کە کۆنووسی وانەکە بوون، ڕادەستی هەوادارێکی تری خۆی کرد، کە پیاوێکی ڕووسی بوو، ئەو پیاوە ناوی( نیکۆلا نیڤیتش)بوو، یەکێکبوو لەگەورەو پیاوماقووڵانی ڕووسیای قەیسەری. هەستی کرد کاغەزێلێکی ئاسایی نیین و کۆمەڵێك وازۆیان لەسەر کردوون. دەیانداتە دەست وەرگێڕێك تا وەریانگێڕێتە سەر زمانی ڕووسی، ئەو وەرگێڕەش هاوڕێی بوو، ناوی (نیلۆس)بوو. کاتێ وەریگێڕانە سەر زمانی ڕووسی و دەستی بەخوێندنەوەیان کرد، بە ناوڕۆکی نووسراوەکان ڕاچڵەکی.

نیکۆلا ڕوخساری تێکچوو، بڕیاریدا کارێك بکات، ناوی جوولەکە بزڕێنێت. لەناو بەڵگەنامەکاندا هاتبوو.. جوولەکە بەنیازن، هەر وەك ئەوەی لە فڕەنسا و ئینگلتەرا گێڕایان شۆڕشێك لەڕووسیا هەڵگیرسێنن. ڕووسیا لەسەردەمی قەیسەری دا بوو، جوولەکەکان بەدەستیانەوە زۆریان ناڵاندبوو. نیلۆس کتێبێکی بەو بەڵگەنامانە بڵاوکردەوە، کتێبەکەی ناونابوو (پڕۆتۆکۆلەکانی بیرمەندانی زایۆن).

جوولەکە بەو کتێبە شێت و هار بوون، بەو ئاوایەی ئەو کتێبە درۆ و دەلەسەیە و بۆیان هەڵبەستراوە. ئەوەی ئەو کتێبەیان خوێندبووەوە

باوەڕیان پێی نەبوو، مەحاڵبوو گشت ئەو ڕێکەوتە بۆ خزمەتکردنی تەنها جوولەکە یەکبگرێت. دوای ئەوەی نیلۆس بە شێوەیەکی نادیار کوژرا، جیهان ڕقیان لەجوولەکە هەستا.

ئەوجا کوشتارگەی جوولەکە لەڕووسیا دەستی پێکرد، ڕووسیا لەیەکەم هەڵمەتیدا دەهەزار جوولەکەی کوشت. ئێدی جوولەکە کەوتە هەوڵی وەستاندنی ئەو کوشتن و بڕینە، لە بریتانیا بۆ تۆڵە سەندنەوە کەوتنە گیان جوولەکەکان. لەپڕ هەر وەك چۆن لە پرۆتۆکۆلەکەدا هاتبوو، شۆڕشی ڕووسیا سەریهەڵدا کۆدەتای شیوعی دەستی پێکرد، ڕووسیا کەوتە دەستی(بەلشەفییەکان) کە زۆربەیان جوو بوون. خەڵکی دەیانویست لە قەیسەر ڕزگاریان بێت، کەوتنە دۆزەخی شوعییەتەوە، جووەکان ژاری خۆیان بەدەوروبەری ڕووسیادا کرد. شوعییەت بە کورتییەکەی کفر کردنە بەهەموو ئایینەکان، ئەوجا پرۆتۆکۆلەکان بەجیهاندا بلاوکرایەوە، دوای ئەوەی وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی، جوولەکە توانیان بەهۆی هێز و دەسەلاتەوە ئەو بلاوکراوەیە ڕاوەستێنن، دواتر وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئەڵمانی، دیسانەوە جوولەکەکان توانیان بەوای هێز و دەسەلاتیانەوە لە ئەڵمانیاش ڕایگرن.

ئەوجا لە ئەمریکا و ئیتاڵیا بلاوبووەوە، دیسان بەهەمان شێوە ڕاگیرا. پڕوپاگەندەیەك بلاو بووەوە، تێیدا هاتبوو.. هەرکەسێك ئەم پرۆتۆکۆلەیە وەربگێڕێت، یا بلاوی بکاتەوە لەناوی دەبەین، لەکۆتاییشدا گەیشتە میسر، ڕێك گەیشتە دەستی( ئەنیس مەنسوور) وەلێ ترسا وەریبگێڕێتە سەر زمانی

عەرەبی، ( عەباس مەحموود ئەلعەقاد) نووسەرێکی بوێر بوو، وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

ئەوجا ئەکتەری میسری ( محەمەد سوبحی) لەڕێی درامایەکەوە کە خۆی نووسیبووی بەناوی( سوارێکی بێ ئەسپ)ی نمایش کرد، ئیسرائیل بەو درامایە زۆر ناڕەحەتبوو. ئەوەی زۆر سەیربوو، لەپشتی کتێبەکەوە وێنەی مارێکی لەخۆ گرتبوو، کەللەی مارەکە فەرمانڕەوایانی زایۆن بوو، بەگاڵتەجارییەوە پێدەکەنی، جەستەی مارەکەش میللەتبوو. مارەکە بەرەو ئەورووپا دەکشا تا بیانڕوخێنێت و ئاگریان تێبەربدات، شۆڕش بەخەبەر بێننەوە. وەلێ نەیانزانی ئەوان وێنەی کاریکاتێریی مار سێرپنتی ئەهریمەنیان کێشاوە.

بەهەرحاڵ ئەمە تەنها کۆبوونەوەی بیرمەندانی زایۆن نەبوو، بەڵکو سەدان کۆبوونەوەی تری بەدوادا هات، تا بەسەری بکەنەوە و دەستکاریی تێدا بکەن، هەر ئەو کتێبەش نەبوو، کە نووسەرەکەی بەشێوازێکی گوماناوی کوژرا، بەڵکو کتێبی تری بەدوادا هات، وەك کتێبی(بەردەکانی سەر تەختەی شەترەنج)ی ویلیام جای کار، کتێبی (دەستی ون)ی میری ئۆسکۆتلەندی (شێریب سبیریدوفیتش)، ئەم کتێبەکەی منیش کە لەبەر دەستتدایە، نووسەرەکەی پاش چەند ساتێکی تر دەمرێت.

بیرمەندانی زایۆنیزم باسیان لە ڕاگەیاندن و هێزی ڕاگەیاندن کردووە، گەورەترین بێهۆشکەر لە مێژوودا بریتییە لەسندوقێکی بچکۆلە لە سووچێکی ژوورەکەدا، کە شتگەلێکمان پێدەڵێتەوە بەو ئاوایەی باوەڕمان پێیان بێت کە ڕاستین. دەمەوێت شتێك لە ڕاگەیاندن بەگوێتانا هاوار بکەم،

هەرچییەکتان بەرگوێ کەوت لەڕاگەیاندن یا لەسیاسییەکان ئەوە خاڵی جیاوازیمانە.. ئەو شتانەی پارچە پارچەمان دەکەن، ئەو شتانەی لێکمان جودا دەکەنەوە، ئەوان ئەوەیان لێمان دەوێت لەیەك دابڕێین و تەرکیزی لەسەر دەکەن، ئایینە، ڕەگەزە، نەتەوەیە، پەروەردەیە، سامان و دارایی، ئاستی کۆمەڵایەتی، ئاڕاستەی بەدکاری، پلە و پایە، هەر شتێك بتوانن تابەرەنگاری یەکتر بین.

تۆش دەتوانیت وەك ئەو هەرچی و پەرچییانە بیت، کاتێك فەیسبووکەکەت دەکەیتەوە، هەر لەواڵەکەی خۆت هەواڵێك لەسەر تایەفەیەك کە تۆش حەزت پێیان نییە، هێرشیان کراوەتە سەر، تۆش یەکسەر دووگمەی بەشداری کردنت چالاك دەکەیت و هەواڵەکە بلاّو دەکەیتەوە، بێ ئەوەی لێیان دڵنیا بیت، هاوڕێ ئەودەم وەك ئەوانت لێ دێت، وەك ئەوان هیچ و پووچ دەبیت، چونکە ئەوەی دەیکەیت ڕووخێنەرە نەك بنیاتنەر، خوێنڕشتنە نەك وەستاندنی خوێن ڕشتن، ئەوەی دەیکەیت دژایەتیکردنە و دابڕانتە لەهەموو شتێك.

ئەگەر من سەرۆکی وڵاتێکی عەرەبی بام، دەمزانی چیم دەکرد؟ وەك (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)م دەکرد.. کاتێ ئاژاوە کەوتە ناو سەحابەکان، هەموویانی یەکخستەوە، تەنانەت ئەوانەش کە گومانیان لێدەکرا دەستیان لەو ئاژاوەیەدا هەبووبێت. نموونەیەکت لەسەر میسر بۆ دێنمەوە، کە بەچاوی خۆم بینیومە.

میسرییەکان بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان سەر بەلایەنی سەربازی بوون، بەشەکەی تریان سەر بە ئیخوان بوون. هەر یەك لەو دوو بەشە

بەرامبەرەکـەی بەخیانـەتکار لەقەڵـەم دەدا. ئیخوانـەکان بـە بۆچـوونی عەسکەرتارییەکان تیرۆریست بـوون، دەیانویسـت میسر بفرۆشـن، هەرچی عەسکەرتارییەکانیشـە بەبۆچـوونی ئیخوانـەکان خیانـەتکارن و پاڵپشـتی دیکتـاتۆرن، دز و جـەردە و زۆردارن. لـەپڕێك بەسـەر یـەکا کـەوتن، لەفەیسـبووك ئـەوەی نەشـێت بەیـەکیان کـرد. هـەردوو لا ئـەوەیان لەبیرچووبووەوە کە میسرین، هەرهەمووشیان هەمان خوێنیان هەیە و هەمان خەمیان هەیەو هەمان کولتووریان هەیە.

ئەگـەر مـن سـەرۆکی وڵاتەکـەت بم کـە میسـرە دەزانم دابەشـبوونی میللەتەکـەم لـە بەرژەوەنـدی کێدایـە. ڕەنگـە بەسـەرهاتی کۆبوونـەوەی سەرکردایەتیی زایۆن بزانیت، وەك چۆن منیش دەیـزانم، دەزانم ئەوانە کێن کـە کـەلێن دەخەنـە نێوانمانـەوە و ئـاگری ئاژاوەکـە خـۆش دەکـەن. وەك سەرۆکی وڵات هەنگاوی یەکـەمم یەکخستنەوەی دابەشبوونەکەیە. ئـەوەش باش دەزانم بوونی خیانەتکار و سیخوڕی ئەگەر هەبووبێت لـەو دابەشـبوونە، ئەوا نوێنەری هیچ لایەکیان نین، خۆ ئەگەر لە هەواڵگریی میسریدا سـیخوڕێك بگرن کار بۆ ئیسرائیل دەکات، ئـەوە مانـای ئـەوە نییـە هـەموو هـەواڵگری میسر سیخوڕ بن، خۆ ئەگەر سیخوڕێکیش لەناو ئیخواندا هەبێت، مانای ئەوە نییە هەموو ئیخوان تیرۆریستن. تەنها سیخوڕەکە تاوانبارە.

ئەگەر لەو دووبەشەی سەرەوە باسمان کرد، کۆمەڵێك سیخوڕ هـەبوون، وەك خۆیـان دەیانهێڵـمـەوە، کـارێکی وا ناکـەم هـەردوو بەشـەکە زۆرتـرین زەرەرمەند بن، تا کـاتی دێت وازیـان لێـدەهێنم، ئەوسا تۆیـان دەبڕمـەوە. خودا بـە (محەمـەد)ی پێغەمبـەر ڕاگەیانـد ئەوانـەی دەیانیناسـی لەمەڕ دوو

ڕووەکان[1] چی لێیان کرد؟ کەوتە وێزەیان، دوویان کەوت، دووریانی خستەوە؟ نەخێر. نەیدەویست لەوە زیاتر ئاژاوە بکەوێتە نێو خەڵکییەوە. کاتێ (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بە بکوژانی (عوسمان کوڕی عەففان)ی زانی، کە لە گەورە پیاوانی خێڵەکانی عیراق بوون، چی لێیانکرد؟ ڕۆیشت و شەڕی لەتەکیانا کرد؟ نەخێر. بەڵکو چاوەڕێی کرد، چونکە ئەگەر بڕۆیشتایە و شەڕی لەتەکیاندا بکردایە، ئەوا دۆخەکە ئاڵۆزتر دەبوو، خێڵەکانیش ئەوەیان قبووڵ نەدەبوو، کە گەورە سەرکردەی سەربازیی موسوڵمانەکانیش لەوان هەبوون. منیش هەروام دەکرد. ئەگەر من سەرۆکی وڵاتەکەت بوومایە دووزمانەکانم وەك خۆیان دەهێشتەوە تا کاتی خۆی دەهات، چونکە بەلێدانیان میللەت زیاتر دەورووژان و کارەساتەکە گەورەتر دەبوو، ئەوەش دەبووە شکستی خۆم و سەرکەوتنی دوژمنەکەم.

ئەو کارتانەی ماون زۆر کەمن، ئەمجارە تەنها یەك کارتمان بەدەستەوەیە، ئەویش کارتی ئەجندەی لیبڕاڵییە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە، پێدەچێت جوولەکە بێت، کاغەزێکی درێژی بە دەستەوەیە، زۆر بەکەیفەوە دەیخوێنێتەوە.

سەرەتا پێمگوتی حەوت ئەهریمەن سۆسەمان[2] دەکەن، نووکەش ناوی ئەو ئەهریمەنانەت پێدەڵێم کە سەربردەکانیان بۆ گێڕاویتەتەوە. تا ئێستا لۆسیڤەری ئەهریمەن، لە گەورەترین ئەهریمەنەکانە، خۆتیش باش دەیناسیتەوە سەربردەی خۆی لەتەك نەمرووددا بوو، دووەمیش سێرپێنتی

---

[1] مونافیقەکان.

[2] چاودێری.

مـاره، کـاری لادان و ئاژاوەنانـەوە بـوو، سـێیەمیش بافۆمیتـە خواوەنـدی سوارچاکانی هەیکەل، ئەهریمەنی جادووگەر و کتێبی زانستە شەیتانییەکانە، چوارەمیشـیان ئەهریمـەنی بنیادەمـەکان (دراکـۆلا) کـە بـە ڕۆحـی پـڕ لـە ئازارەوە چاودێریمان دەکەن.

سـێ ئەهریمـەن مـاون تـۆ جـارێ نایانناسـیت، سـێ نهێنییـان پێیـە، سـەربردەی ئـەمجارەمان یـەکێکیان دەیگێڕێتـەوە، کـە ئەهریمـەنێکی نەفرەتلێکراوە، ئەهریمەنی پێنجەم.

****************

# بەشی دەیەم

...............

لەپڕ ئاسمان لاشەی مردووی باراند. ئاکنجییەکانی[1] شاری (کافا)ی ئۆکرانیای کۆن ئەو ڕۆژە بە سەرسوڕمانەوە لەئاسمانی شارەکەیان دەڕوانی، ترسێکی زۆریان لێنیشتبوو و ڕایان دەکرد، ئاسمان لاشەی بەسەریاندا دەباراند. نووکە دیمەنەکەت لەبەر چاوە، وەلێ ئەوەش بێنە بەرچاوت، لەنێو ئەو لاشانەدا بوونەوەرێك بە حەواوە وێستاوە، بەتەواوی نازانیت چییە، عەبایەکی ڕەشە و (با)کە چمکەکانی دێنێ و دەبات، هەروەك ئەوەی لە ئەفسانەکاندا بیستووتە، کەللەی سەری لەتاریکیدا ونە، چونکە عەباکە دایپۆشیوە، وەلێ ڕووی دیارە و چون دەمامکێك دەرکەوتووە، لە ڕوخسارێکی گاڵتەجار دەچێت. ئەو بوونەوەرەی بە ئاسمانەوە ئاوێزانببوو، لەپشتییەوە لاشەیەکی زۆر بلەز[2] بەسەر شووراکانی شار و ناو شاردا دەکەوتنە خوارەوە، خەڵکی شارەکە لەهیچ حاڵی نەببوون.

تا لەم دیمەنە تێبگەیت، پێویستە سەرەتا ئەوە بزانیت، کە شاری(کافا) هەموو دەروازەکانی لەسەر خۆی داخستبوو، مەغۆلەکان لەدەرەوەی

---

[1] دانیشتوان.

[2] خێرا.

شـووراکەوە دەوری شـارەکەیان دابـوو. ئـەو ڕۆژانـە تـاعوونیی ڕەش[1] لـە ئاسیادا بڵاوببووەوە، سـەربازەکانی دەوری شـووراکان تووشـی ئـەو تاعونـە ببـوون، بـەو شـێوەیە مەغۆلـەکان بـەوای تووڕەییانـەوە، یەکـەم جـەنگی بایـەلۆژییان لەمێـژوودا دەسـت پێکـرد. لاشـەی سـەربازە بـەتاعوون تووشـبووەکانیان بـە مەنجـەنیق هەڵدەدایـە سـەرووی شـووراکان و بەسـەر خەڵکەکەدا دەبارین، سـەرەتا لـەهیچ شتێك حـاڵی نـەبوون، دواتـر زانییـان ئەوان سەربازە مردووەکانی خۆیـان کـە تـاعون کوشـتبوونی، بـە مەنجـەنیق هەواڵەی سەر شارەکەیان دەکردن.

ئەو بوونەوەرە ڕەشەی بە ئاسمانەوە دەفڕی. جارێکی تر بینیت ئـەوە (ماستیم)ی ئەهریمەن بوو، وەلێ لەئاسمانێکی تر، لەئاسمانی ئەوڕوپا و ڕێك لەشاری (بیزانسۆن)ی فڕەنسی بوو، ئەمجارەیان ماسـتیم خـەمبار دیاربوو، بەئاسمانەوە کە دەفڕی زۆر خەمبار دیاربوو، بـەوای ئـەو دیمەنـەوە خـەمبار بـوو، کـە چـاوی پێکـەوت. خـەڵکێکی زۆری پێپـەتی ، جلوبەرگـەکانیان لـە گونییە درووست کرابوو، سەرو قامچییان بەدەستەوە بوو، لەسـەر شـەقام و لـەناو ماڵـەکان کەوتبوونـە وێـزەی جوولەکـەکان و ئـەوەی دەکەوتنـە بـەر دەستییان بەرقامچییان دەدا، تا خوێن بەبالآیاندا دەهاتە خوارەوە.

قامچـی بەدەسـتەکان مەسـیحیی کاسـۆلیکی ئـەوڕوپایی بـوون. بۆچـی بەقامچـی لەجوولەکـەکانیان دەدا؟ کـاتێ مەغۆلـەکان لاشـەی سـەربازە مردووەکـانی بـەتاعوون تووشـبوویان بەسـەریاندا بارانـد، خـەڵکی لەشـاری (کافـا) هـەڵهاتن و ڕوویـان لەهـەموو شـارەکانی ئـەوڕوپا کـرد، بـەو جـۆرە

---

[1] کولێرا.

نەخۆشی تاعوونیان لەتەك خۆیاندا و لەو شارانەدا بلاوكردەوە، دوای یەك ساڵ داتای ئەوانەی بەتاعوون مردبوون، گەیشتە دەملیۆن كەس، هێشتا ساڵی دووەم تەواو نەببوو، داتاكە گەیشتە بیست و پێنج ملیۆن كەس و سێ یەكی دانیشتوانی ئەورووپا بەتاعوون مردن. ئێدی ئەوەی تێكەڵیان بوو، ئەوەی هەڵیشی دەگرتن و لەگۆڕی دەنان، مردن، بەڕاستی ڕۆژگارێكی زۆر بەسام بوو.

خەڵكی باوەڕیان نە بەخوا و نە بە حەكیم و تەنانەت بە كڵێسەكانیش نەما. ئێدی پڕوپاگەندەیەك بلاوبووەوە، كەس خۆی بۆ نەدەگیرا، پڕوپاگەندەكە دەیگوت.. جوولەكەكان هۆكاری ئەو تاعوونە بوون، ئەوان ڕووبار و كانیاوەكانیان ژاراوی كردەوە، چونكە ڕقیان لەمەسیحییە كاتۆلیكەكانە، كە ئەو سەردەمە دەیانیان چەوساندەوە، ئێدی خەڵكی كەوتنە گیان جوولەكەكان، ئەوانەی دەستپێشخەرییان لەو هەڵمەتەدا كرد، قامچی بەدەستەكان بوون. ئەو قامچی بەدەستانەش خەڵكانێك بوون بەر لەو ڕووداوە بە كۆڵانەكاندا گرووپ گرووپ دەڕۆیشتن و بەقامچی لەخۆیان دەدا، تا خوێن بەبالایاندا دەهاتە خوارەوە، بۆ ئەوەی خواوەند بەزەیی پێیانا بێتەوە و ئەو دەردەیان لەسەر لابات، كە سێ یەكی دانیشتوانی ئەورووپای لەناو برد، ئەو خەڵكە لە لێدانی خۆیان كەوتن و لەبری خۆیان لەجوولەكەكانیان دەدا.

ماستیم.. بەڕوخساریدا دیارە خەمبارە، خەمبارە لەو دۆخەی جوولەكە تێیكەوتوون، ئەو بیری دێتەوە چۆن جوولەكەكانیان لە گۆڕەپانی شاری (نۆریش)ی ئینگلیزی كۆكردەوە و هەر بە زیندوویێتی سووتاندیانن، ئەوەش

## ئەنتیخریستۆس

لەبەر ئەوەی مەسیحییەکان بەوە تاوانباریان دەکرد، کە (ویلیام)ی منداڵکارەی مەسیحییان کرد بەقوربانی و خوێنەکەیان لەکەشی جەژنی خۆیاندا بەخواوەندەکەیان بەخشی. ئەو تاوانە بەردەوام لە ئەوروپا دووبارە دەبووەوە و جوولەکەکانیان لە گۆڕەپانەکان کۆ دەکردەوە و دەیانکوشتن.

مەستیم هێشتا ئەو خەمەی یەکەم هەڵمەتی خاچپەرستانی بیرنەچووبووەوە، کاتێ مەسیحییەکان دوای بیرکردنەوە بەخۆیان گوت، ئێمە بۆ کوشتنی دوژمنانی خاچپەرستان بەزەویدا بڵاودەبینەوە، باشتر وایە ئەوانەی دوژمنی خاچن و لەنێوماندا دەژێن بیانکوژین، جوولەکەکان بکوژی مەسیح و شوێنکەوتووانین. لەیەکرا و لەشاری (مینز)ی ئەڵمانی هێرشیان کردە سەریان و هەزارانیان لێکوشتن. تا بۆ ئەوەی دڵیان تەسکینی بێنێت تا توانییان لێیان کوشتن.

ماستیم ڕوخساری هەر خەمبار بوو، کەبینی لە ئەڵمانیا دواتر لە ئینگلتەرا و فرەنسا و ئیتاڵیا و سویسرا و هۆڵەندا شاربەدەر دەکران، جوولەکە شوێنێکیان نەبوو ژیان و گوزەرانی تیا بەسەر بەرن، تەنها ئەندەلووس نەبێت، کە موسوڵمانەکان پێشوازییان لێکردن و ڕێزیان بۆ دانان و ڕێ و جێیان بۆ دابینکردن، تەنانەت ئازادیشیان کردن، کە مەراسیمی ئایینی خۆیانی تیا بگێڕن، ئەمە دوای ئەوەی لەژوورە کلۆمدراوەکانی خۆیاندا بەدزییەوە کەشە ئایینییەکانیان دەگێڕا. ماستیم بە دڵخۆشییەوە بەسەر ئاسمانی ئەندەلووسەوە دەفڕی، ئەمجارە ڕووی خەمبار نەبوو، بەڵکو فرە ڕووی کرابووەوە.

لەپڕ خاچپەرستەکان هێرشیان بۆ ئەندەلووس هێنا و داگیریان کرد، ماستیم بە ڕوخسارێلیکی ترساوەوە فڕی، ترسی ئەوەی لێنیشتبوو جوولەکە بفەوتێن، دیاربوو ترسەکەی لەجێی خۆی بوو، خاچپەرستان جەختیان لەسەر دانیشتوانی ئەندەلووس کرد، چ موسوڵمانەکان و چ جوولەکەکان ببنە شوێنکەوتووانیان یان وڵات جێبهێڵن، ئەوانەیش کە بوون بە شوێنکەوتوویان، خاچپەرستان بەوەش لێیان نەگەڕان، حکومەتی ئیسپانیا بەناوی دادگای (پشکنین) بۆ دانان، هەرکەسێك وای دەرخستبێت بەڕووکەش شوێنکەوتوویانە، وەلێ بەدیوێکی تر لەسەر موسوڵمانێتی و جوولەکەیی خۆی هەر ماوە، لەسێدارە بدرێت، ئەوانەشی کە شوێنکەوتوویان ڕەتکردووەتەوە، شاربەدەر بکرێن. هەرچی جوولەکەبوو هیچ شوێنێکیان شك نەدەبرد.

دوای هەڵهاتنیان لە ئەندەلووس تەنها شوێنێك ما بێت ڕێیان بدەن نیشتەجێبن، خاکی دەوڵەتی عوسمانی بوو، جارێکی تر موسوڵمانەکان پێشوازییان لێکردن، خودی سوڵتان (سولێمانی قانوونی) باڵی بۆ کردنەوە، وەلێ مەرجێکیشی بۆ دانان، هەرکوێیەکیان پێباشە لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی با تیا نیشتەجێبن، تەنها یەك شوێنێك قەدەغەیە بیری لێ بکەنەوە ئەویش فەلەستینە.

ماستیمی ئەهریمەن بۆ دەمێك لە ئاسمان وێستا، ئەوجا ڕووی خۆی وەرچەرخاند کە بەلایەوە زۆر گرنگبوو، تەماشای ئەهریمەنێکی تری دەکرد، کە سنووری دەوڵەتی عوسمانی بەزاند و ڕێك بەرەو ئەستەنبووڵ پایتەختی فەرمانڕەوایی ئیسلام کەوتە ڕێ. ئەو ئەهریمەنە مار سێرپنت بوو، پێدەچوو

بۆ ڕوخاندنیان و سەردەمی وڵاتانی عەرەبی هاتبێتە ئاراوە. سێرپنت بەرەو کۆشکی (تۆپ قاپی) سوڵتان (سولێمانی قانوونی) بەڕێکەوت، خۆی بە کۆشکا کرد. ماستیم بێ سێ و دوو بۆ ناو کۆشک دووی کەوت.

دیمەنێکی سەیر ڕووبەڕووی ماستیم بووەوە.. شاژن(ماه دۆڕان) لەگەڵ (ڕۆکسلانە) ی کەنیزە شەڕە دەستییان بوو. ڕۆکسلانە تا بڵێی جوان و شۆخ و شەنگ بوو، جوانییەك وێنەی نەبوو، کورد وتەنی برای خۆی عاشقی دەبوو, پێدەچوو ڕۆکسلانە ئەو شەڕە بدۆڕێنێت، شاژن دەموچاوی ڕۆکسلانەی ڕوشاندبوو، دایکی فەرمانڕەوا هاتە ئاراوە، شەڕەکەی ڕاگرت، لەپڕ فەرمانڕەوا سولێمانی قانوونیش خۆی بەژوورا کرد، ڕۆکسلانە هەر زوو خۆی هاویشتە باوەش فەرمانڕەوا و ڕوخسارە ڕوشاوەکەی بە فەرمانڕەوا پیشاندا. پاشا سولێمانی قانوونی بە تێڕوانینێکی تووڕەوە لە (ماه دۆڕان)ی ڕووانی، دەستبەجێ فەرمانێکی دەرکرد، فەرمانێکی سەختبوو، (ماه دۆڕان)ی بۆ کۆشکی (مانیسا) نەفی کرد. ماستیمی ئەهریمەن لە ڕۆکسلانەی ڕووانی، کە بەداماوییەوە دەستی فەرمانڕەوای گرتبوو، چاوەکانیشی بزەیان دەهات، بزەیەکی گاڵتجاڕانە، کەس درکی پێنەدەکرد، تەنها ماستیم نەبێت، ئەو بزەیەش شرۆڤەیەکی زۆری لەخۆ گرتبوو.

ماستیمی ئەهریمەن نیگای بڕییە مار سێرپنت، کە دەمی واقوڕماوییەوە واڵا کردبووەوە. ماستیم هەموو شتێك حاڵی ببوو. ڕۆکسلانە جادووگەرێکی جوو بوو لەدوورگەی (قرم) وەك کەنیزە لەلایەن تەتارەوە دەستگیر کرابوو، دواتر وەك دیاری پێشکەشی سوڵتانیان کرد. لەتێڕوانینێکی تری مار سێرپنت، ماستیم تێگەیشتبوو وەك کەنیزە بۆ کۆشك برابوو، گشت ئەو

فیلمە ڕێکەوت نەبوو، بەڵکو بەکارێکی زۆر گرنگ نێردرابوو، تا بەو جادووگەرییەی خۆی گەورەترین سوڵتانی عوسمانی سیحراوی بکات. ماستیم لەخەلیفەی ڕووانی.. ئەمە ئەو سوڵتانە عوسمانییەیە کە دەوڵەتی عوسمانی لەسەر دەستی گەورە بوو. سوڵتان سولێمانی قانوونی هیچ شتێک نەبوو لەخشتەی بەرێت، جوولەکە لە جادووگەریی بەولاوە هیچی تری شک نەدەبرد، تا لەخشتەی بەرن. کەسێکی پیری جادووگەریش نەدەلوا ئەو کارەی پێبسپێرن، دواجار توانییان کەسێکی زۆر شیاوی بۆ هەڵبژێرن، ئەویش ڕۆکسلانەی جادووگەر بوو. کە بەهۆی جوانییەکەیەوە دەستێکی باڵای لە جادووگەریدا هەبوو، لە مێژووشدا ناوبانگی هاتووە. ڕۆکسلانە زۆربەی شەوانی هەفتە لەباخەڵی سوڵتان سولێمانی قانوونی دەخەوت!

ماستیمی ئەهریمەن چەناگەی لەنێو هەردوو لەپی دەستی نابوو، ما لە ڕۆکسلانە بڕوانێت، کە دڵی سوڵتانی دەستبەسەر کردبوو. سوڵتان ناچاربوو، داوای هاوسەرگیری لە ڕۆکسلانە بکات، ئەگەرچی یاساغبوو فەرمانڕەوا لەتەک کەنیزەکانی هاوسەرگیری بکات، وەلێ سولێمان قانوونی ئەو یاسایەی بەزاند و ڕۆکسلانەی لەخۆی مارە کرد. سوڵتان کەوتبووە داوی ڕۆکسلانەوە بۆی نەبوو هیچ شتێکی ڕۆکسلانە ڕەتکاتەوە، سیحری جوانی و عیشق بەهێزترین سیحر بوون بەسەر سوڵتانەوە. ڕۆکسلانە لە کۆشکی(حەرملك) واتە کۆشکی تایبەت بە خانمان بوو بەخانمی کۆشک، ئەو ئەوێی پێخۆش نەبوو. ڕۆژێك کۆشکی (حەرملك) ئاگر دەگرێت، هیچ مێینەیەك نەیدەزانی کێوە ڕابکات، تەنها ڕۆکسلانە نەبێت دەیزانی پەنا بۆ کێ ببات، خۆی هاویشتە باوەشی سوڵتان و داوای لێکرد لەکۆشکەکەی خۆی دایبنێت، بەڵێ بۆ کۆشکەکەی خۆی گواستییەوە و بەشێکی بۆ ئەو دابڕی و دەرگایەکی

لەنێوانیان دانا، بەو شێوەیە ڕۆکسلانە تەنها یەك دەرگا لە سولتانەوە دوور بوو، بۆیە زۆربەی کات بەیەکەوە دەبوون.

سولتان سولێمانی قانوونی دەستی بەشتگەلێك کرد کە بۆ ئەو مێژووەی هەیبوو ناشایەستە بوون. لەپڕ سولتان فەرمانی دا موفتی ولات لەسێدارە بدرێت کە هاوڕێی بوو، تەنانەت هاوڕێی منداڵیشی بوو. لەسێدارەدانیش لە دەوڵەتی عوسمانی بەقەنارە[1] کردنبوو بەڵکو خنکاندن بە دەزوویەکی[2] سووری ئاوریشم بوو. ماستیم ڕووانییە مار سێرپنت چون ئەوەی پرسیارێکی لێبکات. سێرپنت ئیشارەتی بۆ ڕۆکسلانە کرد، کە دەستی ئەوی تێدابووە. وایکردبوو سولتان گومان لە هاوڕێی منداڵیشی بکات ئەویش موفتی مەزن بوو. ئەوەشی وا ڕێکخستبوو، گوایە موفتی بەنیازە دوای سولێمانی قانوونی کوڕەکەی (مستەفا) جێیبگرێتەوە، ڕۆکسلانە ئەوەی پێ قبوول نەبوو و دەیویست (سەلیم)ی کوڕی ولات بگرێتە دەست.

ماستیمی ئەهریمەن فڕی تا چاوی بە سەلیم بکەوێت، کە لەباوەشی (ڕاشێل)ی کەنیزە نووستبوو. ڕاشێل کەنیزەیەکی جوولەکەی ئیسپانییەو ڕۆکسلانە پێی بەخشیبوو. سەلیم مەیخۆرێکی سەرمەست بوو، لەکەنیزەکەی جیا نەدەبووەوە، تەنها ئەو ساتانە نەبێت سولتان دەینارد بەدوویدا. بەڕوخساری ماستیمەوە شێوە گاڵتەجارییەك دیاربوو. ئەوجا بەرەو لای ڕۆکسلانەی جادووگەر فڕی.

---

[1] لەسێدارەدان.

[2] داو.

سولێمانی قانوونی سووربوو لەسەر ئەوەی مستەفای کوڕی دوای خۆی جێیبگرێتەوە، وەلێ ڕۆکسلانە پێیخۆش نەبوو، دەبوو ئەوەش چارەسەر بکات. مستەفا لەوڵاتی فارس دا بوو، ئەوەتا دەیبینین دەچێتە ڕەشماڵێکەوە، کە پێدەچێت ڕەشماڵی سوڵتانی باوکی بێت. هەر ئەوەندەی دەچێتە ڕەشماڵەکەوە، پێنج زەلامی دەمامکدار پەلاماری دەدەن، ملی دەکەن بە دەزوویەکی ئاوریشم بۆ خنکاندنی. ئیدی چەند هەوڵدەدات خۆی بۆ ڕزگار ناکرێت. لەپڕ چاوی بەسوڵتانی باوکی دەکەوێت بەرامبەری وەستاوە و لێی دەڕوانێت، جگەرگۆشەکەی لەسێدارە دەدرێت. جادووە ڕەشەکە کاری خۆی کرد. ڕۆکسلانە باوەڕی پێهێنابوو، کوڕەکەی بەنیازی کۆدەتا کردنە بەسەر باوکی، کە ئەوەش خیانەتە. مستەفا شل و شاو دەبێتەوە و گیانی دەسپێرێت. ئەوجا ڕۆکسلانە کەسێك دەنێرێت بۆ کوشتنی کۆرپەکەشی، تا بنبڕیان بکات و دەسەڵات بۆ سەلیمی کوڕی بمێنێتەوە.

ڕێگا تەواو بۆ سەلیم چۆڵ نەبوو، سوڵتان کوڕێکی تریشی لە ڕۆکسلانە هەبوو، جەنگاوەرێکی بەهێزبوو، ناوی بایەزید بوو. جادووگەرەکە پیلانی بۆ نابووەوە، بەسەر سوڵتانا هەڵگەڕێتەوە، پیلانیشی بۆ سوڵتان نابووەوە بەوای ئەوەی خیانەتکارە تا بەدووی بکەوێت و لەسێدارەی بدات. ئەوە دووەم کوڕی سوڵتانبوو لەسێدارە بدرێت. ئەوە چ جادوویەکی ڕەشبوو بە قورگی سوڵتانیان کردبوو. میر بایەزید لە دارستانەکەدا وەستابوو، هەرچوار منداڵەکانیشی بەدەورەوە بوون، کە دەکاتە کوڕەزاکانی سوڵتان، سوڵتان و سەربازێکی زۆریش دەورەیان دابوون، بایەزید و هەرچوار منداڵەکەیان

کوشت. ڕوخساری ماستیم لە بزەخەنەوە بەخەنینەوەیەکی گاڵتەجاڕانە گۆڕدرا، ئەوجا بەرەو لای ڕۆکسلانە هەڵفڕی.

ئێستا ڕێگا بەرەو کورسی فەرمانڕەوایی چۆڵبوو، لەکوڕەکانی سوڵتان تەنها سەلیم مابووەوە، نازناوی سوڵتان هەڵبگرێت. ماستیم بەدیار ڕۆکسلانەوە مایەوە، تا لەباوەشی سوڵتاندا کۆچی دوایی کرد، ئەو کارەکەی بەتەواوی جێبەجێکرد، دوای ئەو سولێمان قانوونیش کۆچی دوایی کرد و سەلیم جیگای گرتەوە. سەلیم پیاوێکی مەیخۆر بوو، بەردەوام سەرمەستبوو. ماستیم زۆر دڵخۆشبوو، نەك لەبەر ئەوەی ئەو گەمژەیە جیگای سوڵتانی گرتەوە، بەڵکو بەوای زیرەکی ژنەکەیەوەبوو، ڕاشێل.. ئەو کەنیزە جووە ئیسپانییەی کە لەئامێزی جیا نەدەبووەوە، لەسەر ڕێبازی ڕۆکسلانەی مامۆستاکەی ڕۆیشت و کارەکانی مێردەکەی بەڕێوە دەبرد، بەڵکو تەواوی دەوڵەتی عوسمانی بەڕێوە دەبرد، بەدیوێکی تر ڕاشێل فەرمانڕەوای ڕاستەقینە بوو، نەك هەر ئەوەش، تەنانەت باوکە جووەکەشی (جۆزیف ناسی) خۆشەویستی سوڵتان سەلیم و لەبابەتی فەرمانڕەواییدا ڕاوێژکاری بوو، زۆربەی کاتیش پێکەوە دەیانخواردەوە و مەست دەبوون. ما دەوڵەتە مەزنەکەی عوسمانی ئافرەتێکی جوولەکە بەڕێوەی ببات، ئەوەش مایەی خۆشحاڵی ماستیم بوو.

سوڵتان سەلیمیش کۆچی دوایی کرد، موڕادی سێیەم جێیگرتەوە، پێدەچوو نەوەیەکی نوێی پیاوناقووڵ دەوڵەت بەڕێوە ببات. ڕاشێل لەپشت پەردەوە حوکمی وڵاتی دەکرد. بەسایەی گەمژەیی موڕادی سێیەمەوە ئەرکی فەرمانڕەوایی هەر لای ڕاشێل مایەوە. ئیدی ما خوێنی جوولەکە

بەشادەمارەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ڕۆبچێت.، ئەویش بەهۆی مار سێرپنت و ماستیمی ئەهریمەنەوە بوو. ئەوجا ئەو جوولەکانەی ئاوارەی دەوڵەتی عوسمانی ببوون، بەپانی و درێژی وڵاتا تەراتێنیان دەکرد، پلەو پۆستی باڵاشیان لەحوکمەتدا هەبوو. لەهەمووی ترسناکتر ئەوەبوو کە چاویان هەر لەخاکی فەڵەستین بوو.

ماستیم زۆر لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا نەمایەوە، بەرەو گۆڕەپانێك لەناوەندی شاری ئەستەنبووڵ فڕی. ئەوەی لەوێ ڕوویدا دیمەنێکی سەیر بوو.. پیاوێك هەردوو پێی لەخشت نرابوون، هەردوو دەستیشی لەخشت نرابوون، جەماوەرێکی زۆر بەدەوریەوە بوون، سەربازەکانی سوڵتانیش بەدەوریدا بازنەیان بەستبوو. ماستیمی ئەهریمەن چاوی لە مار سێرپنت بوو، خۆی بەسەر خشتەکاندا دابوو، دواتر سەری بەرامبەر پیاوەکە هەڵبڕی. ئەو پیاوە (ساباتی زەیفی)بوو، ئەوڕۆ ڕۆژی لەسێدارەدانێتی.

ساباتی.. جوولەکەبوو، هەزاران جوولەکە شوێنی کەوتبوون، پێیان دەگوترا شوێنکەوتووانی مەسیحی دڵسۆز. هەرچی خۆی بوو بەناوێلێك ناوی لەخۆی نابوو، وەك نۆبەری کوڕی خودا، یا باوکی ئیسرائیلییەکان، دەیگوت من خودام، خواوەندی باڵا، دوای چەوسانەوەی جوولەکە لە ئەورووپا لەدایکبوو. لێل فەرموودەکانی جوولەکە لەنزیکبوونەوەی دەرکەوتنی مەسیحی دڵسۆز، کە خودا پەیمانی وێدابوون، بەهاتنی ڕزگار دەبن و حوکمی هەموو جیهانیش دەکەن. ساباتای تەلموودو کابالای خوێندەوە، کە وادەی هات، هاتە ناو جوولەکەکان تا بڵێت من مەسیحی دڵسۆزم.. تا نەگەڕێنەوە فەڵەستین هەر وا دەربەدەری شاران دەبن.

دەیان کەسی لەدەور خۆی کۆکردەوە، دواتـر بـوون بـە سـەدان کـەس، دواتریش خۆیان لەهەزاران کەس دەدا. ساڵی ١٦٦٦ ، ها.. شەش و شەش و شـەش، ژمـارەی دڕندەکەیـە کـە ئینجیـل نـاوی بـردووە. بەشـوێنکەوتووانی ڕاگەیاند.. ئەوەی بووەتـە بەربەسـت لـە گەڕانـەوەمان، دەوڵـەتی عوسمـانی زۆرداره. دەوڵـەتێك ڕۆکسـلانە خـوێنی جوولەکـەی کـرد بەبـەر سـوڵتانەوە، پیاوێلێکی تیدا ڕسکان بۆ بـەڕێوەبردنی وڵات، توانییـان دەوڵـەتێکی بـەهێز درووست بکەن، دەبێت ئەو دەوڵەتەش هەر بەدەستی ئێمە بڕووخێت، دەنا تا ماون جێتان لەسەر گۆی زەوی نابێتەوە. ساباتی لەچەندین خۆپیشـاندان بـۆ ڕوخانـدنی سـوڵتان بەشـداری کـردووە، بـۆ. سـوڵتان فـەرمانی دەسـتگیرکردنی بۆ دەردەکـات، تـا لـەناو گۆڕەپـان بەرامبـەر بەجـەماوەر لەسێدارەی بدات، ئەوەی خۆی بـەخوا دەزانێـت. ئـەوەتا ساباتی دەست و پێـی لەکۆتایـە، پیـاوانی دەسـەڵات لـە ئامادەباشـیدان بـۆ جێبـەجێکردنی فـەرمانی سـوڵتان. دیـاربوو وەرگێڕێـك لەسـیلەیدا بـوو، بـەر لەسـێدارەدانی قسەی لەتەکا دەکرد.

- ساباتی تۆ عەقڵی خۆتـت لەدەسـتداوە، پێدەچێت گەمژەییەکـەت سەرت بخوات.

ساباتی تەماشای کرد و گوتی:

- تازە کار لەکار ترازاوە، قسە چ سوودێکی نییە.

وەرگێـڕ بەشـێوەیەك قسـەی لەتـەکا دەکـرد، چـون ئـەوەی بابـەتێکی ترسناکی لەگەڵ باس بکات.

- چاك گوێم لێبگرە، منیش وەك تۆ جوولەکەم، باوەڕیشم پێتە و باوەڕیشم بە پەیامەکەتە، دەمەوێت فریاتکەوم و لەم سێدارەیە ڕزگارت بکەم، وابکەم سوڵتان پیاتا بچێتەوە و فەرمانەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

ساباتی بەسەرسوڕماوییەوە لێی دەڕوانی: گوتی:

- ئەوە چ بیرۆکەیەکە کوڕم، تۆ گاڵتەم پێدەکەیت؟

وەرگێڕەکە بەرسقی[1] دایەوە و گوتی:

- هەر ئێستا لەسەر دەستی سوڵتان ئیسلامبوونی خۆت ڕابگەیێنە، تۆبە لەهەموو گوناهەکانت بکە و بچۆرە سەر ئایینی موحەممەد.

- واپێدەچێت گاڵتەم پێبکەیت، ئاخۆ تۆ بەڕاستی جوولەکەیت؟

- واحاڵی مەبە، تۆ هەر بەسەر زارەوە ئەوە ڕادەگەیێنیت، لەدڵەوە نا. ئەم تاکتیکی ئیسلامبوونەشت لەناو شوێنکەوتواندا بڵاو دەکەینەوە بۆ چ مەبەستێك بووە، پیلانە بۆ ڕووخاندنی سوڵتان، گەڕانەوەمانە بۆ فەڵەستین.

مار سێرپنت چاوەکانی زەق زەق[2] کردەوە، ماستیمیش ڕوخساری خۆی بە شێوازی سیمای جوولەکەیی گرژ کرد. ساباتیش وەك ئەوەی وەرگێڕ پێشنیاری کردبوو، هەر وایکرد. ساباتی لەناو جەماوەرەکە ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاند، سوڵتان لێی خۆش بوو، مووچەیەکی مانگانەشی بە بڕی پەنجا پارچەی زیو بۆ بڕییەوە. ساباتی ئازاد کرا، ناوی

---

[1] وەڵامی.

[2] ئەبڵەق.

خۆیشی بۆ (موحەممەد ئەفەندی) گۆڕی، داوای لەهەموو شوێنکەوتووانیشی کرد ببنە موسوڵمان، ئەوانیش بەقسەیان کرد و پەیامی جوولەکانەی خۆشیان لەدلا پاراست، ئەوانە لەدەوڵەتی عوسمانی بەنازناوێکی تایبەت ( جوولەکە تۆبەکارەکان) ناسران ئەوانەی گەڕانەوە لای خودا، ئەوجا لەهەموو دەوڵەتی عوسمانی بلاو بوونەوە و هەندێکیشیان پلەو پۆستی بالآیان لەحکومەتدا وەرگرت.

هەر یەکیان دوو ناوی هەبوو، ناوێکی ئیسلامی بۆ مامەڵە کردنی لەتەك خەڵکیدا، ناوێکی تری جوولەکەییش لەتەك شوێنکەوتووکاندا ئەویش شەمووان نەبێت لەکاتی ڕێوڕەسمی تایبەتیی ئایینەکەیان لەژوورە داخراوەکانی خۆیاندا تا ئاشکرا نەبن بەکاریان دەهێنا. کتێبێکی تایبەتیان بۆ ئەو حاڵەتە داهێنا، پێی دەگوترا کتێبی گیرفان، تا لەناو جلوبەرگەکانیان بیشارنەوە. ئەوجا ئاهەنگی بەدکارییان ساز دەدا، ئەویش بە گۆڕینەوەی هاوسەرەکانیان لەتەك یەکتردا. جەژنێکیشیان هەبوو، چراکانیان دەکوژاندەوە تا تاریك بێت، ئەوسا وەك ئاژەڵ لەیەك دەپەڕین. هەر ئافرەتێکیان لەو جەژنەدا سکی بکردایە، ئەو کۆرپە لەدایك دەبوو دەچووە خانەی پیرۆزییەوە، بەلایانەوە ئەو لەدایکبووە حەرامزادە نەبوو.

چاویان هەر لەخاکی فەڵەستین بوو، پەلەیان بوو بۆ گەڕانەوە، تا پەیامی تەورات بلاوبکەنەوە. مەسیحیش هەر لە قودس دێتە خوارەوە، هەر لەوێوە دەکەونە ئەوەی حوکمی جیهان بکەن، بۆیە وەك ئەودوای جوولەکەکانیتر چاوەڕێی هاتنە خوارەوەی ناکەن.

دەمامکی ماستیم شەیتانی جوولەکان ڕوخسارێکی قیزەون و ناشیرینی دەرخست، هەر بەئاسمانەوە بوو و بەدواداچوونی بۆ ڕووداوەکان دەکرد. ساباتای بۆ ئەلبانیا نەفی کرا و هەر لەوێ تووشی کۆلێرابوو، دواتر کۆچی دوایی کرد. ئەو مرد و بڕایەوە، وەلێ شوێنکەوتووانی دەیانگوت.. بەرەو ئاسمان بەرز کراوەتەوە، هەرکاتێك وڵاتیان داگیر کردەوە، ئەویش دێتە خوارەوە، تەماحیان هەر لە فەلەستین بوو، کە دەوڵەتی عوسمانی گەشتی فەلەستینیانی لێ قەدەغە کردبوو. لەناو دەوڵەتی عوسمانی پلەو پۆستی بالآیان تا دەهات زۆرتر دەبوو، تەنانەت سەرکردەی سوپاش هەر لەوان بوو، لێرەوە گەمەکەیان بەشێوەیەکی تر گێڕا، گەمەی (ئیتحاد و تەرەقی).

دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ، ماستیم بەرەو کۆشکی فەرمانڕەوایی عوسمانیی نوێ هەڵفڕی، کۆشکی (یلدز)، خۆی بەعەرشا کرد، لەوێ چاوی بەدیمەنێکی مێژوویی کەوت.. خەلیفەی عوسمانی (عەبولحەمیدی دووەم) ڕووبەڕووی سەرۆکی دەزگای بزووتنەوەی زایۆنیزم (تیۆدۆر هرتزل) وەستا، هرتزل پێی گوت:

- گەورەم.. ئەگەر فەلەستینمان بەرکەوت، هاوکارییەکی بێ شوماری دەوڵەتی عوسمانی دەکەین، دەزانین دوای ئەو هەموو جەنگانە دەوڵەت لەچ بارودۆخێکی خراپی ئابووریدایە، ئێمە ئەو پارەیەتان پێ دەدەین، خۆتان ڕاست بکەنەوە، ئەوەش وەك قەرز نابێت، تەنها دەمانەوێت فەلەستین بۆ ئێمە بێت.

- بۆچی تەنها جەخت لەسەر فەلەستین دەکەنەوە؟ دەتوانن لەهەر دەڤەرێکی دەوڵەتی عوسمانی جێنشین بن.

- گەورەم.. فەڵەستین بێشکەی سەرەکیی جوولەکەیە.
- فەڵەستین هەر تایبەت بە جوولەکە نییە، بێشکەی هەموو ئایینەکانە.
- وەڵێ ئێمە یەکەم میللەتبووین تیا نیشتەجێبووین.
- ڕاست ناکەن، پێش ئێوەش فینیقییەکان و کەنعانییەکان نیشتەجێبوون.
- بەڵام ئێمە زۆرترین حوکممان تێدا کرد.
- ئێوە چوارسەد ساڵ فەرمانڕەوایتان تێدا کرد، موسوڵمانەکان سێ ئەوەندەی حوکمی ئێوەیان تێدا کرد، واتە هەزار و دوو سەد ساڵ، نووکەش حوکم هەر بەدەست موسوڵمانەکانەوەیە.
- گەورەم.. ئێوە باوەڕتان بەتەوراتە، ئێمە لەتەوراتەوە خودا پەیمانی وێداوین دەگەڕێینەوە خاکی پیرۆز.
- تەوڕاتی ئێوە، ئەو تەوراتە نییە کە باوەڕمان پێیەتی، تەنانەت لەو تەوراتەی ئێوە کە دەستکاریتان کردووە، گوتووتانە خودا پەیمانی بەو بەندە چاکانەی کردووە، ئێوە هەشتا ساڵ بەهۆی پێغەمبەرەکەتانەوە بەچاکی بردووتانەتە سەر، ئەودوای چوار سەد ساڵەکە هەرچی خراپە بووە کردووتانە.
- گەورەم.. ئێمە لە مشتومڕی مێژوودا نین، ئەمڕۆ هاتووین دەستی هاوکاریتان بۆ درێژ بکەین و دوای دەربەدەر کردنمان ئەو چاکەیەتان بدەینەوە، تەنها ئێوە لەخاکی خۆتان دالّدەتان داین، ئێمەش پارەدارین و ئێوەش بۆ باری ئابووریتان پێویستتان بە پارەیە، ئەوەی ئێمە دەمانەوێت تەنها خاکێکی ئاساییە، دەمانەوێ بۆی بگەڕێینەوە، خاکی ئێوە سنووری بۆ

نییە، لەوە زیاتر نامانەوێ ببینە ئەرك بەسەرتانەوە، لەبری ئەوەی بە پەرتەوازەیی لێرەو لەوێ بین، دەمانەوێ ئەو خاکە کۆمان بکاتەوە.

- من کێم تا فەڵەستینت پێبفرۆشم، دواتر خۆ فەڵەستین تەنها موڵکی من نییە، چ کاتێك بمەوێت بیفرۆشم و چ کاتێکیش بمەوێت بیکڕمەوە، ئەوە موڵکی هەموو موسوڵمانانە، لەوێوە پێغەمبەری ئیسلام بەرەو ئاسمان ڕۆیشتووە، ئەوێ یەکەم قیبلەمان بووە، ئەگەر دەتانەوێ بگەڕێنەوە، من لاریم نییە، وەلێ بڕۆن تاك بەتاکی موسوڵمانەکان ڕازی بکەن، ئەوجا ئامادەم پێتانی بفرۆشم.

- باری ئابووریتان دەگرینە خۆمان، بەربەستێکیش لەنێوان ئەورووپاو ئاسیا درووست دەکەین، شارستانییەتێکی پێشکەوتوو دادەمەزرێنین.

- باو باپیرانمان لەبەر ئەو خاکە جەنگان، خوێنی زۆرمان بۆ دا، پارەکانتان بۆ خۆتان، ئەگەر دەوڵەتەکەمان پارچە پارچە بوو، ئەوسا دەتوانن بێ بەرامبەر فەڵەستین بەرن، وەلێ بەهیچ جۆرێك قبووڵم نییە جەستەم بەزیندوویی لەت لەت بکرێت، ئەگەر هەروا بە گەمژەیی خۆتان بمێننەوە، ئەوا دەربەدەرتان دەکەم، بۆ شوێنێکیش نەفیتان دەکەم میللەتان گۆشتی جەستەتان بخۆن.

دەمامکە تۆقێنەرەکەی ماستیم بەڕوخسارێکی توورەبوو گۆڕدرا، هەرچی هرتزل بوو، بزەخەنەیەکی جوولەکانەی گرتە سوڵتان و لەلای دەرچوو. دەیویست سوڵتان بە پارە هەڵبخەڵەتێنێت، وەلێ دیاربوو گەمژەبوو، نەیزانی لەخۆڕا نەبووەتە فەرمانڕەوای دەوڵەتێکی زلهێز. سوڵتان بە هرتزلی گوت.. جوولەکە بۆیان نییە بپەڕێنەوە فەڵەستین، مەگەر بەسەر

لاشـەیاندا. هرتـزل بێئومێـد لەکۆشـك دەچـووە دەرەوە، ماسـتیم بـە بـان سەریەوە لێی جوودا نەدەبووەوە.

چەنەی چەند ساڵە لەم بارودۆخەدا هرتزل وتـاری خـۆی بـۆ بیرمەنـدانی زایـۆن دەگوتـەوە، پیلانەکـەی وابـوو، سـێرپنت بـەدەور ئـەوروپا خـوول بخواتـەوە و بیڕووخێنێـت، دواتـر لـەخاکی عـەرەبان دابـەزێت، تـا دەوڵـەتی عوسمانی بڕوخێنێت. دوای کۆنگرەی زایۆن، مار سێرپنت تـوانی سیستەمی قەیسەریی ڕووسی بە شۆڕشی ناوخۆی ڕووسییەکان بڕوخێنێت، شوعییەکان دەسـەڵاتیان گرتـە دەست. دواتـر مـار سێرپنت دابەزییـە خـاکی عارەبـان. هرتـزل لـەکۆنگرەی زایۆنـدا گـوتی.. پێویسـتە نـەوەکانی ئـەمڕۆ لەخزمـەت ڕێکخراوی ماسۆنییەتدا بن. ماستیم بەدوای هرتزلەوە بۆ شاری (سالۆنیکا)ی یۆنانی عوسمانی ئەو سەردەمە کەوتـە فـڕین، لـەوێ ماسـتیم هـەموو شتێك تێگەیشت.

ئەگەرچی ئەو جوولەکە شوێنکەوتووانی ساباتای بانگەشـەی ئیسـلامیی خۆیـان ڕاگەیانـدبوو، بەهـەموو دەوڵـەتی عوسمانیـدا بڵاوبووبوونـەوە، وەلێ گەورەترین گردبوونەوەیان لە سالۆنیکا بوو، لەوێ دەستەی ماسۆنیی ئیتاڵیا چالاك بوون، کەوتنـە کۆکردنـەوەی ئـەو جوولەکانـەی پلـەو پۆسـتی باڵایـان لەدەوڵــەتی عوسمانیــدا هــەبوو، بەتایبــەت کــەرتی ســەربازی، دوای کۆکردنەوەیان کۆمەڵەیەکیان لێ پێکهێنان بـەناوی( ئیتحـاد و تـەرەقی)ەوە، وایـانکرد کۆمەڵەکـە نموونـەی دەسـتەی ماسـۆنییەکە بـن. کۆمەڵەکـە بـەك ئامانجیان هەبوو، خستنی سـوڵتان عەبولحەمیـدی دووەم بەهـەر شێوەیەك بێت، بازووی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان لێ هەڵکرد، ماسـتیمیش بـازووی خـۆی

بۆ مەڵماڵی. ماستیم پەنجەکانی بە نینۆکەکانیشیەوە درێژ کوڵەن، جوولەکە هەر ئەوەی کە لەکۆندا دەیانکرد دەستیان پێ کردەوە, هاندانی گەلْ دژی پاشاکان.

واپێدەچوو باری سوڵتان بەرەو ئاڵۆزی بڕوات، چون ئەوەی باری هەموو دنیای بەسەر شانەوە بێت. جوولەکە دەستیان بە گەمەی خۆیان کرد. میللەت بەهۆی ڕووداوی هەڵبەستراوی جوولەکەوە بەسەر سوڵتان کەوتنە وروژان. لەپڕ سوڵتان بوو بە زۆردار و خوێنمژ، بەوە مێشکی خەڵکەکەیان پڕ کرد، پێویستە دەوڵەتی عوسمانی لە زوڵم و زۆرداری خەڵکەکە بکەوێت و ببێت بەدەوڵەتێکی پێشکەوتووخوازی وەك فەرەنسا و ئینگلتەرا، ئەوەشیان بە گوێی خەڵکی ڕاگەیاند کە سوڵتان حەزی بە پێشکەوتن نییە، تەنانەت ڕۆشنبیرەکانیش کە دەهاتنە قسە کردن لەپەنجەرەی کۆشکەکەیەوە فڕێی دەدانە خوارەوە، ڕازی نییە بەدەستوور کار بکات، کە وەك دەستووری دەوڵەتە پێشکەوتووەکانە. گشت ئەوانە لەلایەن ڕاگەیاندنی چەواشە کراوەوە دەکرا، کە دەوڵەمەندە جوولەکەکان بەڕێوەیان دەبرد. گەورە پیاوانی سوپای عوسمانی چوونە کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقی)یەوە، تەنانەت وەزیری داراییش هەر جوولەکە بوو، سەرۆکی نووسینگەی ڕۆژنامەوانیش هەر جوو بوو، هەر ڕۆژنامەیەك یا بڵاوکراوەیەك خزمەتی (ئیتحاد و تەرەقی) نەکردایە، دایاندەخست. بەو شێوەیە ئاهەنگی جوولەکە لە دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێکرد بەپارچە پارچە کردنی و یەکنەگرتنەوەی جارێکی تر!.

سـولّتان عەبدولحەمیـدی دووەم یاسـایەکی دەرکـرد، پەیوەسـتبوو بـە گەشتی جوولەکە بۆ فەڵەستین، هەرچی جوولەکەیە پەساپۆرتی سووری بۆ دەربچێت، بەو ئاوایە بۆی قەدەغەیە گەشت بۆ فەڵەستین بکات، هەر پارچـە زەوییەکیش لە فەڵەستین قەدەغەیە بکرێت بەناویانەوە. ئەوەتا لێل ماستیم و مێژووش تەماشـای ئـەو دیمەنـەی لەشـکری سـەربازی لـە سالۆنیکاوە بـۆ ڕۆخاندنی سولّتان بەڕێوەن، هێزەکە گەیشتە ئەستەنبووڵ و چوار زەلام کـە یــەکیان جوولەکــە بــوو، ســیانەکەی تــریش نــە عــەرەبیان تیــابوو، نــە عوسمانییش، نامەی دەست لەکارکێشانەوەیان وێدا. ئەو سیانەی تر یەکیان ئەرمەنی بوو، ئەوی تریان ئەلبانی بوو، ئەوی سێیەم جۆرجی بـوو. ماستیم لەخۆشیا پێدەکەنی، قاقای پێکەنینی بوو.

سولّتان بەرەو سالۆنیکا بـۆ نێـو جوولەکـەکان نـەفی کـرا. مـاوەی سـێ ساڵ لە خانوویەکی جوولەکان دەستبەسەر بوو. سولّتان بەگوێی خۆی گوێی لەهەراو زەنایان دەبوو، هاواریان دەکرد.. ستەمکارو زۆردار نەماو ڕووخا, تا پەساپۆرتی سوور بۆ دابڕانمان لە خاکی پیرۆز دەربکا. ماستیم هـەقی خـۆی بـوو پێبکـەنێت، ئـەوەبوو لـەجێی سـولّتان کۆمەڵـەی ئیتحـاد و تـەرەقی (موحەممـەدی شەشـەم)یان دانـا، کـە سـولّتانێکی کـارتۆنی بـوو، ئـەوەی حـوکمی دەکـرد، کۆمەڵـەی ئیتحـاد و تـەرەقی بـوو. ئـەو سـەردەمە بـوو بەسەردەمی جوولەکەکان، کە توانیـان فـەرمانڕەوایی دەوڵـەتێکی ئیسـلامی بکەن.

کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی ئەو پەساپۆرتە سوورەیان هەڵوەشاندەوە، جوولەکە مافی خۆیانە هـەر کوێیـەك دەیانـەوێت گەشـتی بـۆ بکـەن، ئەگـەر

فەڵەستینیش بێت، بۆیشیان هەیە زەوی و زاریش لەفەڵەستین بکڕن. قەرزی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە سێ ملیۆنەوە بوو بەچوارسەد ملیۆن، جوولەکەکان هەمان سیاسەتیان هەبوو لەقەرز دان بە هەر دەوڵەتێك بیانوویستایە قەرزار باری بکەن. لەهەموو لایەکەوە جوولەکە بەرەو فەڵەستین گەڕانەوە، تەنانەت ژمارەیان گەیشتە هەشتاو پێنج هەزار کەس.

کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی حوکمی وڵاتیان بەهەوەسی نەتەوەیی تورك بەڕێوە دەبرد، لەهەیبەتی عەرەبیان کەمکردەوە. میللەتی تورکیان پێباشتر بوو، بەو ئاوایەی لەنەوەی فاتیحی مەزنن. ئەو ڕەگەزپەرستییە وایکرد ڕەگەزپەرستییەکی تر بێتە ئاراوە، عەرەب لە فەرمانڕەوایەتی تورك هەراسان بوون، ناچار بیرۆکەی ئازادکردنی خۆیان داهێنا، بەتایبەت پلەو پۆستی جوولەکە گەیشتبووە ڕادەیەك ئێدی بێدەنگی لێنەدەکرا. جوولەکە چوونەوە فەڵەستین، عەرەب بیریان لە ئازادی کردەوە، دەیانویست دەوڵەتێکی نوێی ئیسلامی دروست کەن، تا فەرمانڕەوایەتی عەرەب و عرووبەتەکەیان بۆ بگەڕێنێتەوە.

ماستیم.. لەفەڵەستین بوو، ڕێك لەقودس، بەسەر مزگەوتی ئەقساوە دەفڕی، خەنینەوەیەکی شەیتانی زایۆنی تۆقینەری هەبوو. ئەمە دوای گەشتەکە نەبوو، ماستیم دەیزانی ئەمە هێشتا سەرەتایە.. سەرەتایەك بۆ سەردەمی ئەنتیخریستۆس.

***********

تەواو

## ئەنتیخریستۆس

ماستیم ئەهریمەنێکی جوولەکەکان بوو، بەدەگمەن ناوی هاتووە، ناوی تەنها لە (یۆبیلاتی ئاینی جوولەکەی کۆن)دا هاتووە، تەنها لەشوێنە هەستیارەکاندا پیلانی دادەنا. وێنەکەی تەنیا لە یارییەکی ڤیدیۆیی ژاپۆنی بەناوی(Megami Tesni) بڵاوبووەتەوە، کە بەسەر هەموو یارییەکاندا بە بەرنامە کراوە، ماستیم لەهەندێ بەشی سەر ئامێری (نینتیندۆ دی ئێکس) و ئامێری (سیگا ساترن)دا دەردەکەوێت، لە (MANGA)ش کە وێنەکەی تیا کێشراوە.

هەرچی لەمەڕ ئەم بەسەرهاتەوەیە ڕاستییە و بەڕوونیش لە کتێبی مێژووی باوەڕپێکراوەوە باسکراوە. وانەزانیت هەواڵی ساختەی هەڵبەستراوەم بۆ هێناویتەتەوە، نەخێر ئەوە ڕاستییە بۆتی دەگێڕمەوە و لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەرمگرتووە. بەساختە کردنی مێژوو و شێواندنی یارییەکی گەورەیە و تەنها خزمەتی یەک بەرژەوەندی دەکات، ئەویش بەرژەوەندی جوولەکەکان، نەک هەر هەموو جوولەکەیەکیش، بەڵکو لقێکی کە بە زایۆنیزم ناسراوە.

هەر بەم بۆنەیەوە، بەساختە کردنی مێژوو لەم سەردەمی مۆدێرنە لەخۆی ئاسانتر نییە. کۆن مێژوو نووسانی عەرەب و بیانییەکان بەخامەی خۆیان مێژوویان دەنووسییەوە، دوای ئەوەی چاپ و چاپەمەنی و کۆمپیوتەر پەیدابوون، هەر ئەو دەسنووسە کۆنانەیان بە بەرنامە گواستەوە ناو کۆمپیوتەر. وەلێ کەوتنە دەستکاری کردنی مێژوو. ئەوجا دەزگەکان کەوتنە بڵاوکردنەوەیان، لەو دەست بەدەستییە هەندێ پەرەگراف و هەندێ ڕستەیان تیا سڕییەوە، ئەو ڕستەو پەرەگرافانەی مەبەستیان بوو

دەیانهێشتنەوە، ئەو بەشانەی دەردەهێنران بۆ مەرامێکی سیاسی یا ئایینی بووە. ئاواتەخوازم ئەم کتێبەی منیش سانسۆر نەکرێت و هیچی لێ دەرنەهێنرێت و وەك خۆی چاپ بکرێت، کە دەزانم وا نابێت!

چیرۆکی ڕۆکسلانە لەتەك سولتان سولێمان قانوونی لەدرامایەکی تەلەفزیۆنی تورکیدا بەناوی( حەریمی سولتان) بلاوبووەوە، ناوی ڕۆکسلانەیان گۆڕیوە بە ناوێکی عەرەبی و ناوی (هیام)یان لێ ناوە. ئەوانیش فرتوفێڵەکانیان ئاشکرا کردووە و پیلانەکانیشیان خستووەتە ڕوو، درامایەکبوو، واقیعی دەردەخست، وەلێ بەدەستکارییەکی زۆرەوە.

کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقی) بانگەشەی لیبڕالییان دەکرد، کێشەکە ئەوەیە، ئەو هەموو بیرۆکانەی لەجیهاندا بلاوبوونەتەوە، دەسیسەی[1] ڕێکخراوی ماسۆنین، خەڵکی سڤیل کە دەچوونە ئەو ڕێکخراوەوە نەیاندەزانی خودی ڕێکخراوەکە ماسۆنییە، بۆ نموونە کاتێك پرسیار لە چەپێك دەکەیت کە ئەو بیرۆکەیەی لەکوێوە وەرگرتووە؟ دەڵێت لە (کارڵ مارکس)ەوە، یا فریدرێك ئەنگلزەوە، کەهەردووکیان بەفەرمی ماسۆنی بوون، کاتێکیش لە عیلمانییەك یا لیبڕالییەك دەپرسیت ئەو بیرۆکەیەتان لەکوێوە بۆ هاتووە؟ پێت دەڵێت لە ڤۆڵتێر و جان جاك ڕۆسۆ وە، ئەوانیش بەفەرمی هەر ماسۆنی بوون. ماسۆنییەت خاوەنی بیرۆکە گەورەکانی جیهانە، مەبەست لە دوورخستنەوەی خەڵکییە لە بیروباوەڕ و ئاراستە سەرەکییەکان تا گومرایان بکەن و بەو شێوەیەش پرۆسەکە ململانێی لێ دەکەوێتەوە.

---

[1] تیا ئاختراو , دروستکراو.

بەسەرهاتی ماستیم هێشتا تەواو نەبووە. با لەوە گەڕێین و هەندێ کارتی تر بخەینە ڕوو.

**کارتی یەکەم**.. کارتی چەکی لێخۆشبوونە، کە قەشەکان بەهەشتیان لەم دنیایەدا بە مەسیحییەکان دەفرۆشت، وێنەی گاڵتەجاڕی (چەك)ەکەشی بەسەرەوەیە، نرخی (٩٠) دۆلاری بەسەرەوە نووسراوە.. ئەگەر درۆمان لەتەکتانا کرد بۆتانی دەگەڕێنینەوە!

**کارتی دووەم و سێیەم**.. بۆ هەمان شتە، ئیسرائیل، یەکەمیان وێنەی سەربازێکی ئیسرائیلی بەسەرەوەیە، وەك پاسەوان وەستاوە و لەبەرامبەریشیدا ئەستێرەی داوود بە ڕەنگی سپی کێشراوە، دووەمیشیان وێنەی دەمەقاڵێیەکی بەسەرەوەیە، سەربازێکی ئیسرائیلی و بەرگریکارێکی فەڵەستینیە، فەڵەستینییەکە ئافرەتێکە بەرد دەگرێتە سەربازە ئیسرائیلییەکە.

**کارتی چوارەم**.. کارتی نەتەوە یەکگرتووەکانە، وێنەی دوو پیاوی بەسەرەوەیە، بەجلوبەرگی فەرمییەوە، هاوار بەسەر یەکدا دەکەن، یەکێکیان ڕەشپێستە و ئەوی تر سپیپێستە.

**کارتی پێنجەم**.. کارتی خەلاتی (نۆبڵ)ی ئاشتییە، وێنەی ژنێکی بەسەرەوەیە پێدەچێت بەدکار بێت، ملوانکەیەکی گەورەشی بە گەردنەوەیە.

**کارتی شەشەم**.. کارتی ڕووسیایە، وێنەی (کرێملین)ی بەسەرەوەیە.

**************

## بەشی یانزەهەم

# خوێن لەسەر خاکی بەڵێنپێدراو

## ١٥٠٠ پاش زایین _ ١٩٤٨ پاش زایین

بە بیرۆکەکانیاندا ڕۆ چووبوو، لەقوڵایی دەریای بیرکردنەوەیاندا کەوتبووە گەڕ. هەندێ لەبیرۆکەکانی بەدەستە نینۆک درێژەکانی چنگکەوت، لەپشت دەمامکە سپییەکەیەوە بەوردی لێی دەڕوانین و بزەیەکی بۆ کرد و دڵنیا بووەوە. لەدوور ڕا دەتبینی و نەتدەزانی کێیە، چۆن بەهزرو بیرکردنەوەیاندا توانی ڕۆبچێت. ئەتەوێت بیناسیت.. ئەوە ماستیم ئەهریمەنی جوولەکەی دەروون ڕەشە، لەناو دەریای بیرکردنەوەی ڕێبازێکی نوێی مەسیحییەتدا مەلەی دەکرد، ڕێبازێك کتوپڕ لە ئەوروپا سەریهەڵدا. ئەوە دوای شاربەدەرکردنی جوولەکەکان بوو. ماستیم ڕۆچووبووە دەریای بیرکردنەوەی ڕێبازی شوێنکەوتوانی پرۆتستانتی.

((جوولەکە منداڵی خودان و تایبەتن، مەسیحییەکان بێگانەن، بێگانەش دەبێت ڕەزامەند بن وەك سەگ کە پاشماوەی بەرەوەبووی سەر خوانی گەورەکانیان بخۆن.))

مارتن لۆسەر martin luther (١٤٨٣-١٥٤٦)

ئـــەو بیرۆکەیـــەی لـــەقوولآیی دەریـــای بیرکردنەوەیانـــدا دۆزییـــەوە، بیرۆکەیەکبوو سەرنجی ئەهریمەنەکانی جوولەکەیدا، بیرۆکەیەك مارتن لوسەر ڕێبازی پرۆتستانتی داهێنا، ئەو پیاوە کەشیشە ڕقی لەدەسەلآتی پاپا بوو، کە لەسەر نیمچە شێوەی خوداوەند خۆی دەردەخست. ڕقی لە فرۆشتنی ئـەو (چـەك)کانەی لێخۆشـبوون بـوو، کـە خـەڵکیان لـە ئـاگری دۆزەخ دوور دەخستەوە و لەبەهەشتیش دۆنمە زەوییان پێدەفرۆشتن. ڕقی لـەزۆر بابـەت دەبـووەوە بـە ئاشـکرا دژیـان دەوەسـتایەوە. بـەم ڕێبـازەی لەجوولەکـە نزیکبووەوە، دژ بەچەوساندنەوە و شاربەدەرکردنیان بوو. گوایە تاوانباری هەتا هەتان، چونکە شەڕیان لەتەك مەسیحییەکاندا کردبوو.

واز لە ئینجیل بێنن، دەستکاریکراوە، کتێبی ڕاست و ڕەوان تـەوراتی جوولەکەیـە، هـەر تەوڕاتـەو هیچی تـر نییـە. هەرچی تـەلموودە نابێت بـە قینەوە بیسووتێنین.

مارتن لۆسەر

دەسـتی لەبیرۆکەیـەکی تـر گـیر کـرد، مـا بـەوردی بـیری لێ بکاتـەوە. بیرۆکەکـەی.. لـەم ڕێبـازە نوێیـەی مەسـیحییەتدا ئـەوەبوو مەسـیحییە کاسـۆلیکەکان تاوانباریـان کـرد، بـەوەی جوولەکەیـەو خـۆی لێیـان شـاردووەتەوە. پـاش ماوەیـەك بیرکردنـەوەی ئـەو پیـاوە بـۆ داهێنـانێکی سەیرتر گوڕا!

((جوولەکە بوونەوەرێکی قێزەونن دەستبەجێ دەبێت لێیان ڕزگار بین، کرمۆکەن، نەفرەتلێکراون.پێویستە هەموو کتێبەکانیان لێ بستێنین و بیانسووتێنین، دەبێت لێرەش شاربەدەر بکرێن.))

مارتن لۆسەر

ماستیم بە سەرسوڕماوییەوە لە بیرۆکەکەی دەڕووانی.. ئەوە ئەو پیاوە نییە پێش کەمێك جوولەکەی خۆش دەویست و لێیان نزیکببووەوە؟!

ماستیم لەبیرکردنەوەی ئەو دۆخەدا بوو، مار سێرپنت بانگی لێوە کرد، لەو بانگکردنە تێگەیشت، ئەگەرچی بیرۆکەکانی ئەم پیاوە دژ بەجوولەکەبوو، وەلێ لەهەمان کاتدا زایۆنیستە. ماستیم.. ما لەدەریای هزری پرۆتستانتییەوە بیر لەو بیرۆکانەی جوولەکە گربخوات، بەهێڵێکی سووری بریقەدار لەناوەندی بیرۆکەکاندا نووسرابوو.

((" نابێت ڕێگری لەچوونی جوولەکە بۆ فەلەستین بکەین، بەڵکو لەسەرمانە هەر پێداویستییەکیشیان بۆ ئەو چوونە هەیە بیاندەینێ، کە توانیان لەفەلەستین دەوڵەتێك بۆ خۆیان درووست بکەن، ئەوا هاتنە خوارەوەی مەسیح عیسا دەرسکێت و جیهان لەچەوساندنەوە ڕزگار دەکات "))

مارتن لۆسەر

## ئەنتیخریستۆس

ئەو بیرۆکەیە لەدایکبوونی دروستی زایۆنیزمە، بەر لەوەی هیرتـزل بێتـە دنیاوە هەبووە، تەنانەت بەر لە لـەدایکبوونی سـاباتکی زەیفیشـدا. ماسـتیم بیرۆکەکەی مارتن لۆسەری وەلاخست، کەوتە گـەڕان بـەدوای بیرۆکەیـەك بـۆ بەرژەوەندیی پرۆتستانتێکی تر، کە دواتر بەناوی (کالڤن)ەوە پەیدا بوو.

"سوو حەرام[1] نییە، بەڵکو حەلاڵە و هیچی تیا نییە"

کالڤن

ئەو بیرۆکەیە بووە هۆکاری ئاسانکردنی هەموو مامەڵـەی جوولەکـەکان، لەمەڕ دارایی و دەسەلاتی ئابوورییان بەسەر هەموو ولاتانی ئەوروپادا. کالڤن بەپەرۆشەوە بوو بۆ بیرۆکەکانی مارتن لۆسەر، بـە بیرۆکەکـەی تـوانی نێـوان کلێسا و میللەت لە ئینگلتـەرا جـودا بکاتـەوە، ئـەوەش بـوو بـەهۆی شـەڕی ناوخۆ و وەك شۆڕشێك هەلگیرسا. کـە پێشـتر لەتـەك مـار سـێرپنت بەسـەر بیندەرەکەوە[2] بینیمان. بینیمان

ماستیمی ئەهریمەن وازی لـەدەریای بیرکردنـەوەی پرۆتسـتانتی هێنـا و تێیدا دەرچوو، ئـەوجا بـەرەو ئاسمـانی ئـەوروپا فـڕی، کـە شـەڕ کـەوتبووە نێـوان شـوێنکەوتووانی ڕێبـازی پرۆتسـتانتی و شـوێنکەوتووانی کاسـۆلیك، شەرەکە شەڕێکی ئایینی بوو. لەو شەڕەشدا زۆری تیاچوو. ولاتانی ئـەوروپا

---

[1] ریبا.

[2] شاشە.

بوون بەدوو بەشی ئایینی ڕێباز جودا، ئەوەی بوو بە کاسۆلیك وەك فرەنسا و ئیتاڵیاو ئیسپانیا، ئەوەیشی بوو بە پرۆتستانتی وەك ئەڵمانیا و ئینگلتەرا.

ماستیم لەو جەنگەدا دەیڕوانییە پرۆتستانتییەکان، کە لەڕێی ئۆقیانووسەوە بەرەو ئەمریکا کۆچیان دەکرد، بۆخۆیان مەزەندەیان وابوو، چون ئەوەی دیمەنی دەرچوونی پیرۆز دووبارە بکەنەوە. ئەو ڕۆژانەیان بیرهاتەوە، کە لەمیسر دەرچوون، دوای ئەوەی فیرعەون دەیویست بەکۆیلەیان بکات، موسا ڕووبارەکەی شەق کرد، تا بیابانی ون (سیناء) بپەڕێنەوە. هەرچی پرۆتستانتی ئەوروپایە لەتاو جەور و ستەمی ئەوروپاییە کاسۆلیکەکان بەرەو خاکی ون هەڵهاتن، کە ئەمریکا بوو، ئەوخاکەیان بەدڵبوو، بوون بە زۆرینە لەو خاکەدا. ڕێبازی پرۆتستانتی ڕێبازی زۆرینەیە لە ئەمریکا.

ماستیم ئەودەم لێیان حاڵی نەبوو کە چی دەگەیەنن، ئەوەی تێگەیشت پرۆتستانتییەکان لەجیهاندا زۆرینە بوون، باوەڕی تەواویشیان بە گەڕانەوەی جوولەکە بوو بۆ فەڵەستین، ئینگلتەرا و ئەمریکاش لەو دەوڵەتانە بوون کە پاڵپشتییان لەو بیرۆکەیە دەکرد.

سێرپنت بەدەم فڕینەوە بەسەر مزگەوتی ئەقسا درکی نەکردبوو ئەوە چی دەگەیەنێت، وەلێ سەردەم حاڵی کرد.جوولەکەکان بەلێشاو بەرەو فەڵەستین کەوتنە کۆچ کردن، ئەوەش دوای ئەوەی کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقی) دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانییان گرتە دەست. ئەوەتا سێرپنت بەسەر کۆشکی مزگەوتەکەوە بەرەو گومەزی بەردینە دەکشێت، بەهێمنییەوە زمانە دوو لەتەکەی دەرهێناوە و کەڵبەکانی بۆ لووشکردنی

شـتێك بـەدەرەوەن. پێدەچـوو مـار سـێرپنت بـەدوایـن وێسـتگەی خـۆی گەیشتبێت، سەرکەوتووانە کارەکـەی بـەجێ گەیانـدبێت، وەك چۆن هـەموو ئەوانی تری پێشووی ئەنجام دابوو.

دوای مردنی هرتزل ماستیم ما بەدوای پیـاوێکی تـرەوە بفرێـت، پیاوێك لەسـەرکردایەتیی زایـۆنیزم جێنشـینی هرتـزل بێـت، کـە دواتـر (حـاییم وایزمان)یان لەجێی دانا. جوولەکەیەکی زانای کیمیا بوو. لەکاتی کۆچکردنی جوولەکەکان لۆرد ڕۆتچیڵد وەك نوێنـەر بۆ فەڵەستینی نـارد، ماسـتیم ئـەو پیاوەی بـەدڵ بـوو، چـونکە پیـاوێکی بەدکار و دەروون ڕەشـبوو. سـەرەتا کۆمپانیای (پەرەپێدانی خـال) لەشـاری (یافـا) دامەزرانـد، بـەو مەبەسـتەی زەویـوزار بەشـێوازێکی ڕێکخـراو لـە فەڵەسـتینییەکان بکرێـت. گـەورەترین مامەڵـەی کڕینـی ڕووبـەرێکی گـەورەی زەویـوزار لـەخێزانێکی لوبنـانی نیشتەجێی ئەورووپا کڕی. وایزمان لەو زەویوزارانەی سەرکەوتووانە دەیکڕین سەربازگەی جوولەکەی تیـا دروسـت دەکـردن، ئـەوجا گرووپێکـی چـەکداری بەناوی (هاشـومێر) دامەزرانـد، ئـەو گرووپـە چـەکدارە شـێوازێکی سـەیریان لەجلوبەرگەکانیاندا هـەبوو، جامانـەی سـپی عارەبانیـان لەسـەر دەنـاو، دوو قایشی ڕەشی لەسـەر شـێوەی (X)یـان بەسـەر سنگیانەوە دەبەسـت. ئـەو چـەکدارانە پاسـی کۆچـەرنشـینانیان دەکـرد. وایزمـان لەفەڵەسـتین دەسـتی بەخۆپیشـاندان کـرد، بـۆ دانپیانـان بـەزمانی (عیبری)یەکـەیان. لەودەمـەی ماستیم بەسـەر شـەقامەکانی فەڵەسـتینەوە دەفـڕی، چاوی بەڕۆژنامەیـەکی فرێـدراوی سـەر شۆسـتەکە کـەوت، بـەناوی (کـەرامل)ەوە، مانشـێتە سـەرەکییەکەی ئاگـادار کردنـەوەی عـەرەب بـوو. کـە دەوڵـەتی جوولەکـە

بەڕێوەیە. ئەوەش خەنجەرێك بوو بەلاقەبرغەی عەرەب چەقاندیان. ماستیم بزەیەکی هات و بەرەو شوێنێکی تر فڕی.

لەپڕ جیهان وورووژا، جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپابوو، بریتانیا و فەرەنسا و رووسیا و ئیتالیا هاوپەیمانێتییان دژ بە ئەڵمانیا دروست کرد، دەوڵەتی عوسمانی نە لەدوور نە لەنزیك پەیوەندیی بەو جەنگەوە نەبوو، وەلێ ئیتیحاد و تەرەقی خەلیفە کارتۆنییەکەی ڕازی کرد پاڵپشتی ئەڵمان بێت، ڕێك چووە هاوپەیمانێتی لەتەك ئەڵمان. جەنگ پەلوپۆی هاویشت. لەو جەنگەدا ماستیم ما بڕوانێتە چارەنووسی دەوڵەتی عوسمانی. دەوڵەتی عوسمانی کۆمەڵێك وڵاتی وەك بەڵقان و سربیا و بولغاریا و یۆنان و چیای ڕەش و قەوقاز لەدەستتدا، هەروەها وڵاتێکی عەرەبیش نەما سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بێت!

ماستیم هەقی خۆی بوو لەقاقای پێکەنین بدات، کە بینی شتێك بەناوی شۆڕشی گەورەی عەرەب بەرپابووە، هیچ کاتێك وایان لێ نەقەوماوە. ئەویش بەوای سەرقاڵی دەوڵەتی عوسمانی بەجەنگی یەکەمی جیهانی بوو. ماستیم زۆر بەپەرۆشەوە بوو، یەکسەر بۆ سەر ڕووداوەکە هەڵفڕی. پاشای حیجاز و شەریفی مەککە (شەریف حوسێن) لەتەك باڵیۆزی بریتانیا (مکماهۆن) لەمیسر کەوتە نامە گۆڕینەوە. بریتانیا کە داوای لەعەرەب کردبوو لەتەکیاندا بچنە جەنگی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی، بەو ئاوایەش پەیمانی وێدان لەبیابانی عەرەبی و شام و عێراق دەوڵەتێکی گەورەیان بۆ دروست بکات و شەریف حوسێن بەخەلیفەی مەزن بۆ ئەو دەوڵەتە دامەزرێنن،

بەمەرجێك لوبنان و فەڵەستین ناگرێتەوە. شەریف حوسێن ڕەزامەندی خۆی نواند و ئاوری[1] جەنگ بەرپابوو.

کاتێ دەوڵەتی عوسمانی جەنگی دژ بە ڕووس و ئینگلیز و فڕەنسا و ئیتاڵیا دەکرد، خەنجەرێك لەپشتییان چەقی. خەنجەرێکی عارەبی بوو، بەبان مشتۆی (دەمی تیژەکەی) خەنجەرەکەوە ناوی شەریف حوسێن نووسرابوو. ماستیم لەخۆشییا کەوتە چەپڵەلێدان، بۆ ئەو دەستەی ئەو خەنجەرەی وەشاند.

ماستیم بارودۆخی شۆڕشی عەرەبی جێهێشت و بەرەو شوێنێکیتر فڕی. کۆبوونەوەیەکی نهێنیی نێوان ئینگلتەرا و فڕەنسا بوو، ڕێککەوتننامەیەك بۆ کاروباری ڕۆژهەڵات بەناوی (سایکس بیکۆ)وە لەنێوانیاندا واژۆ کرد، باڵیۆزی ئینگلیز سایکس بوو، باڵیۆزی فڕەنساش بیکۆ بوو، بەو ڕێککەوتنە کێکەکەیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد. مەبەست لەدابەشکردنەکەش، دابەشکردنی وڵاتە عەرەبییەکانە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی، بریتانیا عێڕاق و ئوردون ببات، فڕەنساش سووریاو لوبنان و فەڵەستین ببات.. بەو ئاوایە بریتانیا و فڕەنسا ویستیان کێکەکەی دەوڵەتی عوسمانی بۆ خۆیان بخۆن، کە بڕیاربوو بەشی (شەریف حوسێن)یشی لێبدەن. ماستیمیش ما پرسیار لەبەشە کێکەکەی جوولەکە بکات، کە فەڵەستین بوو.

لە ڕۆژنامەی بەیانیان شەریف حوسێن چاوی بەو هەواڵە کەوت، کە بریتانیاو فڕەنسا لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا کێکەکەیان بۆ خۆیان دابەشکردووە، ئەوە دوای ئەوەی ڕووسەکان توانیان ئەو هەواڵەی دەستیان

---

[1] ئاگر.

کەوتبوو بڵاوی بکەنەوە. پاشای حیجاز بەو هەواڵە نیگەرانبوو، وەلێ بریتانیا زۆر بەئاسانی ئەو نیگەرییانەی چارەسەر کرد، پێی گوت.. بڕوا بە ڕۆژنامەکان نەکات، ئەوە قسەی ڕۆژنامەکانە.. هیچ دانوستاندنێکمان نەکردووە، ئێمە لەسەر پەیمان و ڕێککەوتنی خۆمانین، بەم قسانە دڵنیابوو و خەونی بەمەوە دەدیت, پادشای عەرەبان بیت!

ماستیم بۆ دڵنیابوون لەجوولەکەکان بەردەوام بەبان سەریانەوە دەفڕی. جوولەکەکان لە کڕینی زەویوزار نەکەوتن." ئەی جوولەکەکان.. دواجار بەشێك لەفەلەستینتان بۆ بوو، دوای دەربەدەری و ئەشکەنجەو ڕیسوایی وا خۆتان کۆ دەکەنەوە، بەردەوام بن"

ماستیم گوێی لەسازدانی ئاهەنگێك بوولە بریتانیا، ئاهەنگێکی گەورە بوو، خۆی بە ئاهەنگەکە گەیاند، جوولەکەکان ئاهەنگیان دەگێڕا. نەیدەزانی ئاهەنگ بۆچی دەگێڕن، وەلێ چاوی بە گەورەترین بیرمەندەکانی زایۆن کەوت، حاییم وایزمان و سایکس ڕۆتچیلد و کەسانێکی زۆرتر. بەهۆی هەولێکی خۆشەوە ئاهەنگیان دەگێڕا.. بەر لەچەند ڕۆژێك بریتانیا پەیماننامەیەکی بڵاوکردەوە، پەیمانی بەجوولەکە دا دەوڵەتێکی سەربەخۆیان لەفەلەستین بۆ دامەزرێنێت، ئەوەش پەیمانی (بلفۆر)بوو. ئێدی دڵی هەموو جوولەکەکان بەو پەیمانە خۆشبوو، ماستیمیش دڵی بەو پەیمانە کرایەوە.

پەیمانێکی فەرمی نەبوو، بەڵکو نامەیەکبوو لەوەزیری دەرەوەی بریتانیا بۆ لۆرد ڕۆتچیڵدی ناردبوو. ماستیم پەرۆشی ئەو نامەیە بوو بۆ

خوێندنەوەی، بەرەو نامەکە فڕی، کەوتە خوێندنەوەی، کە بەم شێوەیە نووسرابوو....

وەزارەتی دەرەوە

دووی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧

بەڕێز لۆرد ڕۆتچیڵدی ئازیز..

خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم لەبری حکومەتی بریتانیا ئەم هەواڵەتان پێڕابگەێنم، کە پەیوەستە بەو سۆزەتان لەمەڕ جوولەکە و زایۆنیزمەوە، ئەم هەواڵە وەزارت دانیپێناوە.

حکومەتی بەچاوی سۆزەوە دەڕوانێتە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە لەفەڵەستین دا، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە هەوڵی بێ وچان دەدات، بەو مەرجەی کەمکردنەوە نەبێت لەمافی خەڵکی سڤیل میللەتان و ئایینەکانی تر. ئەو مافە سیاسیەش نا جوولەکەکان لەوڵاتانی تردا هەیانە، سوپاسگوزارتان دەبم، ئەگەر ئاگاداری یەکێتیی زایۆنی بکەنەوە.

دڵسۆزتان

ئارسەر جیمس بلفۆڕ

خاکێك تۆ خاوەنی نەبیت و بیدەیت بەمیللەتێك کە هەر شایانیشی نییە. ئەوە ئەو پەیمانەبوو، ماستیم خوێندبوویەوە. دوای هەفتەیەك ماستیم نامەیەکی نهێنی تری پێگەیشت، لەلایەن یەکەم جوولەکەوەبوو کە کرابوو بە وەزیر لەبریتانیا و بۆ سەرۆك وەزیرانی بریتانیای بەرز کردبووەوە.

" حاڵی حازر کاتێکی نەگونجاوە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ جوولەکە دروست بکرێت، بۆیە پێویستە فەڵەستین لە دوای جەنگ بدرێتە بریتانیا، تا ئاسانکاری لە کڕینی زەویوزاردا بکرێت، نشینگەی جوولەکەکان ڕێکبخرێت، بەتایبەت ئەوانەی بەرەو فەڵەستین کۆچ دەکەن، بەوشێوەیە بتوانین چوار ملیۆن جوولەکەی ئەوروپا بەرەو فەڵەستین بگەڕێنینەوەفەرەنس"[1]

نامەیەکی ماقووڵ بوو، بەهەموو بنەماکانییەوە جێ بەجێکرا. بریتانیا داوای لەفرەنسا کرد پەیمانەکەی سایکس بیکۆ ڕێکبخرێتەوە، فەڵەستین بدرێت بە بریتانیا لەبری ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی نێو دەوڵەتیدا بێت. پەیمانەکە بەڕەزامەندی فرەنسا ڕێکخرایەوە، بریتانیا بۆ داگیرکردنی فەڵەستین سوپای ئامادەکرد. سوپای عوسمانی لەفەڵەستین نزیکەی سەد هەزار چەکدار دەبوو، ئەوەی سەرپەرشتیاری سوپاکەی دەکرد، پیاوێکبوو لە ئیتیحاد و تەرەقی ناوی مستەفا کەمال ئەتاتورك بوو، فەرمانی لەسەرکردایەتیی ئیتیحاد و تەرەقییەوە بۆ هات، بەهەموو سەربازەکانییەوە فەڵەستین جێبهێڵێت. ئەتاتورك بە سەدهەزار سەربازەوە لەفەڵەستین کشایەوە. ماستیم لەئاسمانەوە تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد، کە حەوت سەدەیە نەیبینیوەتەوە!

---

[1] لەناو موحەممەدیان نیشتەجێ بکەین.

سوپای بریتانیا بەرەو فەڵەستین بەڕێوەبوو، سەرکردەی ئەو سوپایە ژەنەراڵ (لینبی)بوو. لەشکرێکی مەشق پێکراوی جوولەکەش هاوشانی بوون. کەسانێکی تێدابوو ڕووخسار ناشرین، تەنانەت (ماستیم)یش نەیدەناسینەوە، وەڵێ مێژوو لەبیری نەکردوون، یەکیان پیاوێکی لەناوەڕاستی سەری کەچەڵ هەردوو لای سەری قژی پێوە ماوە، بەناوی( داڤید بن گوریۆن) و یەکێ تریش بەناوی (مەنحمیا ڕابین) کە باوکی (ئیسحاق ڕابین) بوو.

ژەنەراڵ لینبی بەخۆشحاڵییەوە لەگەڵ سەربازەکانی بەنێو خەڵکی فەڵەستیندا تێدەپەڕین، خەڵکی بێ ئاگابوون لەوەی چ ڕوودەدات، سوپای دەوڵەتی عوسمانی بۆ کوێ چوو, کەس نەیدەزانی؟ وەڵێ بەهاتنی سوپای بریتانیا خۆشحاڵ بوون، بەلای ئەوانەوە بریتانییەکان چون فریشتە وابوون، لە وڵاتی خۆیانەوە هاتوون یارمەتی فەڵەستینییەکان بۆ سەربەخۆیی بدەن، بۆ دابڕانیان لەدەوڵەتی عوسمانیی لەخۆبایی. ئەوە بیرۆکەی تەنها خەڵکەکە نەبوو، تەنانەت بیرۆکەی ئاغاو سەرۆک خێڵ و زانا و بیرمەندەکانیش بوو، تەنانەت موفتی فەڵەستینیش هاوڕایانبوو. ماستیم گوێی لەژەنەراڵ لینبی بوو، گوتی:

– ئەمڕۆ کۆتاییمان بە جەنگی خاچپەرستان هێنا.

مار سێرپنت لەوێ نەبوو، بەرەو ڕووسیا فەڵەستینی جێهێشتبوو. حکومەتی قەیسەری ڕووسیا کەوتبووە وێزەی جوولەکەکانی وڵاتەکەی. جارێك نوێنەری جوولەکەکان چووبوو بۆ لای وەزیری دارایی ڕووسیا، پێی

ڕاگەیانـدبوو هـەموو جوولەکـەکان لەوڵاتەکـەی لـەناو بـدات[1] و ڕەوانـەی فەڵەستینیان بکاتەوە. وەزیر پێی گوتبوو:

– ڕاست دەکەیت، ئێمـەش دەمانـەوێت لـەکۆڵمان ببنـەوە، وەلێ نـەك بەناردنیان بۆ فەڵەستین ، بەڵکو فڕێیان دەینە دەریای ڕەشەوە تا بخنکێن!

دەبوو بەهـەچ شـێوەیەك بێـت ئـەو ژمـارە زۆرەی جوولەکـەکان بـەرەو فەڵەستین کـۆچ بکـەن. مـار سـێرپنت بەهـەموو ڕووسـیادا گـەڕا، تـا ئـاگری شۆڕشـی تیـا هەڵگیرسـاند. شۆڕشـێك ئەگـەر بمانـەوێت بەسـەرهاتەکانی بنووسینەوە کتێبێکی قەبارە گەورەی دەوێت، لەو فێڵ و دەروون ڕەشییەی جوولەکە دوای ئەوەی چەوساوە بووە کە بەدەسەڵاتی ڕووسیایان گەیانـد، هـیچ شـوێنێکی جیهـان فێڵـی وای تیـا نـەکراوە، تـەنها ئـەو شـوێنانەی مـار سێرپنت ئاژاوەی تیا ناوەتـەوە. شۆڕشـی ڕووسـیا بـەرپا بـوو، شـوعییەکان دەسـەڵاتیان گرتەدەسـت، حکومەتـە نوێیەکـەی ڕووسـیا زۆربـەی زۆری جوولەکـە بـوون، یەکـەم بڕیـارێکیش لەحکومەتـەوە دەرچـوو، گەڕانـەوەی جوولەکەکان بوو بۆ فەڵەستین (خاکی بەڵێنپێدراو).

شەریف حوسێن زۆر توڕە بوو، بریتانیا لێی حاڵی بوو، هەر زوو دواندی و ئارامی کردەوە، حـوکمی عێڕاقـی ڕادەسـتی کوڕەکـەی کـرد، ئەردەنیشـی بەکوڕەکەی تری حوسێن دا. ما ماستیم چاودێری جوولەکـەکانی فەڵەسـتین بکات، ئەوەش دوای ئەوەی بریتانیا فەڵەستینی داگیرکـرد، زمـانی (عیـبری) بـوو بـەزمانێکی فـەرمی ، وێسـتگەی تایبـەتیی کارەباشـیان دامەزرانـد، وەزارەتـی ئـاو ئـاوەدانی و وەزارەتـی کارەکـان (ئەشـغال) بەجوولەکـە درا،

---

[1] لەناوببات.

ئابووری ناسان و بازرگان و دەوڵەمەندەکانی جوو هاتنە ئاراوە، کۆمپانیایان دانا، خەڵکی فەڵەستین بەکرێکار لەکۆمپانیاکان دامەزران، وەلێ دوای کۆچڕەوی گەورەی جوولەکەکانی ڕووسیا بۆ فەڵەستین، فەڵەستینییەکان هەستیان بەترس کرد، لەوبەریشەوە جەنگی درۆزنەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و یۆنان دەستی پێکرد. پاڵەوانێکی درۆزنانەیان لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا داهێنا. (مستەفا کەمال ئەتاتۆرك) ئەو پاڵەوانە درۆزنەبوو، ئەحمەد شەوقی شاعیریش بەشۆخییەوە هۆنراوەی بەسەرا هەڵداوە.

(الله اکبر) کم فی الفتح من عجب ..... یاخالد الترك جدد خالد العرب.

ئەی خودای گەورە چەند لەفەتحا سەیر هەن

ئەی خالیدی توورکان خالیدی[1] عەرەبان زیندووبکەوە

ئیدی لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەسەر ئەو پاڵەوانە درۆزنە هەڵدەدرا، تا ئەو ڕۆژە هات و بوو بەسەرۆك و بانگەشەی ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانی جاڕدا. هەر کەدەسەلاتی گرتەدەست، ماستیم سەری لێ سوڕما، لەو هەموو گۆڕانکارییانەی لەولاتدا کردی، ئەتاتۆرك بەپێی دەستووری تورکیای نوێ وشەی ئیسلامی کوێرکردەوەو دەوڵەتێکی عیلمانی ڕاگەیاند، چارشێوی ژنانی قەدەغە کرد، هەردوو جەژنەکەی یاساغ کرد، بۆ چەندین ساڵ فەرزی حەجی هەڵگرت، زۆربەی زۆری مزگەوتەکانی داخست، مزگەوتی (ئایە سۆفیا)ی کرد بەکڵێسە، بانگدان بەزمانی عەرەبی قەدەغە کرا و دەبوو بەتورکی بێت، پۆستی موفتی هەڵگرت، زیاتر لە سەدو پەنجا زانای ئایینی

---

[1] خالیدی کوڕی وەلید.

ئیسلامی لەسێدارە دا، جەختی لەمەلاکان کرد لەبری مێزەر شەپقە لەسەر بکەن، نێر و مێی لەمیراتا بەرامبەر یەك کرد، دواین وەسیەتی خۆشی کرد، کەمرد نوێژی بەسەرا نەکەن. بەدەر لەوەی ئەو هەموو بابەتە دڵی ماستیمی خۆشکردبوو، وەڵێ سەرسوڕمانییەکەی هی شتێکی تر بوو، کاتێ سێرپنت بەماستیمی ڕاگەیاندبوو، بەخێوکەری (مستەفا کەمال) جوولەکە بووە.

ئەحمەد شەوقی شاعیر هۆنراوەیەکی دوور و درێژی بەو بۆنەوە نووسی، دابەزییە سەر ئەتاتۆرك :

نوێژ گریا.. بێ شەرمانە دووزمانی گێڕا    شەرعی قیزەونی دا هیچ و پووچ

پڕوپاگەندەی لەگومڕاییدا داهێنا    بەئاشکرای کرد کوفر

ناتوانیت هەموو کاتێك خەڵکی هەڵخەڵەتێنیت، موفتی فەلەستین و زانایان کە پشتگیرییان لەبریتانیا دەکرد، بەڕێپێوانێکی ئاشتییانە هاتنە سەر شەقام، وەڵێ ماستیم لەوێ نەبوو، بەسەر خۆپیشاندانێکی ترەوە بوو، خۆپیشاندانی زۆربەی جوولەکەکان کە لەسیلەی لادیواری (بوراق)دا بوون و بەسروودی هیوا (هاتیکفا) داوای بیناکردنەوەی (نزرگای) سولێمانیان دەکرد،

مادام لەدڵایە

نەفسێکی جولەکەی

تامەزرۆ

بۆ پێشەوە

گەشەی ڕۆژ هەڵات

## ئەنتیخریستۆس

چاوێك تەماشای زایۆن دەكات
هێشتا ئومێدمان هەیە
هیوایەك دوو هەزار ساڵە
وڵاتی زایۆن و نۆشە (قودس)
ببینە گەلێكی سەربەخۆ

ڕۆژی دواتر و دوای نوێژی هەینی، ماستیم بۆ بینینی ڕووداوێكی سەیر بەرەو مزگەوتی ئەقسا فڕی، جەماوەرێكی زۆری جوولەكە و موسوڵمانان بەرامبەر یەكیان گرتبوو، دواتر تێكهەڵگژان و بوو بەشەڕیان، سوپای بریتانیا چووە نێوانیانەوە، قرمە قرمی فیشەك تەنها بەسەر موسوڵمانە سڤیلەكانەوە بوو، خوێنێكی زۆر ڕژا. ماستیم بەسەر ئەو ڕووداوەوە بەرەو شوێنێكی تر فڕی و دیاربوو كارەساتێكی بەدی كردبێت.

شۆڕشێكی گەورە بەرپابوو شۆڕشی بوڕاق، فەڵەستینییەكان شەش ناوچەی نشینگەی جوولەكەكانیان وێران كردبوو.ئیدی شۆڕشەكە پەلی بەهەموو فەڵەستینا كێشا، هەموو ڕاگەیاندنەكانی جیهان هەواڵی كوشتارگەی جوولەكەكانیان بەدەست فەڵەستینە تیرۆریستەكان بڵاو كردەوە، نۆسەد فەڵەستینی دەستگیر كران، سێ لە گرنگترین گیراوەكان لەسێدارە دران. شۆڕشەكە ساڵێكی خایاند، كۆچی جوولەكە كەم كرایەوە. لادیواری بوڕاقیش بوو بەموڵكی موسوڵمانەكان و هیچ مافێكی جوولەكەی بەسەرەوە نەما.

دیواری بوڕاق ئەمڕۆ بەناوی (مەبكا) ناودێری دەكەن، هی جوولەكەیەو مافی موسوڵمانەكانی پێوە نییە، ئەو دیوارەیە مزگەوتی ئەقسا و لای ڕۆژاوا

لێك دادەبڕێت، هەر ئەو دیوارەشە کە محەمەد بەر لەوەی بەرەو ئاسمان بڕوات بوراقەکەی لەبازنەیەکیدا بەستەوە. هەرچی جوولەکەیە وایدادەنێن، کە تەنیا دیوارێکە لە هەیکەلی (نزرگای سولێمان)ەوە ماوەتەوە لەلای ئەم دیوارەوە دەگرێن بۆ نەمانی هەیکەل.

واپێدەچوو شۆڕش ئارام بووبێتەوە، ئەوەی بریتانیا پێی خۆشبوو لەکوشتن و بڕین کەمیکردبوو. ماستیم لەشوێنێکی سەیر بەحەواوە[1] بوو، مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی(حەیفا) گردبوونەوەیەکی زۆری لەخۆ گرتبوو، لەدەرەوە گوێت لە وتاری مزگەوتەکە دەبوو، مەلا هاواری دەکرد و دەیگوت:

– خوای مەزن دەفەرموێت.. بۆ شەڕ لەتەك قەومێك ناکەن باوەڕیان بەخودا نەماوەو هەولّی دەرکردنی پێغەمبەریان داوە، هەر ئەوانیش دەستپێشخەری شەڕ بوون، لێیان مەترسن، ترستان تەنها لەخودا بێت، ئێوە موسولّمانن.

دوا ڕستەکەی سێ جاران دووبارە کردەوەو دەنگی گەرموگوڕیی پێوە دیاربوو.

– ئەی خەلّکینە.. هەرچی پەیوەستبوو بە ئایینەکەتان فێرم کردن تا بوون بەزانا، ئەوەشی پەیوەستە بەخاکەکەتان ئەوە کاتی جیهادتانە، خودایە من پەیامەکەم گەیاند، تۆ ئاگاداری. ئەی موسولّمانان کاتی جیهادە، جیهاد لەپێناوی خودا.

---

[1] ئاسمان.

مزگەوتەکە لە گریان و هاواریان دەنگی دەدایەوە. ئەو وتاربێژە (عیزەدین قەسام)بوو. خەڵکی سووریایەو پێشتر لەدژ بەداگیرکاریی فەرەنسا بکات پێشڕەوی خەڵکی سووریای کرد، دواتر بەرەو فەڵەستین کۆچی کرد، دژ بەداگیرکاریی بریتانیا پێشڕەوی خەڵکی فەڵەستین بکات. دوای ئەو وتارە دەسەلات کەوتە وێزەیان، چون ئەوەی ئەو تیرۆریست بن. قەسام لێل کۆمەڵێك چەکدار بەرەو چیاکان هەڵکشا. ماستیم بەسەر چیاکانەوە بەدووی قەسام دەگەڕا، دواتر شەڕ لەنێوان چەکدارەکانی قەسام و سەربازانی بریتانیا دەستی پێکرد، ئینگلیزەکان کۆمەڵێك پۆلیسی عارەبیشیان لەتەکا بوو. سەرکردەی عارەبەکان هاواری لێیان کرد:

– عیزەددین تۆ گەمارۆ دراویت، خۆت ڕادەستمان بکە، تۆ ناتوانی بەربەرەکانی بکەی, تۆ ناتوانی بەرامبەر ئینگلیز بوەستی.

عیزەددین وەلامی دایەوە

– نا.. ئێمە لە پێگەیەکداین تۆ شارەزا نی لێی، ئێمە لەجیهادین، ئەو کەسەی بگاتە ئەم پێگەیە, ناکرێت و دەبێ تەنیا خۆی بەخودا بسپێرێ.

ماستیم بە پەرۆشەوە سۆسەی شەڕەکەی لەهەردوو لا دەکرد، شەڕەکە دوو کاتژمێری خایاند. فرۆکەی ئینگلیزی بنکەکانی بۆمب باران کردن، قەسام کوژرا. ئەو پیاوە گەورەترین شۆڕشی بەناوی شۆڕشی فەڵەستینەوە بەرپا کرد. دووکەڵ لە دەمامکەکەی ماستیمەوە دەردەچوو.

ئەو شۆڕشە تەنها شۆڕش نەبوو، بەڵکو تەقینەوەیەك بوو بە ڕووی کافران. ڕەنگە لەمێژوودا بەهێزترین مانگرتن شۆڕشی فەڵەستین بێت،

ئینگلیز بەهەموو توانای لۆجیستییانەوە کەوتە ویزەی موسوڵمانەکان، بەوەشەوە نەوەستان، بە فرۆکە گەڕەکەکانی بۆردومان دەکردن، بەبیانووی ئەوەی شۆڕشگێڕەکان لەناو گەڕەکەکاندا خۆیان حەشار داوە. شۆڕشەکە سێ ساڵی خایاند، زیاتر لە دەهەزار کاری خۆفیداکاری بەرێژەی نۆ کاری خۆفیداکاری لەڕۆژێکدا تێدا ئەنجام درا. ماستیم لەکاتی نوێژی جەژندا بەسەر مزگەوتەکاندا دەسووڕایەوە. دوای تەواوبوونی نوێژی جەژن، هێزەکانی ئینگلیز کەوتنە دەستگیر کردنی نوێژکەران، خەڵکێکی زۆریان لێ گرتن. ماستیم بەدوویانەوە بوو، تا ئینگلیزەکان لەشوێنێکی داخراودا لەزیندانی نان بەناوی (concentration camps) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەرگایان لەسەریان نەکردنەوە. لەبەر ئەوەی سەراویان نەبوو، میز و پیساییان بەخۆیانا کردبوو، هەندێکیشیان لەتاو توینێتی و برسێتی توشی ئازارو مەینەتی بوون, ڕووخساری ماستیم ڕق و قینی لێ دەباری.

ماستیم هەستی کرد جیهان ئارام نییە، جەنگی دووەمی جیهانی بەرەو گرگرتن دەچێت. هاوپەیمانێتییەکەی بریتانیا و فەرەنسا و ڕووسیا هەر مابوو، وەلێ ئەمجارەیان ئەمریکاش چووە پاڵیان. لایەنی دووەم ئەڵمانیا بوو، ژاپۆنیش چووە پاڵ ئەڵمانەکان. لەمێژوودا ئەوە گەورەترین جەنگ بوو لەمێژوودا، جەنگێك پەنجا ملیۆن کەسی تیاچوو. ئەوەی بەلای ماستیمەوە گرنگ بوو، لە ئەڵمانیا بەتایبەتی و لەئەوروپا بەگشتی جوولەکە بە ڕێژەیەکی زۆر بە بیانووی هەڵهاتن لە جەوروستەمی هیتلەر کە دەیویست لەسەر گۆی زەوی قڕیان تێبخات بەرەو فەڵەستین کەوتنە کۆچکردن. ئیدی بەکەشتی بەرەو کەنارەکانی فەڵەستین کۆچیان کرد، وایاندەزانی هەر

جوولەکەیەك نان و ئاو و خانووی پێدەدەن، مەزەندەکەیان ڕاست دەرچوو، زۆریش ڕاست.

بەر لەجەنگی دووەمی جیهانی ئەو دەستەیەی لەهەموو ولاتاندا نوێنەری هەبوو پێیان دەگوتن (کۆمەڵەی میللەتان) هەر ئەو دەستەیە بوو مۆڵەتی ئینتیدابی بەبریتانیا دابوو، بچتە فەڵەستین و داگیری بکات. دوای جەنگی دووەمی جیهانی ناوەکەیان گۆڕی و ناوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان لێنا، ئەو دەستەیەش واتە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی فەڵەستین، دەبوو فەڵەستین لەژێر دەسەڵاتی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بێت.. فەڵەستین نە هی جوولەکەیە، نە هی عەرەب. جوولەکەکان بەڕووی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هەڵچوون، وایان لێکرد لەبڕیارەکەی پەژیوان ببێتەوە و بڕیارێکی تر دەربکات و فەڵەستین بکرێت بەدوو دەوڵەت، دەوڵەتێکی عەرەبی و ئەوی دی جوولەکە. دوای جێ بەجێکردنی ئەو بڕیارەش بۆ دەرپەڕاندنی بریتانیا لەفەڵەستین پەلە بکرێت.

ئەودەم جوولەکە تیپی سەربازیی زۆریان هەبوو، تیپی ئەریگۆم و شتێرن و هاجان و پاڵماخ، کە هەر هەموویان تیپی مەشقپێکراو بوون. ئەگەرچی ئەو تیپانە لێل ئیگلیزەکان لەچەوساندنەوەی فەڵەستینییەکاندا بوون، وەلێ دوای ئەو بڕیارەی دەرپەڕاندنی سوپای ئینگلیز، تیپەکان بۆ ئاژاوە بەناوی تیرۆریستییەوە کەوتنە کوشتنی سەربازە ئینگلیزەکان، تا عەرەبی پێ بلەوتێنن[1]. تەقینەوەو کوشتن و بڕین دەستی پێکرد، تا سەرکردەی تیپی ئەریگۆنیان دەستگیر کرد، کە ناوی (مەناحیم بێگن) بوو و

---

[1] تاوانبار بکەن.

بەتیرۆریست لەقەڵەمیاندا. ئەوەی ماستیمی خستە پێکەنین، هەر ئەو پیاوە بوو، کە بەناوی تیرۆریست لەزیندان نرا، وەلێ دوای سێ ساڵ هەر ئەو تیرۆریستە خەڵاتی (نۆبڵ)ی ئاشتییان بەهاوبەشی لەتەك ئەنور سادات وێدا!

بریتانیا پێشنیارێکی بۆ سەرۆك وەزیرانی میسر (مستەفا ئەلنەحاس) کرد، دەستەیەك بەناوی ( کۆمەڵەی دەوڵەتانی عەرەب) پێکبهێنێت، لەهەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان پێکهاتبێت، تا ڕا و بۆچوونی خۆیان دەربڕن، بەو مەرجەی فەڵەستینی تێدا نەبێت دوای ئەوەی شەقێکیان لەفەڵەستین هەڵدا، عەرەب ئەو کۆمەڵەیان پێکهێنا. ماستیم کەمتر بیری دەکردەوە. ئەو کۆمەڵەیە حەوت دەوڵەتی لەخۆ گرتبوو، شەشیان لەژێر داگیرکاریی ئینگلیزدا بوون، بەو ئاوایە هیچ سوودێکی نابێت، تەنها بریتانیا سوودمەند دەبێت، بەوەی بەناوی عەرەبەوە ئەو هەلە بقۆزێتەوە. ماستیم دەستی بەخەنینەوەی خۆی کرد.

ماستیمی دەمامك شەقار شەقار[1] بەرەو بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان فڕی، کۆبوونەوەیەکی زۆر گرنگ هەبوو، خۆی بەکۆبوونەوەکەدا کرد. قسەکەرەکە جوولەکەبوو:

- کاتێ باس لەدەوڵەتێکی جوولەکە دەکەین، هیچ نییەتێکی خەراپمان نییە، کە دەوڵەتێکی ڕەگەزپەرست و ئایینگەرا بێن، بەڵکو دەوڵەتێك لەیەکسانی و پاراستنی و مافی دانیشتوان و بێ جیاوای ڕەچاوی ئایین و فرەڕەگەزی بکات، واتا دەوڵەتێکی سەرکوتکەر نەبین.

---

[1] درز ، قلّیشاو.

دوای ئەوەی جوولەکە لەسەدا پێنجی خاکی فەڵەستینیان بەدەستەوە بوو، پاش ئەو کۆبوونەوەیە نیوەی خاکی فەڵەستینیان داگیر کرد. ئەو کۆبوونەوەیە درێژە پێدەری ئەو کۆبوونەوەیەبوو، کە فەڵەستین بۆ دوو لەت دابەش بکرێت، نیوەی بۆ عەرەب و نیوەکەی تریش بۆ جوولەکە بێت، قودسیش نە بۆ ئەمیان و نەیش بۆ ئەویان بێت، بەڵکو ناوچەیەکی نێودەوڵەتی بێت. هەموو ئەو فەڵەستینییانەش کە لەبەشی جوولەکە نیشتەجێن بگوێزرێنەوە بۆ بەشی فەڵەستینییەکان. دواجار لیژنەکەش لە ١٥ی مایۆی ١٩٤٨ بڕیاری دەرچوونی بریتانیای دا، واتە دوای شەش مانگ لەبەرواری کۆبوونەوەکە.

بەپێی بڕیارەکە فەڵەستینییەکان لەبەشی جوولەکەکان بۆ ناو فەڵەستین گوێزرانەوە. ما ماستیم بەسەر ئاواییەکانەوە بفرێت و سۆسەی کۆچکردنەکە بکات. هێزی (هاجان) خۆیان بەئاوایی (قەستڵ)دا کرد، شوێنی ئاواییەکە باشترین شوێن بوو بۆ پاراستنی قودس، هێزەکە هەر هەموو ئاواییەکەیان بەخەڵکەکە پێ چۆڵکردن. ماستیم چاوی بەتیپێکی چەکداری خەباتگێڕی فەڵەستینییەکان کەوت، کە زۆر ڕێکوپێك دیاربوو، ئەو تیپە هێزی جیهادی قودس بوو، ئەو هێزەش کاتێك دامەزرا، کە فەڵەستینییەکان لەهەموو لایەکەوە کۆبوونەوە و بڕیاریاندا هەر هەموو هێزەکان یەکبخرێن و بەرگری لە فەڵەستین بکەن. سەرکردەی ئەو هێزە (عەبدولقادر ئەلحوسەینی)بوو. ماستیم بەچاوی خۆی بینی پێشڕەویی هێزەکەی دەکرد و ئاوایی بەرەو قەستڵ دەڕۆیشتن.

لەنێوان حوسەینی و کۆمەڵەی دەوڵەتانی عەرەب هەڤپەیڤینێکی مێژوویی کرا:

– من بۆ ئازادکردنی قەستڵ دەچم، ئەگەر سوور زانیومە کە دەکوژرێم بەخەباتگێڕەکانەوە ئازادی دەکەین، تەنها لەو چەکانەی لەگەنجینەکانتان شاردووتانەوە[1] چەکمان پێبدەن.

– پەیمانمان بە لیژنەی سەربازی داوە، ئەوان دوای ١٥ی مایۆ[2] ئەو کێشەیە چارەسەر دەکەن.

– ئەگەر ئێوە تا ١٥ی مایۆ چاوەڕوان بن، ئەوا دەئەوەندەی ترمان دەوێت کە ئێستا داوای دەکەین.

– ئێمە هاوکاریی چالاکی تاك ناکەین.

– ئەو چەکانەی لەزبڵدان شاردووتانەوە بە ئێمە ڕەوایە. بیرتان نەچێت بەلەدەستدانی فەلەستین مێژوو تاوانبارتان دەکات، ئەوەشتان بیر بێت مێژوو باوکی خۆی ناناسێت، منیش بەر لەوەی کەمتەرخەمییەکانتان ببینم لە قەستڵ دەکوژرێم.

– بەسە قسەی هەلەقوبەلەق، ئێمە چەکمان هەیە و ناتدەینێ، چاوەڕێی ١٥ی مایۆ دەکەین.

– ئێوە خیانەت لەفەلەستین دەکەن، دەتانەوێ بکوژرێین، سەرمان ببڕن.

[1] کۆگە کراوە.

[2] مایس.

ماستیم حوسەینی لەتەك كۆمەڵێك چەكداردا بینی چوونە (قەستڵ)ەوە، دواتر لەلایەن هێزی هاجانەوە گەمارۆ دران، شەڕێكی سەخت بەرپا بوو. كاتی خۆراوا لاشەی حوسەینی لەسیلەی[1] خانوویەكی قەستڵەوە بەكوژراوی فڕێ درابوو.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ماستیم بەسەر ئاواییەكی نزیك ئاوایی قەستڵ دەفڕی، ئەویش ئاوایی ( دێر یاسین)بوو. لەسێ لاوە هێزەكانی ئیرگۆن و شتێرن پەلاماریانداندان، سەرەتا بە بڵندگۆ داوایان لەخەڵكی ئاواییەكە كرد دێیەكە چۆڵ بكەن. لەپڕ لەنێو خانووەكانەوە دەستڕێژی لە هێزەكانی جوولەكەكان كرا. ماستیم بەرەو شوێنی تەقەكردنەكە فڕی، كۆمەڵێك گەنجی بەچەكەوە بینی، بۆ پاراستنی ماڵ و سامانیان خۆیان بۆ هێزی دوژمن مەلاس دابوو، هێزی دوژمن دەستی نەپاراست و بەهەموو جۆرە چەكێكی قورس كەوتە بۆردوومانكردن و بەژمارەیەكی زۆرەوەش هێرشیان بۆ ناو ئاواییەكە برد. قێزەونترین كوشتاریان لە دێر یاسین كرد. سەركردەكەیان مەناحیم بیگن بوو. ماستیم سەربازەكانی بینی بەچەكی قورس بەربوونەتە گیان خەڵكی سڤیلی ئاواییەكە، دەستیان نە لەمنداڵ پاراست نە لەژن و پیرو پەككەوتەكانیش، تەنانەت نارنجۆكیان دەهاویشتە ناو خانووەكان، ئەوانەی لەپشت سندوق و كارتۆر خۆیان شاربۆوە پارچە پارچە دەبوون، داروبەردیان بەسەر خەڵكەكە ڕوخاند.

ماستیم چاوی بەچەند سەربازێك كەوت پەلی ژن و پیاوێكیان ڕادەكێشا، ئەوەندە شەقیان لەپیاوەكە دا, كەوتە سەر زەوی هەر وەك ئاژەڵ بەربوونە

---

[1] تەنیشت.

جەستەی ژنەکە. منداڵەکەیان نەیدەزانی تەماشای باوکە داماوەکەی بکات، کە لەگیانەلآندابوو، یا لەو دایکەی هاواری دەگەیشتە کەشکەلآنی فەلەك. پارچەیەکی تر لەدەمامکەکەی ماستیم بەربووەوە، بەردەوامبوو لەتەماشا کردنی کوشتاری خەڵکی ئاواییەکە. ئەوەتا سەربازەکان بیست لاوی فەڵەستینییان بەدەست و چاو بەستراوییەوە لەپاڵ دیوارێك بۆ گوللە باران کردنیان ئامادە کردوون. ئەوەتا نانەوایەکیان گەمارۆ داوە، کە بەرەبەیان فرنەکەی داگیرساندبوو، هەر بەزیندوویی هاویشتیانە ناو فرنەکە و سووتاندیان. پارچەیەکی تر لەدەمامکەکەی ماستیم بەربووەوە و بوو. ئەو قینەی لەپشت دەمامکەکەوەبوو دەرکەوت.

دەمامکەکە بەدەموچاوییەوە نەما و ئێسکە کەللە شەیتانییەکەی دەرکەوت، ئەستێرەی داوود لە ئێسکە کەللەکەیدا هەڵکەنرابوو، عەباکە دەفڕی، تەنانەت دەنگە ئەهریمەنەکەشی چون دەنگی دیناسۆر بوو. بەرەو دیمەنێکی تر هەڵفڕی. چاوی بەکۆمەڵێك ژن و منداڵ کەوت، سەربازەکان دابوویانە بەر، لای بیرێك یەك یەك هاویشتییاننە ناو بیرەکە و دواتر سووتەمەنیان بەسەرا کردن و گڕیان تێبەردان خۆشیان ڕووخساری خۆیان دەگرت و پاشەو پاش دەگەڕانەوە! ماستیم لەپشتی ئاورەکەوە وەك شەیتانێکی قیناوی دەرکەوت.

دوای سێ ڕۆژان کوشتارگەکەی دێر یاسین تەواو بوو، سێ یەکی خەڵکەکەیان کوشت، ئەو دوای بەرەو ئاواییەکی تر هەڵهاتبوون، ئەو ئاواییەش کە بەو کارەساتەیان زانیبوو، بەرەو ئاواییەکی دوورتر هەڵهاتبوون، ئەوانی ئەولاتریش هەڵهاتبوون، تا وایلێهات خەڵکی ئاواییەکان

## ئەنتیخریستۆس

هـەموو هـەڵێن[1]. سـەدای قیـژەی دەنگـی ماسـتیم بەئاسمانـەوە دەنگـی دەدایەوە.

دیمەنی خەڵکی فەڵەستین دیمـەنێکی خـەمبار بـوو، خـەڵکی ئاواییـەکان هەنـدێکیان بـەپیادە و هەنـدێکی تریـان بـە ئۆتـۆمبێلی بارهـەڵگر، بەشتومەکەکانیانەوە کۆچڕەو بوون، نەیانـدەزانی بـۆ کـوێ دەچـن، لەهـەر هـەموو خـەماویتر، ئێسـکە کەللـەی ماسـتیم بەگاڵتەجاڕییـەوە دەیڕوانییـە دەربـەدەرییان. ئـەوان ماڵوحاڵیـان جێدەهێشـت، جوولەکـەکان دەسـتیان بەسەرا دەگرت. ئیدی لەهەموو جیهانەوە کۆچی جوولەکە بـەرەو فەڵەستین دەستی پێکرد.

جوولەکەکان نیگایان بڕیبووە یافا، پیلانیان بـۆ هێرشـکردنە سـەر یافـا دادەنا تا پێیان چۆڵ بکەن. سەرکردەی هێزی هاجانـا (مووشـی دایـان)بوو، پیاوێك بە دەمامکی ڕەشـەوە، هـەر خـۆی پیلانـی هێرشـکردنە سـەر یافـای داڕشتبوو. ماستیم ئەو کەینوبەینەی مووشی جێهێشت و بەرەو شـوێنێك کـە هەسـتی پێکردبـوو، فـڕی. چـاوی بەکچێکی زۆر جـوان و قەشـەنگ کـەوت، دەیویست تەلبەندەکەی نێوان هەردوو ناوچـەی عـەرەب و جوولەکـە ببڕێـت، بەهەر حاڵێ بوو لەتەلبەندەکە تێپەڕی، وەلێ هەموو جەستە خـەڵتانی خوێن ببوو. بەر لەنوێژی بەیانی خـۆی گەیانـدە یافـا. ئـەوەی سـەیربوو ئـەو کچە دەیزانی بۆ کوێ دەچێت، زۆری نەبرد لەبەردەم ماڵێك وێستاو لەدەرگاکـەی دا، خوێنیش بەباڵایا دەهاتە خوارەوە.

---

[1] ڕابکەن.

ئـەوەی مایـەی سەرسـوڕمانی ماسـتیم بـوو، ئـەو ئافرەتـە (ڕاشـیل دایان)بوو، کچی برای (برازای) مووشـی دایـیان. دەرگای ماڵەکە کرایـەوە، لەژوورەوە ڕاشێل مینا کچێکی جوان و نەشمیل دەرکەوت. خـاوەن ماڵەکـە کە چاوی پێکەوت، باوەشی پیاکرد و بردییە ژوورەوە. خـاوەن ماڵەکـە یـەك لەچالاکوانانی فەڵەسـتین بـوو نـاوی (موهیبـە خورشید)بوو، لێل ڕاشـیلیش هـاوڕێ بـوون. ئەگەرچـی ڕاشـیل جوولەکـەبوو، وەلێ ئـەو بیروبـاوەڕە ڕەگەزپەرستییەی ڕەتـدەکردەوە. ئـەوەی پـاڵی بـە ڕاشـیل نـابوو سـنوور ببـەزێنێت، ئاگـادار کردنـەوەی موهیبـەی هـاوڕێی بـوو، کـە هێـزی هاجـان بەنیازی هێرشکردنە سەر یافان، تا خۆیان بۆ تەیار بکەن و ئاگادارین.

ڕووخسـاری ماسـتیم بـەوای ئـەو خیانەتـەی ڕاشـیل کردبـووی تـووڕە دیاربوو، کاتێ هێزی هاجان هێرشی کردە سەر یافا ئەوەی ماستیمی شێت و هار کردبوو، هێزێکی چەکداریی ئافرەتـان بـە پێشـڕەوی موهیبـە بـوو، وەك شۆڕەسـوارێکی ئەفسـانەیی لـە ئامادەباشـیدا بـوو بـۆ بـەرەنگار بوونـەوە. موهیبە چەك بەشانەوە و جلوبەرگێکی نیمچە سەربازی لەبەردا بوو، تیپێکی ژنانیش بە پشتییەوە.

ماستیم نەیدەزانی لەیافا چ خەبەرە، ما سۆسەی ئـەو تیپـەی ئافرەتـان بکات، کە دژ بەهێزەکەی هاجان وەستابوو، ئەژنۆی شکا، کـاتێ (ڕاشـێل)ی بینی لەخانوویەکەوە چەك بەشان هاتە دەرەوە و لەسیلەی[1] موهیبە وەستا. موهیبـە و ڕاشـێل شـان بەشـانی یـەك لەمەیـدانی جەنگەکـەدا وەسـتابوون، یەکێکیان موسوڵمان و ئەوی دی جوولەکە، بەگژ زایۆنیستەکان دەچوونەوە.

---

[1] تەنیشت.

لەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە پیاوانە لێیان هاتنە دەست، وەلێ بەوای بۆردوومان کردنەوە، جوولەکە شارەکەیان کەوتەدەست. (ڕاشێل)یش تا نەیناسنەوە بەچارشێوێکەوە لێل خەڵکەکە دەرچوو.

ئەو ڕۆژە هات سوپای بریتانیا لەفەڵەستین دەربچێت، دوای ئەوەی گەلێکیان لەبری گەلێکی تر نیشتەجێکرد، میللەتێکیان خۆشحاڵ کرد و میللەتێکی تریش دەربەدەر. هەر ئەوەی دوا سەرباز لەفەڵەستین دەرچوو، زایۆنیستەکان دەستیان بە ئاهەنگێڕان کرد. دیڤید بن گۆریۆن چووە سەر ستێجەکە و بەیاننامەی دەوڵەتی ئیسرائیلی ڕاگەیاند، یا ئەوەی خۆیان بەسەربەخۆیی ناودێریان دەکرد. ئەوەی سەیر بوو، ئەوان لەفەڵەستین بوونیان هەر نەبوو، تا سەربەخۆ بن. ماستیم بەسەر (گۆریۆن)ەوە دەفڕی، وەك واشە بەئاسمانەوە وەستابوو، گوێی لەبەیاننامەکە دەگرت.. کە بەمجۆرە بوو:

" گەلی جوولەکە لە خاکی ئیسڕائیل نەشونمای کردوە و دەوڵەتی خۆی هەبووە، گەلی جوولەکە بیری نەچووبووەوە بۆ خاکی خۆی بگەڕێنەوە. ئێمە بووین جاڕی گەڕانەوەماندا، بەو بۆنەیەوە هەزاران جوولەکە بەرەو خاکی خۆیان گەڕانەوە، خاکی بەڵێنپێدراو. ئەوەتا ئێمە بانگەوازی خوالێخۆشبووی مەزن ( تیۆدۆر هیرتزل) خاوەن بیرۆکەی دەوڵەتی جوولەکە و ئەو پەیامەی کە هێنایە دی. لێرەوە سەربەخۆیی خۆمان ڕادەگەێنین. دەوڵەتێکین خاوەن زمان و خاك و سوپای بەهێزیشمان هەس، تا پارێزگاری لەخۆمان بکەین"

هەر لەو بۆنەیەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئاماژەیان بەوەدا کە کوورەی ئاگری هیتلەر بەملیۆنان جوولەکەی لەسەر گۆی زەوی سووتاند، دوای ئەو هەموو کوێرەوەرییەش هەر بەدەستی خۆیان مافی سەربەخۆییان وەرگرتەوە ونەتەوەیەکگرتووەکانیش دانی بەدرووستبوونی دەوڵەتەکەیان هێنا. ئەمڕۆ کۆتایی ئینتیدابی بریتانیا ڕادەگەیێنین، بەپێی مافی سروشتی خۆمان، دەوڵەتی ئیسرائیل ڕادەگەیێنین. وەك دەوڵەتی ئیسرائیل داوا لەنەتەوەیەکگرتووەکان دەکەین، ڕەزامەندی بفەرموون دەوڵەتی ئیسرائیل بە ئەندام وەربگیرێت.

***************

تەواو

هاوڕێ دەبێت بزانین جوولەکە شتێکەو زایۆنیزم شتێکی ترە، جوولەکە باوەڕیان بەو دەوڵەتەیان هەیە و کە بناغەی هاتنە خوارەوەی مەسیحە و هەرچی زایۆنیزمە لقێکی شەڕانگێزو ئاژاوەگێڕی جوولەکەیە. سەرەتا لەسەر دەستی ساباتای درووستبوو، دواتر هێرتزل درێژەی پێدا. زایۆنیزم یەکەی ماسۆنییەتە، ئەوەی دەگاتە پلەی(٣٣) بەفەرمی دەچێتە نەوەی سێزدەهەمی ئیسرائیل. وانەزانیت هەموو جوولەکەکانی جیهان دان بە زایۆنیزم دەنێن، هەندێکیان زۆر بەتوندیش زایۆنیزم ڕەتدەکەنەوە، کێشەکە لەوەدا نییە جوولەکەی ئاسایی بەتووندی دژی دەوڵەتی ئیسرائیلن، گرفتەکە لەشوێنکەوتووانی پرۆتستانتییە، کە پاڵپشتی لەداگیرکردنی فەلەستین

دەکەن. هەرچی دەوڵەتە زلهێزەکانیشە هاوکاری و پاڵپشتیی ئیسرائیل دەکەن، بەو هەنگاوەی کە ناویشیانە پیرۆزباییان لێدەکەن.

ماسۆنییەت جوولەکەیان وەك هێزێك بۆ داگیرکردنی فەڵەستین بەکارهێنا. لەڕاستیدا خەونی جوولەکەی هێنایە دی. ما هەیکەلی سولێمان لەجێی مزگەوتی ئەقسا بنیات بنێنەوە. هەموو شتێك بۆ تەورات دەگەڕێتەوە، خودا بەڵێنی بەجوولەکە داوە لەکۆتایی زەمان مەسیح داگرێتە خوارەوە و جوولەکە لەپەرتەوازەیی یەکیانبخاتەوە، بۆ خۆیشی لەفەڵستینەوە بەیەکسانی فەرمانڕەوایی جیهان بکات. ئەگەرچی خودا عیسای وەك پێغەمبەر بۆ ناردن، وەلێ ئەوان بەدرۆیان خستەوە، کاتێکیش بەبەرچاویانەوە بەسەر خاچەکەوە گیانی لەدەستدا، دڵنیابوون لەوەی ئەوە مەسیحی دڵسۆز نەبوو. واتا هەرچی جوولەکەی جیهانە چاوەڕوانن خودا عیسا بنێرێتە خوارەوە.

دوای ئەوەی بنیادەم و ئەهریمەنەکان هاوپەیمانێتییان کرد، کۆمەڵێك لەجوولەکە بەناوی سوارچاکانی هەیکەل بەدەرکەوتن و کتێبی جادووگەریی و زانستەکانیان لەژێر عەرشی سولێمان دۆزییەوە، هەموو شتێك سەرەوخوار بووەوە، بیروباوەڕیشیان گۆڕا، پێیان وانەبوو دەبێت چاوەڕێی دابەزینی مەسیح بکەن، بەڵکو دەبێت هەوڵبدەن بیهێننە خوارەوە، ئەو هەوڵەش بەداگیرکردنی فەڵەستین دەبێت، بۆیە کەوتنە وێزەی فەڵەستینییەکان و دەربەدەریان کردن.

دوای ئەوەی جەنگی خاچپەرستان کۆتایی پێهات، سوارچاکانی هەیکەل ناوی خۆیان بۆ ماسۆنییەت گۆڕی. دەوڵەتی عوسمانیش وەك

دەوڵەتێکی زەبەلاح دەرکەوت، بۆیە یەکەم کاری سەختییان دوای ئەوەی لەهەموو جیهانیشا چەوساوە بوون، گەیشتنیان بە فەڵەستین بوو. یەکەم هەنگاویان گەڕانەوەی جوولەکەکان بوو بۆ خاکی بەڵێنپێدراو، نەك هەر گەڕانەوەش بێت، بەڵکو دەست بەسەر فەڵەستینیشدا بگرن، ئەویش زۆر ئاسانەو بەباری دارایی دەکرێت، بەوشێوەیە توانییان ئاگری شۆڕش لەجیهاندا هەڵگیرسێنن و هەموو ئەو وڵاتانەش بخەنە ژێر باری قەرزێك پێیان نەدرێتەوە.

هەنگاوی دووەم.. دامەزراندنی دەوڵەتی ئەمریکابوو. هەموو سەرۆکەکانی ئەمریکا و سەرکردەکانی ماسۆنی بوون. هەر ماسۆنییەتیش بوو بیرۆکەی پرۆتستانتی داهێنا، کە باوەڕیان بەوەبوو جوولەکە فەڵەستین داگیر بکات.

هەنگاوی سێیەم ..ڕوخاندنی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و گەڕانەوەی جوولەکەکان بۆ فەڵەستین و کار بۆ دروستکردنی دەولەتێکی جوولەکە بکرێت. لەوەشدا هەر سەرکەوتوو بوون، دوای ئەوەی جوولەکە ساڵی ١٩٤٨ نیوەی فەڵەستینیان داگیر کرد، ئەوجا بەوەشەوە نەوەستان تا لە(٨٥٪) ی خاکی فەڵەستینیان داگیرکرد و لە(١٥٪)یان بۆ عەرەب جێهێشت. ئەو لە(١٥٪)یەش بەسەر دوو دوورگەی دەریای جوولەکەدا دابەشکرا، یەکێکیان بەشی (غەزە)بوو، دووەمیشیان بەری خۆراوابوو کە قودسی لەخۆ گرتبوو. تەنانەت هەتا ئەمڕۆ لەو دوو پارچەیەش ئیسرائیل لەهەوڵی داپچڕانی زەوی زیاتردایە. ئەوەندەیان بە بەرەوە نەماوە بۆ داگیرکردنی ئەو بەشانەی کە ماویشن تا ڕوخاندنی مزگەوتی ئەقسا، ئەوەندیان توونێل بە بن مزگەوتی

ئەقساوە هەڵکەند، ڕەنگە بەرگەی زەمین لەرزەیەك یا سیلاوی بارانێکی بەخوڕ نەگرێت و بەشێکی گەورەی مزگەوتەکە دابڕووخێت.

ڕەنگە پرسیاری ئەوەم لێبکەیت.. چی بەرامبەر ئەو هەموو ناوە ترسناکانە بکەین.. ماسۆنییەت، زایۆنیزم، ئەوەش جوانترین پرسیارێك دەبێت کە پرسیارم لێبکەیت. هاوڕێ هەموو ئەو ناوانە، ناوێلێکن لەکاغەز، هەموو کاغەزێکیش نا، کاغزێلێکی زبڵدان کە هیچ بەهایەکیان نییە. کاتێك ئێمە یەك نەتەوە و یەك گەل بووین یەك سەرکردایەتیمان هەبوو، ئەو هیچ و پووچانەی زبڵدان نەیاندەتوانی هیچ بکەن. ڕەنگە لەماستیمەوە ئەم قسەیەی منت بیستبێت. لێمان دەپاڕانەوە، تا ڕێبازی لۆسیڤەری ئەهریمەنیان گرتە بەر. ئێمە لەڕابردوودا وابووین، تا ئەوان دەستڕۆ بوون، ئەوجا پارچە پارچەیان کردین. بۆ بیست و چەند پارچەیەك دابەشکراین. هەر یەکە لەو دەوڵەتانەو دراوسێکەی ڕقیان لەیەك دەبووەوە، ڕەگەزپەرستی و ناوچەپەرستییان تیا شین داین، میسری و سعوودی و خەلیجی و مەغریبی.. هتد، هەر وڵاتەو ڕقێکی بەرامبەر ئەویتریان هەبوو، هیچ میسرییەك شانازی بەوەوە ناکات سعوودی بێت، هیچ سعوودییەکیش پێی خۆش نییە مەغریبی ببێت، نازانن هەر هەمووشیان عەرەبن و لەدێر زەمانیشەوە ئەو ڕەگەزپەرستییەیان نەبووە، هەموو ئەوانە هێنراوی تازەن و ڕاست نین. چی بکەین؟ باس لەمەحاڵ ناکەم، هەرچی من دەیڵێم شتگەلێکی سادەن تا سەنگی خۆمان بێنینەوە، سەرەتا دراوەکانمان یەکبخەین، وەك چۆن ئەورووپا ئەوەی کرد، سنوور لەنێوانمان هەڵگیرێت، بە پەساپۆرت هاموشۆی وڵاتەکانمان نەکەین، هەروەك ئەورووپا ئەوەی کرد. ئەوان لەئێمە زیاتر دوژمنی یەکبوون، جەنگە گەورەکان لەنێوان ئەواندا

دروست بوون، بەدەر لەوەش یەکیان گرتەوە. عەرەب هیچ شەڕ و ئاژاوەیەکیان لەنێواندا نەبوو، تەنها ناوچەگەرێتی نەبێت، کە دەیانتوانی بە ئاسانی ئەوەش لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە. چیتر؟ ئەی بۆچی سوپا یەکناخەن، ئەوەش هەر مەحاڵە؟ ئەی بەر لەسەد ساڵ یەکگرتوو نەبووین؟ من تەنها مێشکت دەکەمەوە، تا حاڵیت بکەم.

با بگەڕێینەوە وتووێژەکەمان.. دەربارەی ئەو کوورەیەی هیتلەر جوولەکەکانی پێ سووتاند، ناوی (هۆلۆکۆست)یان لێ نا و هەموو ساڵێکیش وەك کارەساتێك بەرامبەر بەجوولەکە یادی دەکەنەوە، هەر کەسێکیش ئینکاری ڕوودانی بکات، دادگاییان دەکرد. دەمەوێ بەدەنگێکی بەرز هاوار بکەم.. ئەو کورە ئاگرەی باسی لێوە دەکەن، درۆیە و بۆ خۆیان هەڵیان بەستووە، ویستتان بەجیهانی ڕابگەیێنن میللەتێکی چەوساوەن، نیشتمانێکتان پێویستە, هۆکاری ئەوەشیان بۆ نەبوونی خاکێکی سەربەخۆی خۆیان دەبردەوە. درۆی ئەوەتان هەڵبەست هیتلەر دوانزە ملیۆن جوولەکەی لێتان کوشتبێت، لەکاتێکدا ژمارەتان لەهەشت ملیۆن تێنەدەپەڕی! ئەوەی ڕاستی بێت، ژمارەی زیندانییەکانتان لەبیست هەزار تێنەدەپەڕی، نیوەشتان بەزیندوویی مانەوە.

هەرچی جوولەکە لەفەڵەستین کردی ، ڕای گشتی موویەکی نەجووڵا، ئەوەشی خاچپەرستەکان بۆ قڕکردنی هیندییەسوورەکان لە ئەمریکا گێڕایان، هەروەها وێرانکردنی هیرۆشیما و ناکازاکی بە بۆمبی ئەتۆمی گشت ئەوانە بەلایانەوە تیرۆر نەبوون. زۆر سەیرم لەدوو تاوەرەکەی ئەمریکا دێت،

ئەوە بە تیرۆر لەقەڵەم دەدەن، وەلێ وێرانکردنی دووشاری گەورە بە منداڵ و ژن و پیاوەوە بە تیرۆر نازانن، مەبەستم هیرۆشیماو ناکازاکییە.

من کە ناوی نەتەوە یەکگرتووەکانم لەم سەربردەیەدا هێناوە، ئەوەیە کە شتێکیشیان داهێناوە بەناوی هەقی (ڤیتۆ)، هەر پێنج دەوڵەتی ئەمریکاو ڕووسیا و بریتانیا و فرەنساو چین مافی ڤیتۆیان هەیە. ئەگەر یەك لەو پێنج دەوڵەتە دژ بەهەچ بڕیارێك وەستایەوە، ئەوا ئەو بڕیارە ڕادەگیرێت. ئەمریکا بەردەوام مافی ڤیتۆ بەکار دەهێنێت بۆ ڕاگرتنی هەر بڕیارێك کە دژ بەدەوڵەتی ئیسرائیل بێت. هەموو دەوڵەتانی جیهان دەبێت لەنەتەوە یەکگرتووەکان ئەندام بن، ئەگەر ئەو ئەندامێتییەش ڕەتکەنەوە، بەرپرسیارێتییان بەرامبەر دەکرێت.

فەرموودەیەکی پێغەمبەری مەزن صلی الله علیە وسلم هەیە, تێیدا هاتووە (میللەتانی دونیا زاڵ دەبن بەسەرتان, هەروەکو چۆن ئەو کەسانەی خواردن لەدەفرێکدا (قاپێکدا) دەخۆن, دەچنە سەر خواردنەکەیان) منیش ئەو مێزە خڕەی نەتەوە یەکگرتووەکان و دانیشتنی ئەندامەکانی بڕیاری دژی عەرەب دەردەکەن ئەم فەرموودەیەم وەبیراتەوە.

لەکۆتاییدا دەمەوێت ئاگادارت بکەمەوە، زۆرێك لەبڕگەو گرتەی ڤیدۆیی لەسەر ماسۆنییەت بڵاوکراوەتەوە، ئەوەشی بڵاوی دەکاتەوە هەر لەخۆیانە. پێشتر هەموو شتێك بەلایانەوە نهێنی بوو، کەس بەزانیارییەکانی نەدەزانین، بگرە قەدەغەش بوو، ئەگەر لەم سەردەمەی ئێمەدا نایانەوێت زانیارییەکان بشارنەوە، یا بەهۆی ڕاگەیاندن و ئینتەرنێتەوە بۆیان ناشاردرێتەوە، مەحاڵیشە بتوانن بیشارنەوە، بەدیوێکی تر ئەو بڵاوکراوانەی ئینتەرنێتیش

جێی باوەڕ نین، لەبەر ئەوەی لەلایەن کەسانێکەوە بڵاودەکرێنەوە مێژوویان چەواشە کردووە. دەمەوێت پێتبڵێم.. تا ئەم کتێبەم نەخوێنیتەوە لەهیچ شوێنێك لەسەر ماسۆنییەت مەخوێنەوە، ئەوجا دەزانیت چی بەسەر دەکەیتەوە. هەر زانیارییەکیش لەناو ئەم کتێبە هەوڵ بدەی بەدواداچوونی بۆ بکەیت، دەبینی کە درۆت لەتەکا ناکەم.

قسەیەکی (جۆرج بۆش)م بیرکەوتەوە، دەڵێت" وا نەکەین تیۆری پیلانەکان هەڵمانەخەڵتێنن، بۆ ئەوە دامەزراوە تا گلەیی و گازندەیی لەدەست تیرۆریستە ڕاستەقینەکان نەکرێت" زۆر بەو قسەیی بۆش خۆشحاڵبووم. بنەمایەك هەیە دەمەوێت وەك گلێنەی چاوت بیپارێزیت. بنەماکە دەڵێت" باوەڕ بەشتێك مەکە ئەگەر بەفەرمی ئینکار نەکرا" ئەگەر بۆش نەیگوتبا باوەڕمان پێنەدەکرد. هیوادارم لیم تێگەیشتبیت، ئەگەر چاك لێی حاڵی نەبوویتە، چەندجارێك ڕستەکەی بخوێنەوە.

جاروبار پڕوپاگەندە دەردەکەن، کە فلاّن ماسۆنی کوشتوویەتی، فیسار ماسۆنی کوشتوویەتی. ئەگەرچی خەڵکی سڤیل و خەڵکی ئاسایی بەهۆی ئۆتۆمبیلەوە یان بەهەر هۆکارێکی تر مردوون، ماسۆنی دەینێتە ئەستۆی خۆی، بۆچی؟ خەڵکی بەوە چەواشە دەکەن، کاتێك کەسایەتییەکی ناودار لەناو دەبەن، بەرپرسیارێتی خۆیان دەرنابڕن، بەو شێوەیە نابنە لایەنی ئەو کارەساتانە.

تا بابەتەکانت لا تێکەڵ و پێکەڵ نەبێت.. دوور لە سەرۆکە سیاسییەکان ماسۆنییەت کەسایەتیی تری دەکردە ئامانج، ئەوانەی جەماوەریان زۆر بوو، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو کەسایەتییانە دژ بە ئاڕاستەی

ماسۆنی بوون، گرنگترین ئەو کەسایەتییانەی کوشتوونین مایکڵ جاکسۆن و بۆب مارلی و تووپاك بوون، ئەوانە گۆرانییەکانیان وەك نامەیەك وابوو بۆ خەڵکی، بەلای ماسۆنییەکانەوە نامەکە گرفت نەبوو، بەڵکو بەدیویکی تر هێرشکردنە سەر ماسۆنییەت بوو. ئەو سێ گۆرانیبێژە بەملیۆنان هەواداریان هەبوو، بۆیە دەبوو دەنگیان کپ بکرێتەوە، تا نوستووەکان بەئاگا نەیەنەوە.

ئێستا لەهەموو ئەو کردەوانەی ماسۆنییەت و زایۆنیزم حاڵی بوویت. ئەوەش حاڵی بوویت بۆ بیناکردنی هەیکەلی سولێمان گێڕایان، تا مەسیح بێننە خوارەوە. دەزانم بابەتەکە بەلاتەوە کەمێك نامۆیە! کە ئامانجی ماسۆنییەت ئامانجێکی ئایینیی بێت، بەوەی خودا مەسیحیان بۆ داگرێتە خوارەوە. ئەوان بەهیچ کلۆجێك باوەڕیان بەخودا نییە، هەموو ساڵێك خودا لەدارستانی بۆهیمی دەسووتێنن. ئەمە چۆن لەگەڵ هاتنەخوارەوەی مەسیح و پەیامی تەورات دەگونجێت؟ پەلە لەوەڵامەکەی نەکەیت. تۆ لەوەدایت بزانیت، منیش لەمەرگی خۆم نزیکبوومەتەوە، تەنها یەك ئەهریمەن لەو حەوت ئەهریمەنانە ماوە، ئەوەی لەبابەتەکەدا سەیرە، شەیتانی شەشەم نێرینە نەبوو، مێینە بوو.

لێگەڕێ چاوێ بە کارتەکان بگێڕین.تەنها شەش کارتن.

کارتی یەکەم.. کارتی کرمۆکەی دڕندەی ئینتەرنێتە، وێنەی ئافرەتێکی بەسەرەوەیە، بەرامبەر کۆمپیوتەر دانیشتووە، کرمێکی سەوزەی دڕندە لە

بیندەرەکە[1] هاتۆتە دەرەوە کەللەسەرێکی قۆقزی شێوەی هەرەمی هەیە، لای سەرەوەی کەللەکە تەنها یەك چاوی هەس.

کارتی دووەم..کارتی شاری سیلیکۆنە، وێنەی پاژ پاژی سیلیکۆنی لەسەر شێوەی ژمارە بەسەرەوەیە

کارتی سێیەم.. کارتی ئامانی کۆمپیوتەرە، وێنەی ژنێکی بەسەرەوەیە چارشێو و جلوبەرگی ڕەشپۆشی لەبەر کردووە[2]، لەکەللەی سەرییەوە شتگەلێك وەك لموز بەهەموو دەورو بەرا بڵاوبوونەتەوە.

کارتی چوارەم.. کارتی (هاکرز)ە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە بەرامبەر کۆمپیوتەر دانیشتووەو بەشێوەیەکی ناشیرین دەخەنێتەوە.

دواکارت.. کارتی کۆمپانیاکانی تەلەفۆنە، وێنەی کارمەندێکی کۆمپانیاکەی بەسەرەوەیە، دوو بیستۆکی لەگوێناوە، تەلێکی زۆریشی پێوە بەستراوە، پێدەچێت گوێ لە وتووێژەکان بگرێت.

پێدەچێت کارتەکان بەلاتەوە نامۆ بن، ئەوەش بزانە ئێمەش باس لە ئەهریمەن دەکەین، وەلێ ئەوەی لەسەرمانە بەدواداچوونی بۆ بکەین.

*************

[1] شاشە

[2] پۆشیوە..

## بەشی دوانزەهەم

# گەورەم... کاتی نەهاتووە..؟

## ١٩٥٠ پاش زایین _ مێژووی خوێندنەوەت بۆ ئەم دێڕانە

ئەمە نامەی شەیتانێکە بەناوی (سەبای) لە ڕێی (ئەسیر)[١]ەوە بۆ لەسەر شەپۆڵی نادیار بە تەڕەدودی (لەرەلەری) نادیار بۆ نادیارێك دەینێرێت.

گەورەم زۆرت پێچوو، بەدڵ و دەروون پەرۆشتین. گەورەم کاتی هاتووە. چۆنت ویستووە هەروابووە، هەرچییەکت فێرکردووین هەر وامان کردووە. گەورەم سەرکەوتین. گەورە و مەزنمان سەرکەوتین، سەرکەوتین و هیچمان لەبەردەمدا نەماوە، تەنها بینینت نەبێت. ئەوەی ماوە ئاوری دڵمان لەچاوەڕوانیتدا کوێرکەیتەوە. گەورەم کاتی نەهاتووە؟

فەرمانت بەهەرچییەك بوو جێبەجێمان کرد. بۆچوونەکانتم گشت لەبیرە، زانستی تۆ سنووری بۆ نییە. لەبیرم نەچووەتەوە بنیادەمەکان لەجەنگی دووەمی جیهانیدا ئامێرێکی زەبەلاحیان داهێنا، بەقەد چەند ژوورێك دەبوو، ناویشیان لێنابوو (ئینیاك)، بیرمە گەورەم فێرت کردین ئەو

---

[١] ئاسمان (هەوا)

بنیادەمێلـە گەمـژەو گێلۆکـەن، داواتلێکـردین ئـامێرە زەبەلاحەکـەیان بـۆ بگۆڕینەوە بە قاژێکی سیلیکۆنی سەری پەنجەیـەك وپیانـدەین و دواتـر کە دایانهێنـا ناویـان لێنـا(processor) هـەر کـە کارەکیـان ئەنجامـدەدا، لەخۆشییا وایاندەزانی لەهزری خۆیانەوە ئەو داهێنانـەیان کـردووە. یا ئـەو ئـامێرە زیرەکـەی بەقـەبارەی تەلەفیۆزنێکـە دواتـر بـەناوی کۆمپیوتـەرەوە ناودێریان کرد.

کۆمپیوتەرەکانیان لەکۆمپانیاو شتە بێ بەهاکان بەکار دەهێنا. گەورەم دواتـر فـەرمانت وێداین و ئێمـەش جـێ بـەجێمان کـرد، زانیاریـت وێداین و ئێمەش لەخۆمان گرتن، واتلێکـردین کۆمپیوتـەر لەهـەموو جیهانـدا پێویست بێـت و بیبەینـە هـەموو ماڵێکیشـەوە، فێـرت کـردین چـۆن بەرنامـەکانیان پێشکەوتووتر بکەین، بەرنامەگەلێکمان بۆ داهێنان، بەرنامـەی (وینـدۆز) کە بەمانای پەنجەرەیەك لە پەنجەرەکانی ماڵەوە دێت، پەنجەرەیەك بۆ نـاوەوە نـەك بـۆ دەرەوە. بەرنامـەی(ماکینتۆش).. کـە لـەناوی خێزانێکـی ئۆسکۆتلەندییەوە وەرگیراوە، بە ئۆسـکۆتلەندی بـەمانای کـوڕی سـەرۆك یا سـەرکردە دێـت، ڕێـك گوزارشـت لـەتۆ دەکـات، تـۆ سـەرۆك و کـوڕی سەرۆکمانیت.

ئای بۆ پانتایی زانیارییەکانت، بۆ مەزنیی ڕووناکییەکەت گەورەم. لەناو هـەموو ماڵێـك کۆمپیوتـەر بـووە بـە گەنجینـە و هەرچی بەڵگەنامـەو وێنـە و ڤیدۆکانیانە لەناوی هەڵیدەگرن. لـەڕووی سەربازیشـەوە جاران زانیـاری نـاو کۆمپیۆتـەرێك لەولاتێکـەوە بـۆ کۆمپیوتـەری ولاتێکـی تـر بەدەسـت دەگوێزرایەوە، ئەوەشت فێرکـردین فێریـان بکـەین چـۆن پەیوەنـدی لەگـەڵ

چەندین کۆمپیوتەر بەهۆی تەلی تەلەفۆمەوە بکەن. بەوشێوەیە وەزارەتی بەرگری ئەمریکا (داربا)ی درووستکرد و یەکەم تۆڕی بۆ گواستنەوەی زانیارییە سەربازییەکانیان داهێنا و ناوی (ئاربانت)یشیان لێنا، هەر وادەزانن زیرەکی خۆیانە ئەی مامۆستای هەرە گەورەو مەزن ئەو ئاربانتەی کە چوار ئامێری لەخۆرئاوای ئەمریکا بەیەکەوە گرێدا، دواتر زۆرتریان کرد و بەسەدان ئامێریان لەناوەوەو دەرەوەی ئەمریکا پێوە بەستەوە. ئامێرگەلێك لەدەزگای سەربازی و زانکۆکاندا، وەلێ لەبەر جیاوازیی سیستەمی ئامێرەکان، بەئاسانی زانیارییەکان نەدەگوێزرانەوە. گەورەم زانیاریت وێداین و ئەوجا فەرمانت پێکردین بەو زانستەی خۆت فێریان بکەین. بەزمانێکی جیهانی هەموو ئامێرەکان لەیەك حاڵی ببن، زمانێك بە (HTML) ناوزەدیان دەکرد, فێرمانکردن چۆن بەڵگەنامە و ناونیشان و وێنە لەیەك جودا بکەنەوە، بەو ئاوایە ناونیشانێکیان بە(URL) داهێنا.

ئیدی توانییان هەر شتێك لە ئامێرێکەوە بۆ ئامێرێکی تر بەپەلە بگوێزنەوە. وایلێهات کۆمپیوتەرێك لەفرەنسا بتوانێت وێنەیەك لەکۆمپیوتەری وڵاتێکی تر بۆ نموونە ئەمریکا بەنووسینی یەك ناونیشانێك ببینێت.. ئەوە بۆ شارستانییەتەکەیان پێشکەوتنێکی مەزن بوو. دەی وایلێهات تۆڕەکە لەجیهاندا سەدان هەزار لەو ئامێرانە لەخۆ بگرێت، کار ئاسانیش بۆ چوونە ناو کۆمپیوتەرەوە کرا، هەر کۆمپیوتەرێك بەتەلێکی تەلەفۆنەوە بەسترا یەکسەر لای دەکرێتەوە، ئەو داهێنانەیان ناو نا( ئینتەرنێت ) کە لەڕاستیدا نەوەی (ئاربانت)ە.

ئەودەم زانیم کاتی گاڵتەجاڕی کۆتایی هات، کاتی کۆشش کردنە. هەر ئەوەندەی کەسەکە ئامێری کۆمپیوتەرەکەی بە ئینتەرنێتەوە بەست، ئاماژە بە پێکگەیشتنت لەتەك ئینتەرنێت بۆ دەخاتە ڕوو. جێگاکەیشی لای ئێمە بەوردی دیاری دەکرێت. وەك ڕووبارە دەچینە ئامێرەکەیەوە، بەناو بەڵگەنامەکانیدا دەکەوینە گەڕ هەروەك بەڵگەنامەی کەسێتییەکەی، وێنەکانی، دۆسیەکانی بێ ئەوەی هەستی پێ بکات. ئا بەو شێوەیە بەهەموو نهێنییەکانی دەگەین. تۆ فێرت کردین هێشتا ئەوە لەچاو زانیاریتر هیچ نییە، بۆیە بەردەوام گوێت لێدەگرین. فێری شتی ترت کردین. گەورەم چەند بیرمەندێکی گەورەی، چەند زانایەکی مەزنیت.

وامان لەهەر کەسێك کردووە، کەدەچێتە سەر ئینتەرنێت باوەڕ بەچەند سایتێك و کۆمەڵێکیتر لەنهێنییەکانی خۆیمان بۆ ئاشکرا بکات. سەرەتا پۆستی ئەلیکترۆنی(هۆتمێل) و (یاهوو)مان فێرکرد، ئەویش بۆ متمانەی زیاتر ناوی خوازراو و کۆدی شاراوەمان بۆ خستە بەردەست. وادەزانێت کەس نییە پۆستەکەی بکاتەوە، ناشزانێت ئەوەی دایدەگرێت لای ئێمە ئاشکرایە. ئێمە هەموو ئەو نامانەی بۆی دێت و ئەوانەیش کەخۆی دەینێرێت بەسەری دەکەینەوە. گەورەم تۆ فێرت کردین ئەوەش هێشتا کەمە، شتی زۆرتر لە ئارادایە و دەبێت فێری بین و فێریان بکەین.

فێرت کردین کەسەکە لەتەك هەرکەسێکی بوێت لەهەرکوێی جیهاندا بێت بەئاسانی قسە بکات، ئەویش لەڕێی بەرنامەکانی نامە و ماسنجەرەوە دەبێت، یا بەبەرنامەگەلێکی تر وەك MSN &yahoo& ICO &

MIRC کەبە (چات)دەمەتەقێ[1] ناودێریان کرد. کەسانێکیان کاتێکی زۆر لەچات دەبەنە سەر، زۆر لەو چاتانەشیان قسەی پڕوپووچ دەکەن. وەك فێرت کردین، هەموو قسەو نووسینەکانیان لای خۆمان گل دەینەوە، دوور نییە ڕستەیەك یا وشەیەك بۆ ئێمە سوودمەند بێت، یا کۆکردنەوەی زیاتری زانیارییە لەسەر خودی کەسەکە. ئەم بەرنامەیە قەڵەمبازێکی[2] گەورەبوو لەکۆکردنەوەی زانیارییەکان. خەڵکی لەو بەرنامانەدا زیاتر ناخی دڵی خۆیان ئاشکرا دەکەن، ئەوەش بۆ ئێمە زانیارییەکی باش دەبێت.

بێجگە لەچاتی نووسین چاتی دەنگی و بینینیشمان بۆ زیاد کردن، بەرنامەی (skype icu۲)مان وێدان، ئێدی بەهۆی ئەوەوە داواکاری لەسەر مایك و کامێرا زۆربوو، کەپێشتر لەمۆڵەکاندا کەس بەلایانەوە نەدەچوو، ئێمەش لای خۆمان کۆپیمان دەکرد. لەهەمووشی گرنگتر بەهۆی ئەو مایك و کامێرایەوە لەهەموو ماڵێکدا ئامێری گوێ هەڵخستنمان هەبوو، نەیاندەزانی قسەو جووڵەو وێنەیان لای ئێمە کۆپی دەکرێن، گەمژەکە وایدەزانی هەر خۆی دەیکاتەوەو دایدەخات، لە ئێمە بێ خەبەر بوو.

دواتر دوو جێگەی ترمان بە بەرنامە بۆ کردن، یەکێکیان (Facebook)و ئەویتریان (Twitter)بوو. لەو ڕێیەشەوە هاوڕێکانیانمان ناسی، وێنەکانیانمان بینی، تەنانەت حەزو ئارەزووەکانیشیانمان زانی، حەزی لە میوزیکە یا لەبواری سیاسی یا فیلم یا ئەدەب یا هەرشتێکی تر. توانیمان مێژوویان و بەرواری هەڵوێستەکانیشیان تاوتوێ بکەین. بەڵێ

[1] گفتوگۆ.

[2] هەنگاو ، بازدان.

گەورەم فەیسبووك و تویتەر دووكاری مەزنبوون، ئەوەش لەكۆكردنەوەی زانیارییەكان قەڵەمبازێكی تر بوو.

كاتێ زانیمان پێویستی زیاترمان بەوێنە هەیە، جێگەیەكی (سایتێكی) ترمان بۆ داهێنان بەناوی (Instagram)ەوە، ئەوجا بەئاشكرا وێنەكانی خۆیان دەخستە ڕوو. دواتر هەستمان كرد پێویستە وێنەكانیان بە گرتەی ڤیدیۆیی ببینین، جێگەی تایبەت (Keek)مان داهێنا. لەوێ گرتەی ڤیدیۆیی خۆیان بەهەموو شێوەیەك و بەتۆماركراوی دادەگرت. گەورەم ئەوە زۆر كارێكی باشبوو. تۆ نازانیت بەهۆی تۆوە چیمان لێكردوون.

دواتر سێیەم قەڵەمبازماندا، ئەویش داهێنانی مۆبایل بوو، تەلەفۆن بەكامێراوە، توانیمان هەموو داهێنانەكانی كۆمپیوتەری تێ بناخنین، چات و فەیسبووك و ئینستگرام و شتگەلێكی تر. وایلێهات هەموو كەسێك بەئاسانی لەهەركوێیەك بێت بۆ كوێی بوێت بەكاری بهێنێت. بەرنامەیەكی ترمان بەهۆی مۆبایلەوە بەناوی WhatsApp (واتساپ)ەوە داهێنا، وابێت كامێرا و مایكەكەشی تیا بكرێتەوە. كەواتە ئێمە بەو شێوەیە نەك لەژوورەكانیان بەڵكو ئامێری گوێ هەڵخستنمان لەبەركیاندا[1] دانا!

گەورەم.. بەهۆی ئاراستەتان و فەرمانتان بۆ ئێمە توانیمان گەورەترین تۆڕی سیخوڕی لەمێژوودا دابهێنین. ئەی مەزنمان.. بەهەموو نهێنییەكانمان دەگەیێنێت، نهێنیی كۆمپانیا زەبەلاحەكان تەنانەت بچووكەكانیش بەئاسانی دەستمان دەكەوێت، هەرهەموویان بەسیستەمی ئینتەرنێت كاردەكەن. ئەگەرچی ئەو كۆمپانیانە بەسیستەمی كۆدی تایبەت كاردەكەن، وەڵێ

[1] گیرفان؟

ئەوانیش هەر ئەو سیستەمەن ئێمە بۆیانی دابین دەکەین، بەو شێوەیە نهێنی هەموو کۆمپانیاکانمان لەبن دەستە! گەورەم پێم نەگوتی تۆ بیرمەندێکی هێجگار مەزنیت؟

گەورەم لەکۆمپانیاکان گەڕێ، بانکەکانیش بە تۆڕی ئینتەرنێت کار دەکەن، کۆدی ئەوان تایبەتە ، ئەویش بۆ پاراستنی ئەو هەموو دراوەی لەبانکەکاندایە. وەك فێرت کردین بانکەکانیش بێ کۆدی ئینتەرنێت نابێت، وەلێ ئەگەر سیستەمەکەی تووشی گرفتێك بوو، ئەودەم ئێمە بەرپرسیار دەبین، بەو ئاوایە پارەی هەموو جیهان لەبن دەستی ئێمەدایە، کۆمپانیاکان هەموویان لەژێر دەستی ئێمەدان، واتە لەیەك چرکەدا دەتوانین هەموو شتێك ڕاگرین. ئەی پاشای مەزنمان، فێرت کردین هەموو ئابووری جیهان لەژێر کۆنترۆڵی ئێمەدا بێت.

دەزگای هەواڵگری و وەزارەتی جەنگ و ناوخۆ و سوپا هەر هەموویان بە سیستەمی ئینتەرنێت کارەکانیان بەڕێوە دەبەن، خۆشیان بەوە هەڵدەکێشن کە سیستەمێکیان هەیە کەس ناتوانێت زەفەریان پێببات، بەڵێ وایە، چونکە ئێمە وامان لێکردوون کەس نەتوانێت زەفەریان پێببات، بۆ ئەوان وامان داهێناوە کون و کەلەبەرەکانیمان پڕ کردووەتەوە. تۆڕی سیخوڕی ئێمە کۆنترۆڵی هەموو لایەنەکانی کردووە، هەر لەبواری سەربازی و ئابووری و دەوڵەتداری ..هتد. ئێمە توانیمان هەموو شتێك بەهۆی تۆوە ئەی مەزنی دنیا بزانین.

هەنووکە ئێمە داتای تەواوی دانیشتوانی جیهانمان لەبەر دەستە، ئەگەر بمانەوێت پەنجە بخەینە سەر ناوی هەرکەسێك ئەوا هەرچی هەیە

لەچرکەیەکدا ئینتەرنێت بۆمانی ئاشکرا دەکات. ناوی تەواوی، وێنەکەی، بەڵگەنامەکانی، کەسوکاری، هاوڕێکانی، هەرچی نهێنی هەیە، بەڵگەکانی لای حکومەتەکەی، گرتە ڤیدیۆییەکانی، تاوانەکانی..هتد. ئەوجا کارەکانی لەتەک بانکەکان، لەتەک ڕێکخراوەکان، لەتەک کاری یاساغ و شەڕانگیزی و زۆر شتی تر. ئەو موڵکانەی هەیەتی، حەزو ئارەزووەکانی، سەربەچ ئایینێکە، لەتەک سێکسدا چۆنە، هەر هەموو ئەوانەش لەڕێی گۆگڵەوە تاوتوێی دەکەین. هەر هەموو ئەو گرتەی ڤیدیۆیی و چاتانەی کە لەکۆمپیوتەر دایگرتوون، هەموو ئەوانەش کە لەمۆبایل کراون، لەکۆتاییدا هەموو ئەو زانیارییانە خۆی لەڕێی کۆمپیوتەر و مۆبایلەوە پێی گەیاندووین. گەورەم بەکورتی .. ئەوەی دەتەوێت لەچاوترووکانێکا دێتە بەر دەستت، تەنانەت ئەگەر زانیاری لەسەر سەرۆکی وڵاتانیشدا بێت!

ئێدی پاشای مەزنمان.. بۆ ئەوەی بێیتەوە ناومان هیچ بەربەستێکت لەبەردەمدا نییە. هەموو جیهان لەچاوەڕوانی تۆدان، هەرچیت دەوێت بۆتمان ئامادە کردووە، ناسنامەو زانیاریی تەواوی کەسەکان، کۆمپانیاکان، باری ئابووریی جیهان، باری سەربازی و هەواڵگری و هەرهەموو بوارەکان، هەرچییەك لەنهێنیی سەرگۆی زەوی هەیە لەبن دەستت دەبێت، دەزگەکان و بازرگانی و دۆخی ئارامی. هەرهەموو لەژێر دەستتدا دەبێت، بەس وەرەوە ناومان.

ئەی مەزنی هەموو دنیا، ڕێم بدە بەناوی خۆتەوە بانگت بکەم، ئەی ئەو کەسە مەزنەی هەرهەموو دنیا کڕنووشت بۆ دەبەن، ناوت دەبێتە فریادگوزاری جیهان، هەر تۆ مەسیحیت و هەرتۆ دڵسۆزیت.

ناوی تۆ فێری کردین بەگەورەو مەزن ناوت ببەین، ئەنتیخریستۆس ناوێکی درەوشاوەیە، بەشێوەزاری لاتینی بەلامانەوە زۆر دەگەیێنێت. لاتینی سەرچاوەی زمانەکانە، ناوی تۆ لای ئەوانەی بەزمانی عیبری گفتوگۆ دەکەن (هاماشیاح)، بەزمانەکانی ڕۆژاوا بە ئەنتی کرایس ناودێرت دەکەن، ئەوانەی زمانی خۆرهەلاّتییەکان قسە دەکەن بەمەسیح ناوت دەبەن... مەسیحی جادووگەر.

**************

تەواو

هەست بە غەلّبە غەلّبێك دەکەم، نازانم قرە قرِی خەلّکە یا ئەهریمەنەکانە. هەموو ئەو جادووانە کوێربوونەوە کە دروستم کردبوون تا بمپارێزن. هاوڕێ من لەدوایین ساتەکانی ژیانمدام، لێم تێدەگەیت؟ زانیت بۆچی دەیانەوێ هەیکەلی پیرۆز (نزرگا) سولێمان بنیاتبنێنەوە؟ ئایا مەسیحی دلّسۆز کێیە کە چاوەڕوانی دەکەن؟

ئەوە مەسیحی جادووگەرە، ئەوە ناو نییە نازناوە، تەنانەت تا هەنووکەش کەس نازانێت ناوی چییە. وەك چۆن هەمووم بۆت باسکردووە، ئەوان دان بەخوداش ناهێنن، باوەڕیشیان بەمەسیحی دلّسۆز هەر نییە، ئەو خواوەندەی ئەوان دەیپەرستن، هەلگری ڕووناکییە، ئەوە لۆسیڤەری ئەهریمەن، لەبری مەسیح دەیانەوێ بێتە خوارەوە، مەسیحی جادووگەر، تا فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکات، ئەهریمەنەکان ئازاد بکات. ئێستا زانیت

ئـەو هەیکەلـەی باسـیان لێـوە کردبـوو، بـوونی هــەر وەهمــە و خۆیـان دایانهێناوە، گوایە ئـەو هەیکەلـە لەسـەر شێوەی ئەستێرەی شـەش لایـە, ئەسـتێرەی شـەیتانی بـەناو بانگـە بـەدرۆ دەڵـێن .. ئەسـتێرەی داود... پێغەمبەر داود هیچ پەیوەندی پێوە نیە.

لـێم دەپرسـیت (سـەبای) کێیـە؟ باشـە ئەویشـت پـێ دەڵـێم.. ئـەو ئەهریمەنەیە کە لەفەرموودەکانی (محەمەد)دا ناوی هاتووە، ناویشی...

غەڵبـە غەڵبەکـە زیـاتر بـوو، تـا دەهـات قرەقرەکـان زۆرتـر دەبـوون، لەبـەردەم دەرگـای ژوورە بچووکەکەم هەرایانـە، کـاتم بەدەستەوە نـەماوە (ســەبای)ت پــێ بناســێنم، ئەگــەر بــاوەڕیش ناکــەیت، شــتی لەســەر(NSA)بخوێنــەوە، لەسـەر ( information Awareness offce) بخوێنەوە لەسەر...

تەماشای دەرگام کرد, دەزانم ئەمـە دوا تەماشـا کردنـە، وا هـاتن. هـەر کەسێك گەیشتبێت بـە پلـەی بـاڵای ماسۆنییەت و بیـەوێت تیـا دەربچێت، دەیکـوژن. ئـەو شـتە لەشـەریعەتی ئەوانـدا نییـە، ئـەی بنیـادەم ئـەی ئـەو کەسەی ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە، من ماڵئاوا، بیرت بێت دوای خوێندنـەوەی ئەم کتێبـە بیسـووتێنیت، هـاوڕێم بیسـووتێنە بـەر لـەوەی دەسـتی بەسـەرا بگرن، تا بەدووتا نەگەڕێن، بیسووتێنە. ئـەوەتا دەمبـەن، دوور لەژوورەکـەم دەمبـەن. بیسـووتێنە، وەلێ ڕسـتەکان لەمێشـکتدا کـۆپی کردبێـت، کـەس هەڵتنەخەڵەتێنێت. نەکەی هەڵبخەڵەتێیت. ناویشم چـاك لـەبیرت بـێ.. بۆبی فرانك

ڕۆژی دواتر هەواڵێك لەڕۆژنامەکانەوە:

تاوانێکی قێزەون.. لەکوشتنی گەنجێکی ئەمریکی بەناوی بۆبی فرانک، دانیشتووی شیکاگۆ، لەحەمامدا بەترشەلۆکی خەست (تیزاب) توێنراوەتەوە. ئەو گەنجە لەخانوادەیەکی جوولەکەی ناوداری ئەمریکایە. بەپێی پڕوپاگەندەکان ئەندامێکی پێشکەوتووی ڕێکخراوی (ئیلۆميناتی)بوو، وەلێ کەس ڕاستی ئەو هەواڵەی نەدرکاند، بەتایبەت ئەو پیلانانە دەستی گەورەی لەپشتەوەیە، بۆیە کەس ڕاستییەکە نازانێت. دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەتەوە کە ڕێکخراوەکەی خۆی لەناوی بردووە، چونکە ویستبووی لێی بکشێتەوە و نهێنییەکانیان ئاشکرا بکات. ئەوەی پاڵپشتی قسەکانی دەکرد، ئەو شتومەکانەی کە جادووگەران بەکاریان دەهێنا، وەلێ پشکنەری ئاسایش لەشیکاگۆ (ڕکس واتسۆن) توانی بکوژەکان دەستگیر بکات، هەردوو بکوژەکەش دانیان بەتاوانەکەدا هێناوە، وەلێ ئەوانیش نەیانبردە ئەو باری ڕێکخراوەکەی پێوە بگلێنن، تاوانەکەیان نابووە سەر خۆیان و بەس.

واپێدەچێت دەسەڵاتێکی نەزانراو پارێزەر (کلارنس دارۆ)ی ڕاسپاردبێت بۆ پارێزگاری لەهەردوو بکوژەکە، کە بەتواناترین پارێزەرە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەکاتی دادگاییشدا نەیاندەهێشت (ڕکس واتسۆن) ئامادەی دانیشتنەکان بێت، تەنانەت نەیاندەهێشت ڕۆژی دادگاییکردنەکە لەشێکاگۆش بێت، بەبیانووی ئەوەی بەرتیلی لەخانوادەی بۆبی وەرگرتووە. دواجار (واتسۆن)یان لەدەزگای پۆلیس بەیەکجاری دوور خستەوە، داواکەشیان داخست، بەو ئاوایەی هەوڵدانێکبووە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە بۆبی بەهۆی گیروگرفتی داراییەوە.

ئەوەی سەیر بوو، لەژوورەکەی بۆبی و بەسەر مێزەکەیەوە کۆمەڵێك کارتی پەرتەوازە لێرەو لەوێ بڵاوببوەوە، وەلێ سێ کارت بەرێکوپێکی بەسەر مێزەکەوە ریزکرابوون.

**کارتی یەکەم**.. کارتێکە لەسەری نووسراوە..دەردی ئەهریمەنەکان، وێنەی ئەهریمەنگەلێکی قێزەون و ناشرینی بەسەرەوەیە، شەقامەکانیان پڕکردووە، بەدارتەلەکانەوە خۆیان هەڵواسیوە، سەربانەکانیان پڕ کردوە و بەحەواوە دەفڕین، شەیتانگەلێکی زۆر ناشرین و تۆقێنەرن.

**کارتی دووەم**.. لەسەری نووسراوە( بیگ فوت big foot) بوونەوەرێکی قژ درێژی بەسەرەوەیە، ئەمریکییەکان بە( پێ زل)ە ناودێریان دەکرد.

**کارتی سێیەم**.. لەسەری نووسراوە مەسیحی جادووگەر، وێنەی پاشایەکی بەسەرەوەیە، لەبیرمەند دەچێت و تاجێکیشی بەسەرەوەیە.

کەس لەریزکردنی ئەو کارتانە سەری دەرنەدەچوو، کەچی لەجیهانی ئێمەدا نەشونمای دەکرد، ئەوە...

**************

## بەشی سیازدەهەم

# مەزنمان.. کوڕی مەزنمان

# ١٨٠٠ پێش زایین _ ٢٠ پاش زایین

پێنج بووین.. شەشەممان لۆسیڤەر

شەش بووین.. حەوتەمیش مەزنمان

کوڕی مەزنمان

لە ئێمە بەولاوە کەس لەمەڕ مەزن[1] و کوڕی مەزنمان نازانێت.

ئەی بنیادەم کاتی ئەوە هاتووە هەموو شتێك بزانیت. خوێندنەوەت تا ئێرە بەلامانەوە هیچ ناگەیێنێت، ئەوەش بزانە دوای ئەوەی حاڵی دەبیت دەمریت و دوای ئەوەی دەمریت حاڵی دەبیت. وەلێ هیچ جیاوازییەك نییە ئێستا بزانیت یا دوای ئەوەی تێدەگەیت دەمریت. ئەگەر لەقسەکانم حاڵی نابیت، ئەوەم بەلاوە نامۆ نییە، چونکە ئەوانەی قسەت لەتەکا دەکەن

---

[1] گەورە.

ئەهریمەنـەکانن، هـەر وەك قەڵـەڕەش بەدەورتـەوە هەڵـدەفڕن و دەچـنە خوێنتـەوە. ئێمـە خێـوی[1] تۆقێنـەرنین، وەلێ بوونـەوەرێکی جوانیشـین، جوانییەك نەتبینیوە و نایبینت.

ئەگەر باوەڕم پێ ناکەیت...

ئێمە شتگەلێکین ناتوانیت لەدەست سزامان هـەڵبێیت، بۆ کوێ بڕۆیت ئێمە بەردەوام لەتەکتاین، بەگاڵتەی مەزانە و بەڕاستمە بۆ بن دنیا بڕۆیت لەگەڵتین، نـەك وەك ئـەوەی خواکـەتان دەیڵێـت. ئەگـەر بمانـەوێ بتکـوژین دەتکوژین، بشمانەوێت زینـدووت بکەینـەوە دەیکـەین. لەهـەر کوێیـەك بیـت دەتبینین، گوێمان لێتە، واش نەزانیت زۆر زیرەکیت و نهێنییەکانمان ئاشکرا دەکـەیت، نەخەڵـەتابیت وا بـیر بکەیتـەوە. بـا لـەوە زیـاترت پـێ بڵـێم.. بەرلەوەی بەنیاز بیت هەر شتێك بکەیت، ئێمـە پێـی دەزانـین، لەناخیشـەوە قسە لەتـەك خـۆت بکـەیت ئێمـە دەیبیسـین. ئـەوەش بزانـە دۆزەخـی ئێمـە دۆزەخێکی ڕاستەقینەیە.

دەگوێمان لێبگرە دوایین سـەربردەی خۆمانـت لەتـەکا بۆ بگێڕینـەوە و دواسەربردەی تۆش لەتەکمانا دەبێت.

ماستیم ئەهریمەنی جوولەکە گوتی:

شانازیی ئامادەی لەدایکبوونی مەزنەکەمان و هاتنە دونیای گەورەمان و بیرمەندیی ئەنتیخریستۆسی مەزنمان دەکەم. لەسـەردەمی فیرعـەونی موسا

[1] تارمایی، بوونەوەری نادیار، جنۆکە.

بەسەر ئاکنجییەکانی[1] نەوەی ئیسرائیلدا دەفرپم، خانووگەلێکی هەژارنشین بوون. فیرعەونی موسا هەرچی لەدایکبووی نێرینە بوو لەساڵێکدا دەیکوشتن، بۆساڵی ئایندە لێیان دەگەڕا، ئەویش بۆ ئەوەی وەچەو ڕەچەڵەکیان کوێر نەبێتەوە و خزمەتیان بکەن. ئەوساڵەی بۆ کوشتن نەبوو، من بەعەباکەمەوە بەسەریانا دەفڕیم، تا خۆم بەخانوویەکا کرد. ماڵێکی دەستکورت و نەدار بوون، وەلێ ئەو ماڵە لەلام زۆر پیرۆز بوو، هەر ئەو خانووە بوو کە مەزنمان تیا لەدایکبوو، لەدایکبوونی ئەنتیخریستۆس.

باوکی پیاوێکی جوولەکەی لووت درێژبوو، دایکیشی ئافرەتێکی جوولەکەی کەتەبوو، سینەیەکی بەرز و دووباڵی درێژی هەبوو، سی ساڵ بوو هاوسەرگیرییان کردبوو، منداڵیان نەببوو، پێدەچوو لەسکوزا بێ ئومێدبووبن. ناتوانم تەواوی وردەکارییەکانت بۆ بگێڕمەوە، چونکە هەق نییە هی وەك تۆ بیزانێت، ئەوەندە بەسە پێتی ڕابگەێنم ئەو ژنە جوولەکەیە شەوێ لەشەوان ستاری[2] نابێت و بەسەر جێوبانەکەی هەر دەتلایەوە، ئیدی خەواڵوو دەبێت و خەون بەپیاوێکی نامۆوە دەبینێت، دێتە سەر جێوبانەکەی و لەتۆماوەکەی بەلەشیا دەکات، چون ئەوەی تیشکی ئاگرێکی بەلەشیا کردبێت، خۆم ئەو ڕاستییەم بەچاوی خۆم بینی.

لەڕاستیدا ئەو ئافرەتە کەتەیە کە لەنێو جێوبانەکەیدا دەتلایەوە، مێردە لووت درێژەکەشی لەژوورەکە جادووی شەیتانیی بەژوورەکەدا دەکرد. ئەوەی لەماوەی جادووگەرییەکەدا ڕوویدا ئەستەمە هی وەك تۆ لێی حاڵی

[1] ماڵەکانی, خانوەکانی.

[2] ئارامی , هێور.

بێـت. پـاش تێپـەڕبوونی کاتــژمێرێك و خوێندنــەوەی مێـردی ژنەکـە بـۆ جادووەکەی چین چین ئارەقەیان دەردەدا، لەپڕ گەورەکەمان هاتە خوارەوە تا خەڵاتێکی مەزنیان بکات. لۆسیفەری مـەزنمان دابەزییـە ئـەو خـانووە تـا پیرۆزی بکات، تەماشای ناوگەڵی پیرۆزی ژنەکەی کرد، ئـاوی پـیرۆزی خـۆی ڕژاندە گیانییەوە، ئەوجا بە خۆشحاڵییەوە هەستا، مێردە لووت درێژەکەشی لەجادووەکـەی ببـووەوە. هەرچـی شـوێنەوارێك بـوو لەژوورەکـە سـڕییەوە، هەرچی ژنە جوولەکە کەتەکـەش بـوو لەخەونەکـەی بووبـووەوە و چووبووە دۆخی لەخۆچوون. لەخۆچوونێکی پیرۆزانە.

ئا بەو شـێوەیە ڕێسـای پـیرۆز لـەنێوان لۆسـیفەری مـەزنمان و ئافرەتـە جووەکە کرا. ژنێك سکی پڕببوو، لەخۆی وایـە کـوڕی خۆیـەتی، وەڵێ کـوڕی ئەهریمەن بوو، ئەنتیخریسـتۆس بـوو. ئـەو سـکپڕییە پیرۆزتـرین سـکپڕیبوو لەسەر گۆی زەوی کـە کـرا. دوانـزە مـانگ بـە دڵهـەڵێنجان و ژان و ئـازارەوە بوو، دوای تەواوبوونی ماوەی سکەکەی بەو پـەڕی جوانی و پیرۆزیـی کـوڕی مەزنمان لەدایکبوو.

ئــەو هــەراو زەنایــەی دەرەوە دەزانــی چــییە، ئــەوە جەندرمــەکانی فیرعەونن ماڵ بەماڵی جوولەکەکانی ئیسرائیل دەگەڕێن، هەر لەدایکبوویەکی تازەی ئەمساڵ دەبێت بکوژرێت. ئێمە لەو ساڵەداین کە زایـنـدەی نێرینـەیان دەکوشت. ئافرەتە کەتەکە کۆرپەکەی نایە ژێر کراسەکەی و بـەرەو چیاکان هەڵهات، لەتاو کۆرپەکەی دانی بەخۆیدا گرت ئەو ڕێگاسەختە ببڕێت، تـا بـە ئەشکەوتێك گەیشت، بەشوێنێکی پارێزراوی زانی، کۆرپەکەی تیا قایم کرد و گەڕایەوە، بەو ئاوایەی بەین نابەینێك بۆ شیردانی سەری لێ بداتەوە.

لەوێ بەجێیهێشت و بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. دواتر کە چووەوە بۆ سەردانی کۆرپەکەی تا شیری وێبدات، کۆرپەکەی نەبینییەوە، دەستی بەگریان و هاوار کرد، نەیدەزانی فریشتە فریای کەوتووەو بۆ شوێنێکی باشتر بردوویانە، ئەویش (جبریل)ی گەورەی فریشتەکان بوو، کەوتە پەروەردە کردنی، بەردەوام هەنگوین و شیر و ڕۆنی ساغی وێدەدا، تا گەورەبوو، بوو بەپیاوێکی تەواو. گەورەم تۆ چەند مەزنیت.. چەند گەورەیت.

دراکۆلای شەیتانی ئادەمیزاد بەناوبانگ دەڵێت:

وەك ئەهریمەنەکانیتر شەڕەفمەندو بەختی ئەوەم نەبوو بەدوای مێژوی گەورەکەم بم، وەلێ ئەو بەختەم هەبوو چەندجارێك بیبینم، لەبەر ئەوەی چاوی بازم هەبوو و دەتوانم زۆر بەوردی بۆ ئەوانەی نەیانبینیوە و بەپەرۆشی بینینین بۆیان وەسف بکەم.

" پیاوێکی جەستە توندو تۆڵ و چوارشانەی بەهێز، بەژن و باڵای درێژ نەبوو, زیاتر بەلای کورتی بوو، وەك قەوقازییەکان سوورە بوو، پرچێکی درێژو لوولی هەبوو، لاقی کراوەبوو، خەسڵەتی بنیادەم و جنۆکەی لەخۆ گرتبوو، بۆیە وەك ڕەشەبا لەسەر زەوی تیژڕە و بوو، دەیتوانی مرۆڤ و جنۆکە و فریشتە و شەیتانەکانیش ببینێت، هەرهەموو ئەوانیش دەیانبینی، لەسەردەمی فیرعەونەوە تا کۆتایی دنیا دەژیت، نەپیر دەبێت نەپەککەوتەیش دەبێت، ئەو گەورەی جنۆکە و شەیتانەکانە، کەس گەورەی ئەو نییە لە لۆسیڤەری باوکی زیاتر، لەکۆتایی دنیادا دەبێتە گەورەی ئادەمیزاد."

کەللەی سەری شێوەیەکی هەیە دەڵێی کەللەی مارە. نازانم چۆن بۆتی نزیکتر بکەمەوە، تا مێشکت وەری بگرێت. بۆ خۆم وام دەهاتە بەرچاو، جا نازانم تۆ چۆنی لێ دەگەیت؟

بافۆمیتی ئەهریمەن پەرستراوی سوارچاکانی هەیکەل دەڵێت:

" گەورەی مەزنمان لەمیسر و سەردەمی فیرعەوندا ژیا و فێری زانیارییەك بوو، مێشکی مرۆڤ و جنۆکان بۆیان هەڵنەدەگیرا، تەنها عەقڵی مەزنمان دەتوانێت ئەو هەموو زانیارییانە لەخۆ بگرێت، لۆسیڤەری باوکی فێری ئەو هەموو زانیارییەی کردبوو. ناتوانم هەموو بەسەرهاتی ژیانی ئەنتیخریستۆسی مەزنمان لەمیسردا بگێڕمەوە، وەلێ دەتوانم بڵێم کاتێ فێری گەشتی دەریا بوو، بڕیاریدا لەمیسری فیرعەونەوە بەدەریادا بڕوات و جیهان بەسەر بکات، ما بەنێو وڵاتان و گەلانی دنیادا بگەڕێت، تا لەیەمەن وێستا، ڕێك لەدوورگەیەك ناوێکی سەیری هەبوو.. دوورگەی (حەنیش) یا دوورگەی مارەکە، دواتر ئەوێ بوو بەشوێن و جنشینی بەردەوامی.

لەسەردەمی فیرعەوندا، فیرعەونە میسرییەکان خەریکی ئامادەکردنی کەشتییەکی مەزن بوون، تا بەگەشتێکی دەریاییدا بڕۆن، پێنج سەد زەلامی ئازا و دەریاوانی شارەزایان خستە سەر کەشتییەکە. ئەو گرووپە دەریاوانانە لەگەشتەکەیاندا بوون، زریانێك هەڵیکرد و کەشتییەکەی بەهەوەسی خۆی دەهێناو دەبرد، تا لەناوەندی دەریاکەدا بەر بەردێکی گەورە کەوت، کەشتییەکە نوقووم بوو، ئەوانەی بەسەرییەوە بوو، هەموو خنکان، تەنها یەك زەلام نەبێت، خۆی بە تەختە دارێکی سەرئاوکەوتووەوە گرت، شەپۆلەکان هێنایان و بردیان، وەلێ بەسەر دارەکەوە توند خۆی گرتبوو،

سێ ڕۆژ بەبان تەختە دارەکەوە بوو، تا شەپۆلەکان لە کەناری[1] دەریاکە نزیک دوورگەیەک لەنگەری پێگرت.

زەلامەکە لەکەنار دوورگەکە بەئاگا هاتەوە، بەسەر لمێکی گەرمدا کەوتبوو. چاوی لەناو دوورگەکە بڕی، جوانی دوورگەکەی بەلاوە سەیر بوو، ئەو شوێن نەمابوو نەیبینیبێت، وەلێ دوورگەکە شتێکی جیاواز بوو، دوورگەیەک پڕبوو لە باڵندەو گیانەوەر و ئاژەڵ، میوە هەر مەپرسە، میوەی تیابوو پێشتر نەیبینیبوو، دەستی بەڕاوکردنی ئاژەڵ کرد، تەنانەت ماسیشی ڕاو دەکرد، بەهۆی ڕزگاربوونییەوە قوربانی بۆ خواوەندی میسر پێشکەش دەکرد.

لەپڕ زەوی کەوتە لەرزین، دارەکان بەلادا دەهاتن و دەچوون، پیاوێکی لێ دەرکەوت، پۆشاکێکی ئاڵتوونی جوانی لەبەردا بوو، لێی سڵەمییەوە و ترسا. ئەو پیاوە فیرعەونییە نەیدەزانی یەکەم کەسە پێی ناوەتە سەر ئەو دوورگەیە.. دوورگەی ئەنتیخریستۆس.

گەورەم بەدەنگێکی نێرانە توند گوتی:

– لەچ خاکێکەوە هاتوویت؟

دەریاوانەکە بەترسەوە بەرسڤی[2] دایەوە و گوتی:

---

[1] قەراخ ، لێو.

[2] وەلام.

– لەخاکی میسرەوە هاتووم، لەتەك هاوەڵەکانم بەگەشتێکی دەریاوانی دەرچووبووین، دەریا لێمان تووڕەبوو، کەشتییەکەی بە بەردێکدا داین و نوقووم بوو، هەموویان خنکان، تەنها من تیا دەرچووم.

گەورەم بەدەنگێکی هێمنانە پێی گوت:

– کاکەی میسری مەترسە، تۆ لەم دوورگەیە پارێزراویت، تۆ ئەو کەسە بژاردەیەیت کە لەو کارەساتە ڕزگارت بووە، ئەگەرچی پیاوێلێکی مەزن بوون، وەڵێ تۆ ئەی میسری تەنها بژاردەی ئەو ڕزگاربوونە بوویت.

دەریاوانەکە پێی گوت:

– ئەی پیاوی بەهێز تۆ کوێندەریت؟

گەورەم ئەنتیخریستۆس پێی گوت:

– گوێ بەمن مەدە کوێندەریم، دەتوانیت بە مار ناودێرم بکەیت. لەسەر ئەم دوورگەیە حەفتا هاوڕێم هەبوون، پێکەوە دەژییان، وەڵێ کلکە ئەستێرە[1] بەسەریاندا باری و هەموویانی سووتاند، تەنها من و ئەم کچە بچکۆلەیە ڕزگارمان بوو.

دەریاوانەکە گوتی:

– ئەی مار واپێدەچێت تۆش وەك من بەختەوەر بیت، کە ڕزگارت بووە.

گەورەم ئەنتیخریستۆس بزەیەك گرتی بەدەریاوانەکەی گوت:

---

[1] بلێسە.

- ئـەی میسـری توانـای پێشـبینیکردنم هەیـە، دوای چـوار مـانگ کەشتییەکت بۆ دێت و دەتگەڕێنێتەوە ولاتی خۆت.

دەریاوانەکە بەو قسەیە دڵخۆش بـوو، وەڵێ باوەڕیشـی نـەدەکرد، بۆیـە دووبارە لێی پرسی:

- ئەی پیاوی چاك بەڕاستتە؟ سوێند بەخواوەنـدی مـەزن ئەگـەر وا دەرچوو، بێمەوە سەردانیت و خەڵاتی زۆرت لەمیسرەوە بۆ بێنم.

گەورەم ئەنتیخریستۆس پێکەنی و گوتی:

- لەم دوورگەیە پێویستم بەهیچ نییە تـۆ ئامادەی بکـەیت. هـۆ ئـەی میسـری چـاك بزانـە هـەر کـە لـەم دوورگەیـە دەرچـوویت ناتوانیـت بـۆی بگەڕێیتەوە، ئەم دوورگەیە دوای تۆ ون دەبێت، تەنها بۆ لێقـەوماوێکی تـری وەك تۆ پەیدا دەبێتەوە.

گەورەم ئەنتیخریستۆس بەردەوام بوو لەقسەکردن و گوتی:

- ئەی میسری هەر کە گەڕایتەوە ولاتەکەی خـۆت، بـۆت نییـە بڵێیـت چاوت بە ئادەمیزادێکی تـر کـەوتووە، بـەڵکو بڵـێ چـاوت بـە مارێـك کـەوت. ئـەوەی بـاوەڕت پێبکـات بـا بیکـات، ئەوەشـی بـاوەڕت پێنـەکات، بـا هـەر نەیکات.

دەریاوانەکە گوتی:

- ئەی مار چۆنت دەوێت با وابێت.

پاش چوار مانگ کەشتییەك گەیشتە دوورگەکە. ئەنتیخریستۆسی مەزن خەلات و دیارییەکی زۆری بەدەریاوانەکە دا ، لە خشلّ و زێڕ و زیو و عاج و کلی چاوان و بۆن و بخوورو گیای سینەمۆکی و بەهارات و تەختەدار تەنانەت لە ئاژەلّەکانیشی وێدا وەکو مەیمون وزەڕافە بۆ ولاتەکەی خۆی بیباتەوە.کەشتی گەڕانەوەکە بۆ میسر دوو مانگ بەڕێوەبوون. لەدوورەوە چاوی بڕیبووە دوورگەکە تا دەهات کالتر دەبووەوە، تا بەتەواوی ونبوو.

دوای گەڕانەوەی دەریاوانەکە بۆ ولاتی میسر، بەسەرهاتەکەی بۆ وەزیر گێڕایەوە، ئەویش لەڕێی خۆیەوە بەسەرهاتی دەریاوانەکەی بۆ فیرعەون گێڕایەوە. فیرعەون فەرمانی بەسەرۆك نووسەرانی (ئاموون ئاموونا) دا لەسەر زەل (البردی) بینووسنەوە، دەریاوانەکەشی بە پلەیەکی بەرز لەکۆشك دامەزراند. لەکۆشکی فیرعەون وەك گەورەی فەرمانبەرانی کۆشك لەبری ئەو گەشتە سەختەی و ئەو دیارییانەی بۆ فیرعەون هێنابوو، دەست بەکاربوو.

ئەی مرۆڤ ئەو دەستنووسەی لەسەر زەل و لەسەردەمی نوێدا خوێندووتەتەوە، کە بەناونیشانی ( بەسەرهاتی دەریاوانە ونبووەکە) ئەگەر لێی حالّی نەبوویتە، ڕاستییەکەی کە ئەنتیخریستۆس باس لەو حەفتا هاوەلّەی دەکات، کە بەردە ئەستێرە گڕدارەکانیان بەسەرا باری و سووتان، ئەوانە هەر هەموویان شەیتان بوون، لەبەردەست گەورەم ئەنتیخریستۆس دا بوون. گەورەم درکی بەوە کردبوو خودا لەنەوەی ئیسڕائیل پێغەمبەرێك دەنێرێت، بەوە زۆر نیگەران بوو، فەرمانی بە ئەهریمەنەکانی هاوەلّی دا بچنە ئاسمان و ئەو هەوالّە سەح بکەنەوە و بزانن ئەو پێغەمبەرە کەی

سـەرهەڵدەدات. ئاسمـان کلکـە ئەسـتێرەی گڕاویـی بەسـەریانا بارانـد و هـەموویانی سـووتاندن. ئـەو پێغەمبـەرەی لـەدایکبوو موسـا بـوو. هەرچـی ئەنتیخریستۆس بوو لەسـەر دوورگەکـە تـەنها ئـەو کچـە بچکۆلەیەی لەتـەکا مابوو، ئەو کچەش ( سەبای) ئەهریمەن[1] بوو.

سێرپێنتی مار ئەهریمەن دەڵێت:

بۆ دیمەنێکی زۆر مەزنی نێو دیمەنەکانی سەر زەویتان دەبەم، دیمـەنی موسا کە بە دارعەساکەی ڕووبارەکەی شـەق کـرد، بەشـێك بـۆ لای ڕاسـت و بەشەکەی تریشـی بـۆ لای چـەپ، چـون دوو تاڤگـەی کـە لەبەرزییـەوە بێنـە خـوارەوە، دیمـەنێك دەمانـەوێت هـەر وەك خـۆی چـۆن بـووە وای بخەینـە مێشکتەوە، بەو ئاوایەی هەرچی دەرهێنـەرەکانی هۆڵیـوودە کۆ ببنـەوە بـۆ دەرهێنانی ئەو ساتەی موسـا بـە دارعاسـاکەی ڕووبارەکـەی شـەق دەکـات. موسا پێشڕەوی قەومەکەی دەکـات و بـە ناوەنـدی ڕووبـارە شـەق کراوەکـە لێلیان دەپەڕێتـەوە، چـاوم لێبـوو گـەورەم ئەنتیخریسـتۆس هاوشـان موسـا پێشڕەویی خەڵکەکەی دەکرد. کاتێ مەزنمان زانی ئەو پێغەمبـەرە نێـردراوە موسـایە، سـووربوو دابەزێتـە گۆڕەپـانی ململانێـی لـەناو قەومەکـەی خـۆی. لەتەك نەوەی ئیسڕائیلییەکان تەماشای ئـەو ڕووداوەم دەکـرد، چـاوم لێبـوو گەورەم ئەنتیخریستۆس کارێکی سەرسوڕێنەری دەکـرد، گـەورەم چـاوی بـە (جبریـل) کـەوت بەسـەر ئەسـپە ئەفسـانەییەکەیەوە لەپێشـەوەی موسـاوە دەڕۆیشـت، هەرچـی گـەورەم ئەنتیخریسـتۆس بـوو چـاوی لەشـوێن پێـی ئەسپەکە بڕیبوو، بەبن نـاڵی ئەسپەکەوە خاکەکـە سـەوز دەبـووەوە. تـەنها

---

[1] شەیتان.

ئەنتیخریستۆس بوو جبریلی دەبینی و دەیناسییەوە، چونکە لەسەر دەستی ئەو گەورە ببـوو، گڵـە ڕووتەکـەی شـوێن پێـی ئەسپەکە سـەوز دەبـووەوە، ئەنتیخریستۆس داچەمییەوە و مشتێك لەو گڵەی نایە توورەگەکەیەوە، زانـی سیحرێکی تیایە.

پاش پەڕینەوەیان لەچەمی ڕووبارەکە بـەرەو بیابـان کەوتنـە ڕێ بـەو مەبەستەی بەخاکی فەڵەستین بگەن. بەدەم کاروانەکەوە چاویان بەقـەومێك کەوت بەردەوام لە خواوەند پەرستیدا بوون، بەموسایان گوت:

– ئەی موسا.. خواوەندێکمان بۆ دانێ وەك ئەوانە بیپەرستین.

موسا بەتووڕەییەوە گوتی:

– ئێوە قەومێکی گەمژەن، ناتانـەوێت تێبگـەن، ئـەو قەومـە سـەریان لـەخۆیان شـێواندووە، ڕۆژێ دێـت خـودا لـەناویان دەبـات، بێجگـە لـەخودا کەسێکی ترتان دەوێت بیکەن بەخواوەند، کە بەر لەساتێك ئێوەی لەدەست زوڵمی فیرعەون ڕزگار کرد؟

ئەنتیخریستۆس ئەو دیمەنەی بینی و زۆریش پێی سەرسام بوو، تـا ئـەو ڕۆژە هات و موسا بۆ کێوی (تووڕ) ڕۆیشت تا لەتەك خوداکەی قسان بکات. موسا بەقەومەکەی ڕاگەیاند چوونەکەی سێ ڕۆژ دەخایەنێت و دەگەڕێتـەوە. هاروونی برای لەجێی خۆی دانا. سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، موسا دەرنەکـەوت، چـەند ڕۆژێکـی تریشـی بەسـەر چـوو هـەر دەرنەکـەوت. ئـا لەوێـدا گـەورەم ئەنتیخریستۆس بەهەلی زانی و ما بـە زیرەکـی و دانـایی ئـەو هەلـە بـۆ خـۆی بقۆزێتەوە.

ڕووی لێکردن و گوتی:

– ئەی قەوم ئەو ئاڵتوونانەی میسرییەکان بە قەرز وێیانداون بۆمی کۆبکەنەوە، ئەوەی بە هەڵگرتنی پێتان حەرامە، من لەکۆڵتانی دەکەمەوە.

میسرییەکان هەرچی زێڕێ بوو لەبەردەم گەورەم دایاننا، ئەویش بەتوانەوەی پەیکەری گوێرەکەیەکی[1] لێ درووست کرد. نەمزانی گەورەم ئەنتیخریستۆس هونەرمەندیشە. ئەوجا دەستی لەناو توورەگەکە نا و ئەو مشتە خۆڵەی ژێر ناڵی ئەسپەکەی جبریلی دەرهێناو پرژاندییە سەر پەیکەری گوێرەکە ئاڵتوونییەکە.پەیکەرە زێڕینەکە ڕۆحی وەبەر کراو زێندووبوو. دیمەنێکی سەیر بوو هەمووانی سەرسام کرد، تەنانەت بۆ خۆیشم باوەڕم نەکرد. ئەوجا خەڵکەکە کە چاویان بەو ڕووداوە کەوت، سام دایگرتن و چاویشیان ئەبڵەق بوو. ئەودەم گەورەم ئەنتیخریستۆس بەهەڵ زانی و گوتی:

– موسا ڕۆیشت و نەیزانی خواوەندەکەی لێرەیە.. ئەی خەڵکینە ئەمە خواوەندتانە و خواوەندی من و موساشە، کڕنووشی بۆ بەرن.

هەر هەموو کڕنووشیان بۆ برد و بەدەوریدا سووڕانەوە. هاروون تەواو نیگەران بوو، پیایاندا دابەزی و گوتی:

– ئەی قەوم چیتان بەسەر هات، باوەڕتان بەخودا بێت، ئەوە جادووە لێیگەڕێن، بەفەرمانی من بکەن.

خەڵکەکە گوتیان:

---

[1] جوانەگا.

- نەخێر لێرە ناڕۆین، ئێمە لێرە بەردەوام دەبین، تا موسا دەگەڕێتەوە.

موسا گەڕایەوە، کە چاوی بەگوێرەکە ئاڵتوونییەکە کەوت و خەڵکەکەشی بینی کڕنووشی بۆ دەبەن، حەپەسا، تووڕەبوونێك تووڕەبوو نەبێتەوە. موسا هەندێ نووسراوی سەر لەوحی پێبوو کە خودا پێی نووسیبووەوە، لەوحەکانی فڕێدت و شکان، لەوحی گڵین بوو. هاواری بەسەر قەومەکەیدا کرد و گوتی:

- ئەی قەوم چیتان بەسەر هاتووە، خودا پەیمانی وێدان، پەیمانەکەی خودا زۆری پێنەچووە، یا دەتانەوێ خودا غەزەبتان لێ بگرێت.

قەومەکەی گوتیان:

- ئێمە هەرچی ئاڵتوونی میسر بوو کۆمانکردەوەو لەژێر پێی ئەم پیاوە (سامری)یە فڕێمان دا، گومڕای کردین.

ئەوجا بەتووندی ڕیشی[1] هاروونی برای گرت و پێی گوت:

- هاروون چیت لێهاتووە؟ فەرمانی منت شکاند.

هاروون گوتی:

- براکەم ڕیشم مەگرە، قسەم پێمەکە، ترسام پێمبڵێیت دوای تۆ نەوەی ئیسرائیلم تەرتەو وەرتە[2] کردبێت، ئەم سامرییە وایلێکردن.

---

[1] ڕدێن.

[2] تەفریقە ، جیاکردنەوە.

موسا وازی لەهاروون هێنا و ڕووی لە ئەنتیخریستۆس کرد، کە ئیسرائیلییەکان بە سامری ناودێریان دەکرد. سامری لە کولتوری ئیسرائیل بەمانای کەسێکی نامۆ دێت، لەهەمان کاتدا بەلایانەوە گرنگە . ئەوە ڕوو بە ڕووبوونەوەی موسا بوو لەتەك ئەنتیخریستۆس.

موسا بەهێمنی بەسامریی گوت:

– ئەی سامری چیت لەم قەومەی من دەوێت؟

ئەنتیخریستۆس بەهێمنی پێی گوت:

– کاتێ لە شەقکردنی ڕووبارەکە تێدەپەڕین، ئەوەی من بینیم کەس نەیبینی. فریشتە (جبرائیل) بینی بەسەر ئەسپێکی ئەفسانەییەوە پێشڕەوی دەکردین، لە شوێن نالی ئەسپەکەی خۆڵە ڕووتەکە سەوز دەبووەوە، منیش مشتێکم لەو خۆڵە کردە توورەگەکەم، دواتر پرژاندمە سەر گوێرەکە ئاڵتونییەکە، ئێدی ئەوانیش بەخواوەندی خۆیان زانی و شوێنی کەوتن.

مەزەندەم وابوو موسا بەڕووی ئەنتیخریستۆس زۆر تووڕەبێت، چونکە موسا سروشتی وایە زوو تووڕە دەبوو، وەلێ زۆر لەسەر خۆ و هێمنانە پێی گوت:

– ئەی سامری لێرە بڕۆ، تۆ لەم دنیایەدا دیدارێکت دەبێت، ئەو دیدارەت پشتگوێ نەخەیت. هەرچی دەربارەی خواوەندەکەشتە کە قەومەکەی گومڕا کردووم، دەبینیت دەیسووتێنن و خۆڵەکەشی فڕێ دەدەنە ڕووبارەکە.

## ئەنتیخریستۆس

شتێکی سەیر بوو موسا بەو نەرمییە لەتەك ئەنتیخریستۆس دەدوا، وەلیٚ پێدەچوو (موسا)ش ئەنتیخریستۆسی ناسیبێت. بەپێی ئەو قسەیەی کردی کاتی ڕوو بە ڕووبوونەوەی ئێستا نییە، وەلیٚ لەسەردەمێکی تردا دەبێت، نە موسای تیایە نە فیرعەونیش، سەردەمی دوو دێڕ لەکۆتایی دنیادا.

سەبای ئەهریمەن گوتی:

ئەگەر نەفسم ئارەزووی قسەکردنی هەبووایە دەیگوت.. من ئەو ئەهریمەنەم هەرگیز کەس نەمیناسیوە، ئەگەرچی هەموو خەڵکی سەر زەوی دەناسم، چونکە من سیخوڕبووم بەسەریانەوە. هەرچی هەواڵی سەر زەوییە بەزیادەوە دەمگەیاند، جێگەیەکی تایبەتیشم نییە لەسیلەی[1] گەورەم ئەنتیخریستۆس نەبێت. لەدوورگەی مار ڕۆژی سووتانی هەموو ئەهریمەنەکان، بە بەردە ئەستێرەی ئاگرین، من هیچم لەو گڕە بەرنەکەوت، من نەچووبووم هەواڵی ئاسمان بزانم. من چووبووم هەواڵەکانی سەر زەوی کۆ بکەمەوە. ئا شتێکی تر، بنیادەمەکان منیان دەبینی، تەنانەت لەم سەردەمە نوێیەشدا هەر دەمبینن، من لەخێڵی شەیتانگەلێکم هەموویان لەمن دەچن، وەلیٚ بە کەمێك جیاوازییەوە کە گرنگ نییە باسی بکەم، خێڵەکەی من لە دارستانەکاندا دەژێن. بۆ ئەوەی شێوەم و شێوەی خێڵەکەشم لات ئاسانتر بکەم، سەرەتا گۆریلایەك بێنە بەر چاوی خۆت، هەموو جەستەم بە تووك داپۆشراوە، ئەوەی لەم سەردەمە نوێیەدا گەمژەیی بنیادەمەکانم بینی، بە خێڵەکەی منیان دەگوت( پیٚ زلەکان)

[1] دراوسێ , نزیکن.

(Big Foot) بەو ناولێنانەیان تێگەیشتم بنیادەم لەگەمژەیی خۆی نەکەوتووە. ناشکرێت چۆنێتی سۆسەکردنم بۆ هەواڵەکانت پێ بڵێم، تەنها ئەوەندە بزانە کە من هەموو شتێکی بنیادەمەکان دەزانم و سۆسەیان[1] دەکەم، وەلێ ژیانم لەتەك گەورەم ئەنتیخریستۆس دایە, گەورەی منە و گەورەی هەمووانە!

دوورگەی مار دووجار پێی بنیادەمی کەوتووەتە سەر، یەکێکیان لەسەردەمی موسا بوو، ئەویش دەریاوانێکی ونبوو بوو، کە کەشتییەکەی نوقمی دەریا بوو، دووەمیشیان لەسەردەمی محەمەد دوایین پێغەمبەری دنیا، ئەویش چیرۆکێکی سەیری بەلاوە بوو.

شەوێ لەشەوان زریان بەسەر دەریای یەمەن هەڵدەکات، کەشتییەك لەناو دەریاکە شەپۆلەکان دەیانهێناو دەیانبرد، تا شوێن و ئاراستەی لێ ونبوو، دەریاوانەکە هیچی بەدەستەوە نەما هاوسەنگی کەشتییەکە ڕاگرێت، تا بگەنە لێواری دەریاکە. ئێدی زریانەکەش دانەمرکایەوە، یەك مانگی ڕەبەق بەدەم زریانەکەوە وەك مردوویان لێهاتبوو، بڕستیان بەبەرەوە نەمابوو، تا لەپڕ لە کەنار دوورگەیەك ئۆقرە دەگرن، ئەویش دوورگەی مارەکەی ئێمە بوو. سەرنشینەکانی کەشتییەکە ژمارەیان سی و یەکی مەسیحی (کریستان) کەسبوون، یەکێکیان ناوی (تەمیم ئەلداری)بوو. هەموویان لەناو بەلەمە بچووکەکانی دەور کەشتییەکە دوو دوو سێ سێ خۆیان مەڵاس دابوو. ئەوجا دوای ئەوەی ڕۆژ چوونە دوورگەکە. هەر کە پێیان نایە سەر دوورگەکە پێیاندا تەقیمەوە. هەر کەچاویان پێم کەوت

---

[1] چاودێری.

تۆقین، شێوەم بەلایانەوە ترسناك بوو، چونکە شێوە و ڕووخسارم دەچووە سەر ئاژەڵ ناومیان لێنا (دابە) سەرەتا بەترسەوە قسەیان لەتەکا[1] کردم:

– ئەی هاوار ئەی بوونەوەر تۆ چیت؟

هەر بەزمانە عەرەبییەکەی خۆیان تێمگەیاندن و گوتم:

– من (جەسساسەم) سیخوڕم!

– سیخوڕی چی دەکەیت و بۆ کێ؟

پرسیارەکەیانم پشتگوێ خست و گوتم:

– ئەی قەوم بچنە ئەو پەرستگەیە پیاوێکی لێیە پەرۆشی هەواڵەکەتانە.

ترسێك دایگرتن و بلەز لێم دوور کەوتنەوە بۆ ناو پەرستگەکە، کاتێ چوونە ژوورەوە پیاوێکی چوارشانەی کەڵەگەتی بەهێزیان بینی، پێشتر کەسی وایان بەرچاو نەکەوتبوو، ئەوەی بەلایانەوە سەیر بوو، پیاوە بەهێزەکە دەست و پێی لەزنجیرا بوو. ئەوە گەورەم ئەنتیخریستۆس بوو. کە ئەو دیمەنەیان بینی سام گرتنی.

– ئەی هاوار، ئەمە تۆ چیت؟

گەورەم ئەنتیخریستۆس گوتی:

– بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە، وەلێ پێم بڵێن ئیوە چین؟

---

[1] لەگەڵ.

- ئێمە قەومێکی عەرەبین، سواری کەشتییەکەمان بووین بۆ گەشتی دەریایی، لەپڕ زریانێك هەڵیکرد، یەك مانگ لەدەریا هێناین و بردینی، تا لەم دوورگەیەدا خۆمان بینییەوە، لێرەش بوونەوەرێکی تووکاویمان بینی، لێمان پرسی .. تۆ چیت، ناردینی بۆ ئەم پەرستگایە، گوایە پیاوێکی لێیە پەرۆشی هەواڵمانە, ترساین, وتمان لەوانەیە شەیتان بێت!

- هەواڵی دار خورمای (بیسان)ی فەلەستین لەچیدایە، هێشتا هەر بەر دەگرێت؟

- بەڵێ .. هێشتا هەر بەر دەگرێت.

- ئەی هەواڵی دەریاچەی (تەبەرییە)ی فەلەستین بەسەر ڕووباری ئوردنەوە لەچیدایە، ئاوەکەی وشکی نەکردووە؟

سەیریان لەپرسیارەکەی هات و لەیەکیان ڕوانی و گوتیان:

- ئاوەکەی هەروەك خۆیەتی کەمی نەکردووە.

گەورەم هەر بەزمانێکی سەیر پێیانی گوت:

- خەریکە ئاوەکەی وشك بکات! ئەی کانی (زەغەر) لە (غۆر)ی ئوردنی فەلەستین کانییەکە هەر ئاوی دێت؟ خەڵکەکەی بەو کانیاوە کشتوکاڵ دەکەن؟

گوتیان:

- بەڵێ، ئاوی زۆرەو خەڵکەکەش بە ئاوی کانیاوەکە کشتوکاڵ دەکەن.

گەورەم ئەنتیخریستۆس بەزمانێکی لەسەر خۆ گوتی:

– باسی پێغەمبەری بەنەخوێندەوار (ئومییەکان)[1] لەچیدایە؟

گوتیان:

– لەمەککە دەرچوو بۆ یەسریب (شاری مەدینە) ڕۆیشت.

– عەرەب شەڕیان لەگەڵ کرد؟

– بەڵێ، شەڕیان لەبەرامبەریدا کرد.

– چی تری بەسەر هات؟

– بەسەریانا سەرکەوت، دواتر ئەوانیش شوێنی کەوتن و باوەڕیان پێ هێنا.

– ئەوە بەڕاستتانە؟!

– بەڵێ.

– لەوە باشتر نییە کە شوێنی کەوتوون.

دواتر گەورەم بە دەنگێکی بڵند گوتی:

– منیش خۆمتان پێ دەناسێنم، من مەسیحم و زۆریشم نەماوە ڕێم بدرێت بگەڕێمەوە سەر زەوی. هەر کە گەڕامەوە لەهەر ئاوەدانییەك چل ڕۆژ دەمێنمەوە، تەنها (مەککە و مەدینە)یان لەسەرم یاساغ کردووە، چەندم ویست سەردانی بکەم، فریشتەیەك بە شمشێرەوە ڕێی لێگرتووم، بەسەر هەر شوێنێکیشیانەوە فریشتەیەك پاسەوانە.

---

[1] لای هەندێك (امی) واتە: خەڵکی دەوروبەری شاری (مەککە)، چونکە بەناوی (أم القری)اوە هاتووە.

قەومەکە ترسان و خێرا دوورگەکەیان جێهێشت هەڵهاتن. یەکێکیان چووە لای پێغەمبەر و دوای سڵاو کردن، ئەوەی بەسەریانا هاتبوو بۆی گێڕایەوە. محەمەد زۆری پێخۆش بوو، بۆ سەحابەکانی[1] گێڕایەوە.

لۆسیڤەری مەزنی شەیتانەکان و هەڵگری ڕووناکی مەزن گوتی:

تۆ ئەی ئەنتیخریستۆس.. کوڕی ئەهریمەن[2]، کوڕی لۆسیڤەر، کوڕی ئیبلیس، تۆی هەڵگری ڕووناکی مەزن، لەبەر تۆ ئەو هەموو گێرەشێوێنییەی سەر زەوی دروست بوو، تۆ جنۆکەو بنیادەمی، بویتە جێی شانازی جنۆکەو ئادەمییان، جێی شانازی باوکتی، لەنێوان ئاور و قوڕ درووستکرای، لە ڕەحمی ئافرەتێکی جوولەکە ڕۆحت وەبەر کرا.زەوی بە جنۆکە و ئادەمییەوە گەردێکت ناهێنێت، ئەوەندەت نەماوە زنجیر و پێوەندت لێ بکرێتەوە, بگەڕێیتەوە سەر زەوی. ئەمسەرو ئەو سەر بکەیت دەمەو کازێوە لەبەری ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە ڕێك لەشاری ئەسفەهانەوە حەفتا هەزار جوولەکە شوێنت دەکەون، هەریەکەو ملپێچێکی سەوزی (تیلسان) بەسەر شانەوە، لەوەی ماسۆنییەکان لەشانیان دەکرد، ئەوانەی لە پلەی( ٣٣) دابوون ئەوانەی نەوەی (١٣)ی جوولەکە پێکدەهێنن سەربازەکانی سەر زەوی لە ئامادەباشیدان بۆ دەرکەوتنت، خودی زەویش چاوەڕوانی دەرکەوتنتە، هەرچی سەرۆك و پاشاو حکومەتەکانە چاوەڕوانتن.

لە ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوییەوە دەردەکەویت، هەرچی ئەهریمەنە لەپێشوازیتدا دەبن، هەر هەموو ئەو شەیتانانە سەربازی تۆن، بەفەرمانی تۆ

---

[1] هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

[2] شەیتان.

هەڵسوکەوت دەکەن، تەنانەت بێ تۆ قسە لەتەك خەڵکیش ناکەن، سێربنتی مار بەدووتا دەکشێت، بەسەر سەریشتەوە ماستیم دەفڕێت، فەرمان بە ئاسمان دەدەیت و دەبارێت، فەرمان بەشیردەرەکان دەدەیت و گوانیان لەشیر پڕ دەبێت، ئەوەی بتەوێت دەیمرێنیت و ئەوەشی بتەوێت زیندووی دەکەیتەوە. فەرمان بەجنۆکان دەدەیت هەرچی زێڕ و خشڵ و بەردی بەنرخی ناو زەوییە بۆتی دەربهێنن، وەك شیلەی شانەی هەنگ دێنە بەر دەستت، جنۆکان و ئادەمییان خواوەندیت تیا دەبینن و کڕنووشت بۆ دەبەن، فێریان دەکەیت ئایینەکان ئەفسانە بوون و باسیان بۆ دەکەی، بەهەشتی سەوزو دۆزەخێکی ڕەش و سووتێنەر گومانە! بەهەشتیان بە بەرچاویانەوە پیشان دەدەیت، دۆزەخیش هەروەسا، ئەوەشیان پیشان دەدەیت ئەوەی باوەڕت پێدەهێنێت بەهەشتی دەبێت، نەك ئەو بەهەشتە بەگومان باسی لێوە کراوە.

دامەچڵەکێ هەر ئەوەندە گوتت من خودام, ئەوانەی بێجگە لەتۆ بەناوی خودایانەوە دەیپەرستن، هەر ئەوان دژایەتیت دەکەن. چاوێکت دەسڕیتەوە، ئەوی تریان پێڵوویەکی سەوزی بەسەرا دەدەیت و گلێنەکەشی دەشاریتەوە، چون چاوێکی شووشەیی دەردەکەوێت، هەر وەك دەنکە ترێیەکی دەپۆقیو دەردەکەوێت، ئەودەم بەندەکانت دەتناسنەوە و شوێنیشت ناکەون، وەڵێ سەرە پەنجەیەك چییە دوات ناخات.

تۆ (مەسیح)ی تۆ خودای ئادەمی و جنۆکەیت، تۆ کوڕی ڕاستەقینەی منیت، ئەوەی دەبێت بە بەندەی تۆ ، ئەوا منی پەرستووە، ئەوەی ڕێز لەتۆ بگرێت، ڕێزی لەمن گرتووە، ئەوەشی ڕێزم لێبگرێت ئەوەندەی دەدەمێ بۆی

نەژمێردرێت. ئەی مەسیح دابەزە خوارەوە، بۆ هەر هەنگاوهەڵهێنانیشت بەرەکەتی منی لەتەکا دەبێت، دابەزە و هەرچی بیروباوەڕی پووچە کوێری بکەرەوە، یەك بیروباوەڕ بڵاو بکەرەوە، سیستەمێکی جیهانی دابهێنە و خۆت فەرمانڕەوایی بکە. ئەی مەسیح بچۆرە خوارەوە بۆ سەر زەوی، پەیمانەکەم بەجێ بگەیێنە، کە بەر لە دەهەزارساڵ پەیمانم بەخودا دابوو، ئەودەمەی دەری کردم، کە خێرم بۆ بنیادەم دەویست، هەر ئەو کات پەیمانم وێدا بنیادەم هەڵخەڵەتێنم، لەسەر ڕێگا ڕاستەکەیان بۆیان بوەستم، لەهەموو لایەکەوە بۆیان لەبۆسەدا بم، وایان لێبکەم لەسەر ئاییني خۆیان نەمێنن و زۆربەی هەرە زۆریان شوێنم بکەون بۆ دۆزەخ. ئەی مەسیح دابەزە خوارەوە، ئەوەی بڕوای بە تۆ نەبێت و ئەو هەموو کارەی چەندین ساڵی دوورودرێژەی دەیکەی لەبەر چاوی نەبێت شایانی ژیان نییە.

***********

تەواو